# گەنجینەی نایاب و بێعەیب

تەرجمەی:

# اعلام بالغيب






دانراوی:
ماموستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

وەرگێڕاوی:
ماموستا سەیید (عبداللە)ی حوسەینی

| | |
|---|---|
| سرشناسه : | مدرس، عبدالکریم، ۱۲۸۳ - |
| عنوان و نام پدیدآور | گەنجینەی نایاب و بی‌عەیب: تەرجەمەی « اعلام بالغیب»/ دانراوی عەبدولکەریمی مودەڕریس : لیکدانەوە و تەرجەمە عەبدوللای حوسەینی |
| مشخصات نشر | مریوان: امام ربانی، ۱۳۸۹. |
| مشخصات ظاهری | ۱ج(بدون شماره گذاری)؛۲٤×۱۷س.م |
| وضعیت فهرست نویسی: | فیپا |
| یادداشت | کتاب حاضر ترجمه "اعلام بالغیب" نوشتەی عبدالکریم المدرس میباشد. |
| موضوع | محمد (ص). پیامبر اسلام. ۵۳ قبل از هجرت - ۱۱ق. -- احادیث اهل سنت |
| موضوع | احادیث اهل سنت-- نقد و تفسیر |
| شناسه افزوده | حسینی، عبدالله، ۱۳۳۳-، مترجم |
| رده بندی کنگره | ۱۲۷BP/م٤گ۹ ۱۳۸۹ |
| رده بندی دیویی | ۲۱۱/۲۹۷ |
| شماره کتابشناسی ملی : | ۲۳۳۷۲۰۲ |

# گەنجینەی
# نایاب و بێعەیب
## (تەرجەمەی "إعلام بالغیب")

دانراوی:
ماموستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

لێکدانەوەو تەرجەمە بە پێنووسی:
سەیید عەبدوڵڵای حوسەینی هەورامی

انتشارات امام ربانی
مریوان




انتشارات امام ربانی

## گەنجینەی نایاب و بێعەیب

| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | گەنجینەی نایاب و بێعەیب |
| ✓ نووسەر (مؤلف): | مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس |
| ✓ تەرجەمە (مترجم): | سەید عەبدوڵڵای حوسەینی هەورامی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ۱۳۹۰ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۲۰۰۰ (بەرگ) جلد |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۲۸۸ صفحەی رقعی |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | انتشارات امام ربانی |

نرخی: شابک: ۹۷۸ـ۶۰۰ـ۹۰۴۹۹ـ۹ـ۸

۳۰۰۰ تمەنە ISBN: 978 - 600 - 90499 - 9 - 8

# ناوەڕۆك

# پێشەکی وەرگێڕ

## «بسم الله الرّحمن الرّحیم»

بەناوی خوای گەورە و دڵـۆڤان، بەدیهێنەری کەون و مەکان، خاوەنی ئەم جیهان و ئەو جیهان، سڵاو و ڕەحمەتی نـەبڕاوەی خوای گەورە بۆ سەر ڕۆحی چاکترین ئینسان، نوێنەری خوای مەننان، بـۆ سەر جـنۆکە و پـەری و ئـینسان، وە هـەروەها لەسـەر ئـال و یـارانـی پـاکی و بـڕواداران، تاڕۆژی دوایی بێوچان و بێوەستان.

لە پاش حەمد و ستایشی خوای گەورە و بەدەسەڵاتی جیهان پەروەر، دانـەری ئـەم کـائیناتە لە خـوار و سـەر، بـەخشێنەری ئـاوەز بـە کـۆمەڵی بەشەر، هـەر هـەمووەکەی تێکڕا بـە یـەکسەر، دووبـارە سـەلات و سـەلام بـڕژێتەسەر، تـاقانە ڕەهـبەری هـەمووی بـوونەوەر، حـەزرەتی سـەییدی سـەروەر، وە لە سـەر ئـال و یـارانـی ئـەستێرانـی پـرشنگ داری دەورانـی پڕئـەختەر و بـەرتـەر.

لـە کاتێکدا چاوم بە پەرتوکی بـەرز و مایەداری مامۆستای ناودار و دیاری، ئـەستێرەی گـەشی بەرزی ئاسمانی کوردەواری، مامۆستای هێژا، مامۆستا مەلا «عبدالکریم» ناسراو بە (نامی) کەوت بەناو «**إعلام بالغَیب وَ إلهَامٌ بِلا رَیبٍ**» دڵم هەڵیخست و لێیدا، حەزم کرد ئەم پەرتۆکەیە، کـە بـە زاراوەی عـارەبییە هـەڵگـێڕمـە سـەر زاراوەی کـوردی سـۆرانـی، تـا گـەنجەکانی کـوردزمان و ئـایین پـەروەر، سـوود و کـەڵك لەم پـەرتۆکەی مـامۆستا وەرگـرن و مـنیش خـێرێکم دەسـکەوتێ، هـەرچەن مـن خـۆم بەشیاوی ئەم ئەرکە گەورەیە نازانم، بەڵام بەبۆنەی ئەوەوە کە وتراوە: «**ما لا یُدْرَكُ کُلُّهُ لا یُترَكُ کُلُّهُ**» واتـە: هـەرشتێ کـە هـەمووەکەی نـەزانـرێ و دەرك نـەکرێ هـەرهـەمووەکـەی تـەرك نـاکرێ، بـەو هـیوایە کە جێگای سود و کەڵك بێت بۆ خوێنەرانی خۆشەویست و ئایین پەروەر،

**سەید عەبدوڵڵای حوسەینی هەورامی**

**١٣٨٩ مریوان.**

# پێشەکی دانەر

سوپاس و ستایش بۆ خوایەك کەپێگەیێنەری تەواوی عالەمیانە، ڕەحمەتی بێ‌پایان و سلاوی نەبڕاوە لەسەر گەورەی ئیمەحەزرەتی موحەممەدﷺ، وە لەسەر ئالە پاکەکانی و یارە بەرزەکانی هەموویان بە تێکڕا، وە هەر وەها لەسەر شوێن‌کەوتوانی بەچاکە تارۆژی پەسەلان .

لەپاش حەمدو ستایش و سەلات وسەلام، ئەم نووسراوە، کە لەبەر دەستدایە، پەرتۆکێکە موبارەك، وە لەناوی خۆیدا جێی‌کردووەتەوە چەن باسێکی گرنگ بۆموسوڵمانان، وە لە ئەستۆی خۆی گرتووە چەن فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوداﷺ. لەوەحی و نیگای پەنامەکی ڕەببا نی، واتە: «الهامات» وە هەروەها شامڵە بۆ چەن وشەی بەکەڵك و بەسود بۆ بەختەوەری ئینسانەکان.

وە ئەم پەرتۆکەیەم ناوناوە بە «اعلامٌ بالغیب والهامٌ بلا ریب» وە ئەم پەرتۆکەیـەم لەسـەر پێشەکییەك و مەتڵەبێك و پاشکۆیەك تەرتیب داوە، وەلەخـودا داخـوازیـم ئـەوەیە کـە بـەم پـەرتۆکەیە سوود و قـازانـجی جـوان بـگەیێنی بـە مـن و بـاقی مـوسوڵمانان لە هـەردوو دونـیادا، چـون ئـەو خـوا خوایەکە کە یاوەر و کۆمەکی ئینسان ئەکات لە هەردوو دونیادا!

# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

لەو شتانەیە کە ڕونە و لەسەر ئینسانی عاقڵ و ژیر ون نییە، ئەمە کە نەوعی ئینسان لە دائیرەی حەڵقەی بوونەوەردا بائەرزشترین مەوجوداتە، وە لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە تەعریفی لە ئینسان کردووە و ڕێزی بۆ دیاری کردووە.

چون خوا نەوعی ئیسانی کردووە بەجێگەدار لەسەر ئەرزدا، وە جێگای تەجەللیگای بەرزی ڕەحمەت و ئیحسانە، کەوابوو پێویستە لەسەر ئینسان تەماشای نەفسی خۆی بکات وەنەفسی خۆی بناسێ، وە لەسەریەتی کەتێبینی بکات لەپاکی و گەورەیی خۆی و تێبفکرێ لەبوونی نەفسی خۆی، تابۆی ڕون بێتەوە کە ئینسان سوودەکەی تەنها بوون نییە و بەس، چون ئەگەر وابێ جیاوازی لە بەین ئینسان و داروبەردا نامێنێ، وە سوودیشی تەنها بوون نییە لەگەڵ گەورەبووندا، وەگەرنە لەگەڵ دار و درختا فەرقی نامێنێ، وەسوودیشی تەنها بوون نییە لەگەڵ گەورەبون و ئیحساسدا بەتەنها، وەگەرنە لەگەڵ باقی گیانلەبەرکانی‌تردا فەرق و جیاوازی نامێنێ.

کەوابوو لەمەوە دەرئەکەوێ و ئەزانرێ جیاوازی ئینسان لەگەڵ باقی شتەکانی‌تر بە ئاوەز و عەقڵە، وە عەقڵ وەسفێکە سورشتی، وە زانست و هونەری ئینسان شوێن کەوتووی ئەو وەسفەیە، چ بۆدەرك کردنی شتی ئاشکراو ڕون، وەکووو ڕۆشنایی و تاریکی یاگەرما و سەرما، وەیا وێنەی ئەمانە، وە چ بۆ ئەو شتانەی پەنامەکین کە نیازیان بە تێفکرین و دیققەت هەیە، وەکووو بیرکردنەوە و فکرکردن لە بەڵگە و دەلیلەکاندا. کەوابوو بۆ ئینسان ئاشکرا ئەبێت کە چۆن ڕۆژانە ئێوارە و بەیانی نیازی بە خۆراك هەیە، وە هەروا بۆ ڕۆژانی دواییش ئەو پێداویستیانە ئەبێت، وە هەروا نیازی بەدەوا هەیە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشینەکانی وە نیازی بە کەسب و کار هەیە بۆ ژیانی ڕۆژانەی، وە هەم پێداویستی هەیە بە هێزو قودرەت بۆ بەرنگاربوون لەگەڵ دوژمندا بۆ پاراستنی ئاو و خاك و شەرەفی وڵاتەکەی وە...!

پاش بیرکردنەوە لەمانە، بۆی دەرئەکەوێ ئایا ئەم ئینسانە خۆی بۆ خۆی بووە بە بێ ئەوە خالیقێك و بەدیهێنەرێکی بوویێت؟ یا خالیقێك و دروستکەرێکی زیندوو و زانا و بە دەسەڵات و خاوەن ویست ئەوی دروست کردووە، لەمەوە دەرئەکەوێ و بۆی ئاشکرا ئەبێت کە بە یەقینی خۆی بۆ خۆی دروست نەبووە، بەڵکوو بەدیهێنەرێکی زیندوو ئەوی دروست کردووە.

چون شتی بێگیان و دور لە حەیات هیچ شتێکی بۆ دروست نابێت، وە ئـەو بەدیهێنەرە زانایە، چون نەزان نازانێ چی دروستکات، وە هەروا خاوەن ویست و ئیرادەیە، چون کەسێ بێ ویست و ئیرادە بێت و هەروا بـێ بـەسیرەت بـێت شتی بـۆ پـێك نـایەت و دروست نـابێت، وە ئـەو بەدیهێنەرە خاوەن هێز و ئاسەوارە.

کـەوابـوو ئینسان بـەمانە ئـەگا بـەو پـلەیە کە ئـەزانـێ کـەسێ ئـەوی دروست کردووە، وە ئەزانێ ئەو بەدیهێنەرە، وەکووو ئەو وەسفانەی هەیە، بە وەسفی گەورەیی و کەماڵیش ڕازاوەتەوە، وە لە هەر نەقس و کەج و کورِییەك پاکە و دورە، وە ئینسان کاتێ ئەمانەی زانی تێبینی و زانستی زۆرئەبێت، وە هەم لەمەوە بۆی دەرئەکەوێ و ڕوون ئەبێتەوە و ئەزانێ کە بەدیهێنەر بۆ نەوعی ئینسان و دروستکەری باقی هەموو مەوجوداتە، کە ئەو زاتە زاتێکە بوونەکەی واجبە و تەواوی وەسفی گەورەیی و کەماڵ لەوا مەوجوودە و هەیە، وە پاکە لە هەر نەقس و ناتەواویەك، وەئینسان کاتێ کە بۆی ڕوون بووەوە، کە ئەو خوایە لە هەموو شتێکدا تەواوە و کامڵە، وە خاوەن وەسفی کەماڵە، ئەو کاتەیش دەزانێ، کە ئەو خوایە لە بەدیهێنانی ئـەم کەونەدا بازهەم تەنها دروستی کردووە، وە هیچ کەسێ لەمەدا شەریك و دەخیل نییە جا ئەو کاتە ئینسان زمانی ئاوەز و عەقڵی دێتە وتار، وە ئـەو شتەی ئەڵێت کە خوای گـەورە لە زمانی ئیبراهیمی خەلیـلەوە عليه السلام لە سوورەی ئەنعام ئایەتی ژمارە حەفتاونۆدا فەرموویە:

﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفاً مُسْلِماً وَ مَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ واتە: «بە ڕاستی من ڕووی خۆم لە پەرەستشا کردە ئەوزاتەی کە ئەم عالەمە و ئاسمانەکان و ئەرزی بەتێکڕا دروست کردووە، وە لا ئەدەم لە هەموو ئەو دینانەی کە بەتاڵن، بۆ لای ئەو دینەی، کە حەقە و ڕاستە، وە من لەو کەسانە نیم کەسی‌تر بکەم بەهاوەڵ و شەریکی خوا لە پەرەستشا، وە هەروەها ئینسان باوەڕی دێتە سەرئەوە کە هیچ پەرەستراوێ بە حەق غەیری خوا وجوودی نییە کە ئەو خوایەش ناوی پیرۆزی « اللّه»یە

وە ئینسان کاتێ گەییشتە ئەو پلەیە، وە ئەو زانستەی بۆ پەیدابوو، توانایی و ئامادەبوونی ئەوەی ئەبێت، کە بزانێ ئەو بەدیهێنەرە، کە لە هەموو جەنبەیەکەوە کامڵە و تەنهایە و ئەم ئاسما نانە و ئەم زەویشە، کە بەو هەموو عەجایباتانەوە، کە هەیە بەخۆڕایی وە بێهوودە دروست نەکردووە، چون کاری بێهوودە شیاوی حیکمەتی بەدیهێنەری تەکمێڵ و تەواو زانا نییە، وە ئا لەمەوە ئینسان ئەزانێ، کە ئەوە خوایە ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە بەتایبەت نەوعی ئینسان تا ئەم نیزامە گشتییە هەمیشەیە بەسوودە، قەبووڵ کات، وە پابەندی بێت لەڕۆیشتنیدا بەرەو هەدەفی خۆی، وە لەسەر چاوڕۆشنی بڕوات، کە ئەو نیزامەش بریتییە لە نیزامی خواناسی و پەرەستش، و مولاحەزەکردنی هەموو حەققەکان، وە دانەوەی هەموو حەقێك بە خاوەنی خۆی،

وەگـەرنە نـەوعی ئـینسانەکان لەنـێوان سـەرگەردانـیا ئـەمیننەوە وە خـوای گەورەیش لەوە بەرزترە، کە کارەکانی بێهوودە بن.

جا ئەگەر لەسوورەتێکدا گـومان وخەیاڵ بـۆ ئیسنان پەیـــدابوو، کە مـومکینە ئـینسان سـەرپەرەشتی کـاروباری دونـیایی خـۆی بـکات، بـەبێ مـولاحەزەکردنی یـاسای ئـاسمانی، ئـاوەزی سـالمی ئـینسانی ئـەمە ڕەد ئەکات هەرچەن عەقڵ بۆ کاروباری ماددی ڕەسا و کافییە، بە هۆی هێزو دەسەڵاتی لاشەی خۆی بەڵام بە ئاوەز و عەقڵ ناتوانێ کاروباری نهێنی، واتـە: مـەعنەوی خـۆی جـێ‌بەجێ بـکات، مـەسەلەن وەکـووو دانـەوەی سـپاردەکان وە یـا پـاراسـتنی لە ئـارەزوات، وە مـولاحەزەکردنی هـەموو حەققەکان و دورکەوتنەوەی لە ڕەزیلەی نەفسی و غەیری ئەمانەش.

کەوابوو پێویستە کە ئینسان باوەڕی دامەزراوی تەواوی ببێت، کە ئەم نـیزامـەو بـەرنامەیە، بـەرنامەی خـوایـیە، وە لە تـەرەفی ئـەوەوە شـەرەفی نـوزوولی بـووە، کـە ئاگاداره بـەسەر هەموو شتە پەنامەکییەکاندا، وە ئـەو نـیزامـە بـەسەر دڵەکـاندا و جـێگا حـەسساسەکان و لەتـیفەکانی ئـینساندا پـــەخشان و بڵاو دەبێت و دایان‌ئەگرێت، وەئینسان بەنووری دڵڕوونی ڕازاوە و جـوان ئـەبێت، وە کـارتێکردنی ئـەم ڕۆشـناییبە وای لێ ئـەکات شارەزا ببێت بۆ سەر ڕێگای ڕاست، کە ئەویش ئەبێتە مەنهەج و یاسای نوێنەرایەتی ئیسلامی، وە نیگای نازڵکراو لەسەر نوێنەران لە گەورەمانەوە حەزرەتی ئادەم تا ئاخرین نوێنەری خوا، کە حەزرەتی موحەممەدە ﷺ

کەوا تە: پێویستە بۆ نەوعی بەشەر لە جینسی خۆیان نوێنەری خوایی بـبێت تـا شـارەزایـان کـات بـۆ سـەر ڕێـگای سـەعادەت و بـەختەوەری هەمیشەیی، کورتەی باس ئەویە ئینسانی ساغ و سالم بەهۆی عەقڵییەتی شارەزا ئەبێت بۆ ناسینی خوای پاك و گەورە، وە بۆ باوەڕ هێنان بەو، وەبەیاسای دینی نهێنی، وە بۆ باوەڕکردن بەنوێنەرانی بەرزی خوای گەورە هـەروەکووو ئـایەتی سـی سـوورەی ڕۆم ئـەم مـەوزووعە پـیشان ئـەدات خـوای گـەورە فـەرمـوویـەتی ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾ واتـە: خوای گەورە ئەم دینە پاکەی ناردووە، وە فەرمانی داوە کە لە سەری بین، وەکووو یاسای خولقاندنی ئینسان، کە لە سەر شتێکی پاکی خولقاندووە، وە لە کاتێکدا خوای گـەورە پێغەمبەری ﷺ نارد و ڕەوانەی کردووە بۆ سـەر ئـینسانەکان، بـۆ ئـینسان دەرئـەکـەوێ ئـەو شـتانەی کـەسـورشتی خیلقەتی ئینسانن داخوازیان ئەکات.

وەباوەڕدێنێ بەنوێنەرایەتی ئەوپێغەمبەرە ﷺ وە بەهەر شتێ کە ئەو نـوێنەرە لەلایەن زاتـی خـواوە هـێناویەتی، کـەوابـوو هـاتنی پێغەمبەر ﷺ نوور لەسـەر نـوورە بـۆ کۆمەڵی بەشەرییەت، وە ئەم پێغەمبەرەیش ﷺ هەڵبژێرراوی نەوعی ئینسانە لەلایەن خـوای گەورەوە، وە تەواوی وەسفە چـاکەکان ئـەوەی ڕەوشـتی بـەرزبێت لەوا جـەم بـووە، وەخـاوەنی هـێزی ڕۆشـنایی دڵ و زاهـیرە، وە ئـەو پـێغەمبەرە و بـاقی نـوێـنەرەکانی تریشی نـاردوون بـۆ سـەر ئـینسانەکان لەکـاتێکەوە کـە نـەوعی ئـادەمی لەم سـەر

کورەی خاکیەدا دەرکەوتوون، وەکووو خوا لەسوورەتی فاتر، ئایەتی ژمارە بیستوچواردا ئەفەرمێ: ﴿وَ إِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ واتە: هیچ گەلێك نەهاتووەتە سەر ئەم ئەرزە ئیللا ترسێنەرێکمان بۆ ناردوون، کەوابوو خوای گەورە نگا ئەکاتە لای نوێنەرەکەی بە گوێرەی نیازمەندییەکانی ئینسان، وە شتە نهێنیەکانی فێر ئەکات، وە ئەویش ئەم شتانە بە ئینسانە عادییەکان ڕائەگەیێنێ بەشێوەیەکی تەواو جوان، وە ئەو نگا و وەحەییەش بەشێوەیەکە سازگار و موافقی ئاوەزی سالمی ئینسانە، وە ئەم دوو شتە گرنگە هاوکاری یەکتر ئەکەن لە شتێکدا، کە ئاوەز و عەقڵ بەشدارە تیایا و دەرکی ئەکات، وە ئینسان شارەزاو ڕوبەڕو ئەکات بۆ لای حەقێکی مەحکەم و پایەدار، کە ئاوەزی ئینسان بە تەنها ئەو شتە دەرك ناکات، وەکووو وەزعییەتی قیامەت و باقی شتە غەیبییەکان و شتە نهێنییەکان لە هەردوو دونیادا.

وە هەر کاتێك نوێنەرێك لەلایەنی خواوە نێررا و گەیشتە ناو گەلەکەی، وە لەنێوانیاندا پەیوەندی دروست بوو، وە ئەو گەلە ڕەوشت و ئەخلاقی ئەو نوێنەرەیان دەرك کرد، ئەو کاتە ئینسانەکان ئەزانن ئەو نوێنەرە کە هاتووەتە لایان لە زانست و ئەخلاقا لەگەڵ ئەفرادی عادی ئەو کۆمەڵگادا جیاوازەو پلەیەکی بەرزی هەیە، وە سورشتی ئەو موافق و میزانە بۆ ئیدارەکردنی ئینسانەکان، وە بۆ ڕوشنکردنی دڵ و دەرونیان، وە بۆ شارەزاکردنیان بۆ خۆشبەختی دونیا و ئاخیرەت.

وە هاوکات ئەو گەلەش، کە نوێنەریان بۆلا ڕەوانەکراوە لەئاوەز و عەقڵدا لەیەك میزاندا نین وە ئاوەزیان لەیەك جیاوازە، مەسەلەن بۆ نمونە بڕێکیان بەس بەتەماشاکردنی شەخسی ئەونوێنەرە و سەیرکردنی ڕەوشتی جوان و دامەزراوی، وە بڕێکی‌تریان بە وەرگرتن و بارهێنان و فێرکردنیان لەزانستا، و... باوەڕ ئەهێنن و شوێنکەوتووی ئەبن، وە بەشێکی‌تریان لەدڵیاندا دوودڵی دروست ئەبێت، وە بۆ باوەڕکردنیان بەو نوێنەرە، نیازیان بەشتێکی تایبەتی و جیاواز هەیە، کە ئەشێ لەگەڵ عادەت و ڕسووماتی خەڵکدا جیا بێت، کەئەوەیش پێ ئەوتری «خارق العادە»، کە ئەم «خارق العادە»یشە ئەبێتە هۆی داگیرکردن و ڕام کردنی ئاوەز و فکریان، کەواتە ئەم بەشەیانە نیازیان بە دەرکەوتنی موعجیزە هەیە لەلایەن ئەو نوێنەرەوە و ئینسانەکان لەکاتێکدا ئەو موعجیزانە ئەبینن لەسەر دەسی نوێنەرەکاندا، بۆیان دەرئەکەوێ کە ئەوانە نوێنەری خوان و لەلایەنی خواوە کراون بە نوێنەر و پشت‌گیری کراون جا ئەو کاتە ئەو خەڵکانە دڵیان قەرار ئەگرێ، وە دامەزراو ئەبێت بەحەقانییەتی ئەو نوێنەرانە وە شوێنکەوتووی ڕێگە و ڕێبازێك، کە بۆیان دیاری کراوە وە سابت و چەسپاوە لەلایەنی نوێنەرەکانی خواوە، ئەکەون.

وەبەم جۆرە ئینسانەکان ئەگەن بە بەختەوەری هەردوو دونیا، وە لەکاتێکدا دڵی ئەو ئینسانانە بەهۆی باوەڕو ئیمانەوە نوورانی بوو، وە چرای دڵیان بە غازی خواناسی داگیرسا وە دڵی هەریەکێکیان وەکووو

تاقچەیەك کە گڵۆپێکی تیا داگیرسابێ لێهات، بەجۆری کە ئەم نووری گڵۆپە ڕۆشنە نووری بەرەبەیانی دائەشاری، ئەو کاتە هەر یەکە لەو خاوەن دڵانە لە عاستی خۆیاندا خوای خۆش ئەوێت، وە نوێنەری خوا و ئەوەی کە نوێنەری خوا هێناویەتی لەلایەنی خواوە خۆش ئەوێت.

وەتێکۆشانیان بەو جۆرە، کە لازم و پێویستە ئەبێت، وە ئایینی خوا بەگوێرەی وسعەت وتاقەتی خۆیان لە ناو خەڵکدا بڵاو ئەکەنەوە، وە لە دوای سپەری بوونی زەمانی ئەسحاب رضي الله عنهم زەمانی تابعین ئەوانەی کە شوێن کەوتووی ئەسحابی پێغەمبەر ﷺ بوون بەچاکترین شوێنکەوتن هاتە پێش هەریەکە بەکارو بارێك کە واجبی سەرشانیان بوو، عەمەڵیان کرد، وە بەڕاستی خواو پێغەمبەری خوا، وە ئەوانەی کە ئەهلی قەرنی پێش بوون بە ئەوپەڕی خۆش‌ویستن خۆش ئەویست، ئەو پێشینانەی کە لە خزمەت دینا گیانی خۆیان کردە قوربانی، وە هەروا ماڵی خۆیان لە ڕێگەی خوادا سەرف کرد، وە لە کاتێکدا، کە زانیان دامەزراندنی دین لە هەووەڵەوە نیازی بە خزمەت و بە نوسینی پەرتوكو نووسراو و مورەتتەب کردن و تەوزیحدان و دامەزراندنی چەن بنەمایەکی بنەڕەتی هەیە، ئەوەی لەسەرشانیان پێویست کرابوو لەوانەی کە سود و کەڵکی هەیە بۆ ئیسلام و موسوڵمانان بەجێیان هێنا، وە خوای گەورە لەسوورەتی حەشردا لەئایەتی ژمارە دە ئەفەرمێ: ﴿**وَالَّذِينَ جاءُوا مِنْ بَعْدِهِم يَقُولوُنَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَ لِإخْوانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ**﴾

واتە: ئەو کۆمەڵە ئیماندارانەی کە لە دوای ئەسحابی پێغەمبەر ﷺ هاتوون بە ناو تابیعین دەرحەق بەو ئەسحابانە ئەڵێن: پەروەردگاری ئێمە خۆشبە لەو برایانەی ئێمە کە لە پێش ئێمەدا بوون، وە باوەڕ و ئیمانیان هێناوە، واتە ئەو تابیعینانە ئەسحابیان زۆر خۆش‌ویستووە لەبەر ئەوەی کە لەپێش ئەواندا داخڵی دینی ئیسلام بوون، چون لەناو تابیعینا کەسانێ بوون لە ئەخلاق و زانستا، وەکووو ئەسحاب وابوون و لە ئەخلاقی پێغەمبەریدا وەکووو ئەوان وا بوون وە بە زیکری خواو تەبەعییەت کردن لەپێغەمبەری خوادا دڵیان نوورانی بووە، وە دڵی ئەهلی ئیمانیان بەو ئەخلاقانە نوورانی کردووە.

جا بەم بۆنەوە پێویستە لەسەر تەواوی ئەوانەی کە لەدوای ئەوان هاتوون مەحەببەتی خوا و ڕەسوولی خوا و ئەهلی سەدەی یەکەم و دووهەمیان هەبێت، لە پێشەوایانی موسوڵمانان، وە لەساڵحان و پیاو چاکان وە... تارۆژی قیامەت، کە ئەمانەیش شموولی ئەبێت بۆ کۆمەڵی زانایان و پیاوەبەرزەکان لە موسوڵمانان بەتێکڕا، وە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبواری پاراستنی ئەم گەلە ڕەحم پێکراوەدا کە مەشهوورە بە ئوممەتی مەرحومە تێفکری بۆی مەعلوم بوو ئەم گەلە پێویستی بە سەرپەرەشتیکەرێك هەیە، وە ئەو سەرپەرەشتیکەرانەیش ئەهلی دەسەڵات و پیاوەتی بوون لە حاکمانی دادگەر و یارمەتی‌دەرانی ئەوانیش بۆ پاراستنی نەزم و ئینتیزاماتێکی گشتی کە ئەویش پارێزەری

ئیجراکردنی ئەحکاماتی خواییە، پێویستی کرد لەسەر نەفسی خۆی لە ڕەدیفی خۆشەویستانا خۆشی بوون، جا ئا لەوکاتەدا بە واجبی زانی لەسەرخۆی، وەك لەحەدیسێکدا کە ئەبوڕوقەییەی تەمیمی ڕیوایەتی کردووە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی:

**«اَلدِّينُ اَلنَّصِيحَةُ قَالُوا لِمَنْ يارَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ لِلّٰهِ وَ لِكِتَابِهِ وَ لِرَسُولِهِ وَ لِأَئِمَّةِ الْمُسلِمِينَ وَ عَامَّتِهِمْ»**

واتە: دین بریتییە لە ڕەهنومایی و خەیرخوازی، عەرزی پێغەمبەری خوایان کرد: بۆکێ ئەی نوێنەری خوا؟ لە وڵامدا فەرمووی: نەسێحەت لە بەر ڕەزایەتی خوا و کتێبی خوا و نوێنەری خوا و بۆ پێشەوایانی موسوڵمانان و بۆ عاممەی خەڵك بەگشتی. جا ئا بەم ڕەهنومایە خەیرخوازانە ئینسان ئەچێتە ڕزی ئەو کەسانەی کە فەرمانبەرداری خوان و داخڵی ئەو کۆمەڵانەی ئەبێت کە خوا لە سوورەتی نیسادا لەئایەتی ژمارە شەست و نۆ وحەفتادا باسی کردوون، فەرموویەتی:

**﴿وَمَن يُطِعِ اللّٰهَ وَالرَّسُولَ فأُولٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّٰهُ عَلَيْهِم مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولٰئِكَ رَفِيقاً ذٰلِكَ فَضْلٌ مِنَ اللّٰهِ وَكَفَىٰ بِاللّٰهِ عَلِيماً﴾**

واتە: هەرکەسێ فەرمانبەرداری خوای گەورەو پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ بێنی، وەخۆی پارێزی لەو شتانەی کە خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ مەنعیان کردوون ئەوە ئەو کەسە لە قیامەتدا خوای گەورە

ئەیخاتە ناو ماڵی ڕەحمەتی خۆی لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پلە و پایەیان بەرزە لای خوا، وەکووو نوێنەرەکانی خوا و ڕاستان و شەهیدان و ساڵحان، کە ئەمانەیش چە عەجایب ڕەفیقانێ باش و چاکن، وە ئەمەیشە کە خوا ئەیدا بەوانە لە ڕەحمەت و نێعمەتی خۆی بە مەحزی کەرەم و لوتفی خۆیەتی، وە ئەمەیشە بەسە و کافییە کە خوا پاداش و جەزای بەوانە ئەدات، کە فەرمانبەردارن، وە ئاگایە بە کەسانێ کە شیاوی فەزڵ و ڕەحمەتی خوان وە دارای ئیکرامن لەلایەنی خواوە.

لێرەدا ئەو پێشەکییە و موقەددیمە کۆتایە، دوایی دێت، کە ئەو موقەددیمە و پێشەکییە بۆ ئەو مەتڵەب و مەقسەدەی کە کەمینگایە بۆ گەیشتن بەسەر بەرزی هەمیشەیی لەدین و دونیا دا، وە بۆ کۆبوو نەوە لەگەڵ نوێنران و ڕاستاندا لە قیامەتدا، وە ئەو مەقسەدەیش بریتییە لە تێکۆشانی تەواو، تەلاشی بێوچانی پشت سەرهەم لەپاراستنی باوەڕو عەقیدە بەخواو فریشتەکان و کتێبە ئاسمانییەکان و نوێنەرانی خواو ڕۆژی ئاخێرەت و باوەڕ بە قەزا و قەدەر، وە جێ بەجێ کردنی یاسای ئیسلامی.

وە ئەمەیش بە خۆشویستنی خوا ئەبێت ئەو خۆشویستنەی کە تێکەڵ لەگەڵ ترس و ڕەجا و زیکری خوادا بێت، وە لەگەڵ ئیخلاس و پەنابردنە لای خوای گەورە دروست ئەبێت، وەکووو خوای گەورە لە سوورەتی «ڕەعدا» لەئایەتی ژمارە بیست و هەشتدا ئەفەرمێ: ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ وا تە: ئەی ئینسان هۆشیاربە! بە زیکرو یادی خوای

گەورە دڵان ئارام دەگرن و دائەمرکێن، وە هەروا ئەو مەقسەدە بە خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبێت، ئەو پێغەمبەرەی کە پلەی بەرزە و گەورەی هەموو نوێنەرەکانی خوایە، خۆشویستنێکی وا کە شموولی بێت بۆ ئالە بەرزەکانی و ئەهل و خێزانی ئەو، ئەو ماڵ و خێزانەی کە ماڵی گەورەیی و ڕاستی و خاوێنی بوون، وە هەروا بە خۆشویستنی یارە بەرزەکانی ئەبێت، ئەو یارانەی کە یاری جیهاد و تێکۆشان بوون لە دیندا ئەوانەی کە بە فرمێسکی پاکی چاوانیان درەختی ئیمان و ئیسلامەتیان ناشت و ئاودێرییان کرد.

وە لە یانەی ئەم جێهانەدا پاراستیان وە هەروا بە مەحەببەتی پێشەوایان و تێکۆشەران و زانایانی عامل پاسەوانانی دین بۆ موسوڵمانان ئەبێت، وە هەم بەخۆشویستنی دۆسانی خوا ئەبێت، ئەو دۆسە ساڵحانەی کە دڵیان بە نووری ڕەحمەتی خوا نوورانی بووبوو، وە ئەو نوورەی دڵیانە ڕژایە سەر دڵ و دەروونی ئەو کەسانەی کە تالبی هیدایەتن، وە بە سەر دڵی ئەوانەیشدا کە هاوکاری ئەوانیان کردووە تا ڕۆژی قیامەت.

# خۆشویستنی خوای گەورە چۆن دەس ئەدات

خۆشویستنی خوای گەورە، بە بارهێنان و ئولفەتدانی ڕۆحی ئینسانی لە سەر زیکر و یادی خوای گەورە و تێفکرین لە ئاسەوارەکانی و نێعمەتەکانی خوای گەورە پەیدا ئەبێت، وە هەروەها بە ئونس و ئولفەتگرتن و بە مولاحەزەکردنی تەجەلییاتی خوا و نێعمەتەکانی بە سەر مەخلۆقاتدا ئەبێت، بەتایبەت لەسەر نوێنەرەکانی و نێرراوەکان و پیاوە بەرزەکان لە بەندەکانی تایبەتی خۆی، وە بە ڕژاندنی ڕەحمەتی خۆی و نیعمەت و ئیحسانی خۆی بە سەریاندا، وە هەروا بە دیققەت کردن لە وەسفی نەفسی خوای گەورە، وەکووو بوونی واجبی بۆ زاتی خوا، وە هەروەها لە وەسفە سەلبیەکان، وەکووو قەدیمییەت و تەنهایی و بێنیازی و جیاوازی لەگەڵ ئەم بوونەوەرەدا، یا وەکووو بەقا و مانەوەی هەتاهەتایی، یا بە دیققەت کردن ئەبێت لە وەسفە زاتییەکان، وەکووو زیندوویی و زانستی و ویستی و قودرەت و توانایی و بیستن و بینین بۆ تەواوی زەرڕاتی ئەم بوونەوەرە.

وە بە دیققەت کردن لە کەلامی پەروەردگار ئەبێت، کە خوای گەورە لەگەڵ نوێنەرەکان و نێرراوەکانی، وە بەندە ڕێزلێگیراوەکانی لە فریشتەکانی کە هەمیشە گفتوگۆی کردووە لەگەڵیان، وە هەروا بە بیر و دیققەت کردن ئەبێت لە هاویشتنی حەقیقەتەکان لە دڵ و دەروونی کەسانێکدا، کە خوا ئارەزوو و مەیلی لەسەر بووە، وە یا لەمەودوا ئەبێت، ئەوانەی کە پرشەی بەخششەکانی خوا شامڵی حاڵیان بووە، وە یا لەمەودوا ئەبێت، وە ئەم مەحەببەتەی خوا، بڕێ کات بۆ ئینسان پەیدا ئەبێت و دەس ئەدات بە بەخششی تایبەتی خوا بۆ کەسانێ کە خوا ویستی لەسەر بێ، وە بڕێ جاریش پەیدا ئەبێت لە ڕەفاقەت و دانیشتن لەگەڵ پیاوە چاکەکاندا، ئەوانەی کە ئاگایان لە ناوەکان و وەسفەکانی خوا هەیە.

وە هەروا بە ڕەفیقی و تێکەڵی ساڵحان، لەو بەندانەی کە دڵیان بە نووری خوا ڕۆشن بووەتەوە، وە نووری خوا لە دڵیانەوە ئەڕژێتە ناو دڵی کەسانێ، کە لەگەڵیاندا بەئیخلاسەوە دائەنیشن، وە ئارزوو و مەیلیان هەیە بۆ ئەو بەخششانەی کە خوای گەورە پێیان عەتا ئەکات، وە هەروا بڕێ کاتیش ئەو نوورە پەیدا ئەبێت بە زیکر و یادی خوا کە بە دڵ و زمان وە یا بە باقی ئەندامەکانی ئینسان ئەکرێت، ئەوانەش کەسانێکن کە خوای گەورە لە سوورەتی ئالیعمران لە ئایەتی ژمارە سەدو نەوەدو یەکدا لە بارەیانەوە ئەفەرمێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰماً وَ قُعُوداً وَ عَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَ يَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: ئەوانەی کە بە

دەوام زیکر و یادی خوا ئـەکەن کەسانێکن بە پێوە و بە دانیشتانەوە و بە ڕاکـشانەوە عـیبادەتی خـوا ئـەکەن و تـەرکی نـاکەن، وە بیر ئـەکـەنەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و سەرزەوی و باقی دروستکراوەکانیتریش.
وە هەروا هەندێ جار ئەو دڵڕۆشنییە لە خـوێندنـەوەی قورئان و بـڕێ جـاریش بـە خـوێندنەوەی پـەرتۆکی خـوانـاسان لە جـێی خـەڵوەتـدا و لە جێی پەنامەکیدا پەیدا ئەبێت و دەسئەدات.

کەوابوو پاڵفتەی ئەم باسەیە بە شێوەی گشتی ئەمەیە، فەرمانبەرداری و تاعەتی خوای گەورە، بە گوێرەی نییەت و قەسدی ئینسان ئەسەری هەیە لە دڵ و دەروونی ئادەمیزاددا واتە چەن دەرەجە عیبادەت بۆ خوایە، بەو ئەندازە تەئسیر دائـەنێ، وە ئیعتیباری بـەگوێرەی ئیخلاس و نییەتی خاوەنەکەیەتی، وە ئەمەیش ئەگەڕێتەوە بۆلای زیادە لوتفوو بەرەکـەتی خوای گەورە کە بە سەر چ‌کەسێکدا بیرژێنێ.

وە گـومانیش نـییە لەوەدا کـە ئـەم خـۆشویستنە واجب و پـێویستە لەگەڵ ترسان و خەوفی خوادا بێت، وە ئەو ترسەیش حاڵێتیکی نەفسییە و ئـێش و ئـازارێـکی قـەلبییە، وە یـاسوتانێکی دڵی و پـەنامەکییە بـەهۆی چـاوەڕوانـی کـردنی شتێکی نـالەبار لەبـەردەم و ڕێـڕەوی ئـینساندا، چ بـە تیاچوونی کەلەپووری دونیایی یا ماڵ و منداڵ و سەمەراتی باغ و باغات بێت، وە یا سزا و عەزابی خوایی بێت چ لە دونیادا یا لە داهاتووی ڕۆژی پـەسەلاندا، وە حـەققەن لەکـاتێکدا، وەزیـفەی بـەندەکان بـەندایـەتی و

دانــەوانــدنی ســەری تــەسلیم و زەلیـلییە لە بـەرابـەر فـەرمانەکانی خـواوە لەتـەواوی تـەمەن و ژیـاندا، پێویستە لەسـەریان هـاوکاتی ئەنجامدانی ئەو عیبادەتەیش مەترسییان لە ناتەواوییەکانیان لە بەجێهێنانی ئەو عیبادەتەدا ببێت، وە یـا خۆیان لەو شتانەی کەلێیان مەنع کراوە بپارێزن، تاوەکووو ئەمحاڵتانە بیانکێشێ بۆ ئەوەی لە باقی حاڵەتەکانی تریاندا ئیهتیمام بکەن بە کارەکانیان. کەوابـوو ترسان لەخوا یەکێکە لە هۆیەکانی بەجێهێنانی عیبادەتی خوای گەورە، هەروەکووو بە تەمابوون و ویست و ئارەزوو بـۆ بـەخششەکانی خوای گەورە هۆیەکی ترە لەو هۆیانـە، جا لەبـەر ئەوە خوای گـەورە لەسـوورەتی سـەجدە لە ئـایەتی ژمـارە شـازدەدا فـەرموویەتی: ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُم خَوْفاً وَطَمَعاً﴾ واتە: ئەو کەسانەی شەونخوونیان هەیە داوائەکەن لە خوای خۆیان، وە ئەپاڕێنەوە و مەترسیشیان هەیە لە سزای پاشەڕۆژ، تەمەع و ئارەزوویشیان هەیە بۆ پاداش و جەزای کردەوەکانیان لە قیامەتدا.

کەواتـە ترسان لە خوا یەکێکە لە واجباتی بەندەکانی خوا، وە بەشێکە لە پێـداویستی باوەڕ بە زاتی خوای گەورە، بـۆیە خوای گەورە فەرمانی داوە بـە بـەندەکانی کـە تـرسیان لەخـــوا هـەبێت، وە ئـەو تـرسانەیشەی بەستووە بە باوەڕکردن بە زاتـی خـوای گـەورە، وەکووو ئەم ئایەتە بەرزە نیشانی ئـەدات، خـوای گـەورە لەسوورەتـی ئالیعمرانـدا ئایەتی ژمارە سـەدو حـەفتاو پـێنج ئـەفەرمێ: ﴿وَخَافُونِي إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ واتـە: لە مـن بترسن و فەرمانی من بەجێبێنن ئەگەر ئێوە خاوەنی بڕوایەکی ڕاستن، وە

هەروا خوای گەورە، ترسانی بەندەکانی کورت و خۆلاسە کردووەتەوە لە ترسان لە خوای گەورە، واتە: ئەشێ ئینسان بەس لەخوا ترسی ببیت، وەکوو خوا خۆی لەسوورەتی بەقەرە، ئایەتی ژمارە چلدا ئەفەرمێ: ﴿وَإِيَّايَ فَارْهَبُونَ﴾ واتە: ئەی کۆمەڵی مرۆڤ بەس لە من بترسن مەترسیتان لەکەس نەبێت، وە هەروەها خوای گەورە تەعریفی لەو بەندانە کردووە کە ئیخلاسیان هەیە و موخلیسانە عیبادەتی خوا ئەنجام ئەدەن، خوای گەورە لە قورئاندا لەسوورەتی ئەحزاب ئایەتی ژمارە بیست و نۆدا ئەفەرمێ: ﴿وَ يَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَداً إِلَّا اللَّهَ﴾ واتە: ئەو بەندانەی کە فەرمانی خوای گەورە ڕائەگەیێنن ترسیان لە خوا هەیە، وە لە غەیری خوا لە کەستر ناترسن، بەڵکوو زیاتر لەمەیشە خوای گەورە لە قورئاندا لە سوورەتی ئەنفال لە ئایەتی ژمارە دوودا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ واتە: خاوەن بڕوای تەواو و موخلیس کەسانێکن کاتێ ناوی خوای گەورە هێنرا و لەسەر زار وترا دڵیان بێتەیەك و لەهەیبەتی ناوی خوادا بترسن، وە لە ڕاستیا ئەم ترسان لە خوایشە بەگوێرەی پلەی زانستیان فەرق ئەکات و جیاوازە، واتە: ئەوانەی پلەی زانیارییان لە ژوورترە زیاتر ترسان لە خوایان هەیە، وە ئەو ترسانە لە ڕیشەو ئەسڵی زانستەوە سەرچاوە ئەگرێ، هەر بۆیە خوای گەورە لە سوورەتی فاتر، ئایەتی ژمارە بیستو هەشتدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ واتە: بەڕاستی تەنها زانایان ئەزانن بە

چ‌شێوەیەك لە خوای گەورە بترسن، وە بە چ ئەندازەخوا شیاوی ئەوەیە کە بەندەکانی لێی بترسن، وە ئەمە شتێکی سورشتی و تەبێعییە، وە لەکەس شارراوە نییە، خوای گەورە لە سوورەتی یوسف لە ئایەتی ژمارە حەفتاو شەشدا ئەفەرمێ: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ واتە: لە ژوورەوەی هەموو خاوەن زانستێکەوە کەسێکی‌تر هەیە کە زانستی زیاتر بێت، جا لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەری خۆمان حەزرەتی موحەممەدﷺ لەهەموو ئینسانەکان زیاتر لەخوا ترساوەو ترسی زۆرتر بووە، هەر بەم‌بۆنەوەیە پێغەمبەرﷺ لەفەرموودەیەکیا ئەفەرمێ: «أَنَا أَخْوَفُكُمْ لِلّٰهِ» واتە: من لە هەمووتان زیاتر ترسم لە خوا هەیە، کەواتە: پێویستە و لازمە لەسەر ئینسانی خاوەن بڕوا ئەمە کە مەحەببەت و خۆش‌ویستنی بێت وە ڕەغبەت و ئارەزووی ببێت، وە مەترسیشی ببێت لە خوایەك کە زیندووە و نگادارندەی ئەم بوونەوەرەیە، وە هیچ شتێکی لێ ون نابێت، زۆر بێت یا کەم، وە خاوەنی ئیمان و بڕوا نابێ فەرمانبەرداری و ئیتاعەی کەسانێ بکات، کە غافڵن لەشتێکدا کە ئەکێشێ بۆلای غەفڵەت و بێ‌ئاگایی، وە لەسەر ئەم بنەما و ئەساسەیە خوای گەورە خۆشەویستەکەی کە حەزرەتی موحەممەدەﷺ مەنع ئەکات لەشوێن کەوتنی کەسانێ کە غافڵن لە زیکرو یادی خوای گەورە، وە شوێن کەوتووی ئارەزواتی خۆیان کەوتوون خوای گەورە لەسوورەتی کەهفدا لە ئایەتی ژمارە بیست و هەشت فەرموویەتی:

﴿وَلا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ﴾ واتە: شوێن کەوتووی کەسێك مەبە کە دڵی بێئاگایە و غافڵە لە زیکر و یادی ئێمە، وە شوێن ئارەزواتی خۆی کەوتووە، وە لەگەڵ بوونی ئەو دوو وەسفە گەورەیە لەئینسانی خاوەن بڕوادا پێویستە لەسەری بە قەتعی کە ئومێدی بە ڕەحمەتی خوای گەورە ببێت و هەم ترس و ڕجایشی ببێت. واتە: لە نێوان ترس و ڕەجادا بێت، وە لە ناو دائیرەی ئەم دوو شتەدا، قەراربگرێت و بووەستێ بەو مانا، نە ئەمین بێت لە خۆی، وە نە مەئیوٚسیش بێت بەڵکوو لە نێوان ئەم دوو شتەدا بە سەر بەرێت، چون هەریەك لە ئەمینبوون و مەئیۆسبوون خەتەرناکن بۆ ئینسان، بەجۆری کە هەرئان خەتەری کافربوون هەیە بۆ ئەو کەسە، پەنا بەخوای گەورە، وە ئەم حاڵتە مامناوەندییە حاڵەتی ئیعتیدالە و چاکە، وە هەروا ئینسان هەندێ جار حاڵەتێکی بۆ پەیدا ئەبێت، کە ڕایئەکێشێ بۆ زیادە ترس یا بۆ زیاتر ئومێدواربوون کە ئەم دوو حاڵەتە هەردوولاکەی حەققەو زیانی نییە، وە لە ناو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا، کە زۆرتر ئومێدەواری بدا، بە ئینسان ئایەتی ژمارە پەنجاو سێی سوورەتی زومەرە کە خوای گەورە ئەفەرمێ:

﴿قُلْ يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾. واتە: ئەی نوێنەری خوا تۆ هەواڵ بدە بە بەندەکانی خوا ئەوانەی کە خاوەن بڕوان و بەهۆی هەڵەو

تـاوانـەوە زیـادەڕەوییان کـردووە لە نـەفسی خـۆیان مـەئیۆس مـەبن لە ڕەحـمەتی خـوای گـەورە، خـوای گـەورە هـەموو تـاوانـەکان ئـەبەخشێ و چـاوپۆشییان لێئـەکات بـۆ کـەسانێ کـە ئـارەزووی لێ بـێت، هـەرچەن تـاوانـەکانیش زۆربن، چون خوا خوایەکە چاوپۆشی ئەکات و ڕەحمی زۆرە دەرحەق بەو بەندانەی کە خاوەن بڕوان.

وە هەروا لە حەدیسی قودسیدا هاتووە خوای گەورە فەرموویەتی: **«أَنَا عِندَ ظَنِّ عَبْدِي بِي»**[1] واتە: من لەگەڵ گومان و نەزەری بەندەی خۆمدام، ئـەو چۆن گومانی بێت بە من، من وام لەگەڵی. وە ئینسان هـەرکاتێ لە دڵی خـۆیدا لە نـێوان خـەوف و ڕەجـادا خـۆی قـەراردا، دەرئـەکەوێ کـە لەڕاستی و حەقیقەت نزیکترە، چون خوای گەورە ئەم میللەتی ئیسلامەی بە گەلێکی مامناوەندی ناو بردووە و حیسابی کردوون، کەوابوو لەسەری پێویست کراوە کە لە باوەڕ و کردەوەدا میانەڕەو بێت، وە لە زیادەڕەوی خـۆی پـارزێت؛ چـون زیـادەڕەوی لە هـەرکـارێکـدا و لە هـەرشتێکدا وەسفی نەزانکارانە، وە لەو شتانەیە کە ڕوون و ئا شکرایە لای هەموان ئینسانی نەزان یا ئیفراتییە یا تەفریتییە، کە هیچلایان بۆ ئینسان باش نین، وە هـەروەها لە پێداویستیەکانی خـەوف و ڕەجـایە کـە ئـەم دوو وەسـفە شـوێنکەوتووی مەحەببەتن، وە مەحەببەتیش ئاسەواری ئیمان و باوەڕە،

---

١. سحیح بخاری: (٢ / ٤٠٩).

کە ئەمانە ئەبنە هۆی زیکرو یادی خوای گەورە، چون وتراوە و زانراوە کە ئینسان کاتێ هەرشتێکی زۆر خۆش بوێت زۆرتر باسی ئـەکات و ناوی ئـەبات، هـەروەکووو ئینسان ئـەگـەر زۆر لەشتێ بترسێ زۆرتر باسی ئـەکات و یادی ئەکات.

# زیکرو یادی خوای گەورە

یادو زیکری خوای گەورە ئەبێتە هۆی هەڵکردنی نوور لە دڵی ئینساندا، وە هەروا لە سەر زمانی و بەسەر تەواوی جێگا حەسساسەکانیدا، وە بەسەر ئەو ئەندامانەیدا کە شتیان پێ دەرك ئەکات و ئەبیسێ یا ئەبینێ و... وە بە هۆی زیکرو یادی خواوە دڵی ئینسان ئارام ئەبێت وە ئەندامەکانی دامەزراو ئەبن، وە بڕێکات زیکرو یادی خوا زاڵ ئەبێت سەیتەرە پەیدا ئەکات بە سەر وجوودی ئینساندا، بە جۆرێك کە تەواوی زەرڕاتی بەدەنی ئینسان داگیر ئەکات، ئەو کاتە تەواوی وجوودی بە نووری خوا نوورانی ئەبێت، وەئەو ئینسانە بە تەواوی وجوودی مەشغوڵ نەبێت، وە تەواوی نیرو و هێزەکانی وجوودی ئینسان شوعلەوەر ئەبن، وە ئەم حاڵەتەیش تەنها خواناسان و عارفان دەرکی ئەکەن، وە نیشانەی ئەم حاڵتەیش ئەوەیە کە بەندەی خوا، بەتەواوی وجوود ڕوو لە خوا ئەکات، ئیتر ئەو کاتە بەس تەنها لە یادی خوادایە و بەیادی خواوە زیکر ئەکات و بەیادی خواوە گۆێ لەشت ئەگرێ و بەیادی خواوە ئەڕوانێتە شتەکانی

ئەم بوونەوەرە، خوای گەورە لەسوورەتی ئیسرادا لە ئایەتی ژمارەچل و چواردا ئەفەرمێ: ﴿وَ إِنْ مِّنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِنْ لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ واتە: هیچ شتێك نییە لەم بوونەوەرەدا ئیللا یادو زیكری خوای گەورە ئەكات بەڵام ئێوە نازانن تەسبیحات و زیكری ئەوانە چۆنە؛ چون ئەوانە هەریەك بە زمان و لەهجەی تایبەتی خۆیان زیكری خوا ئەكەن، كە ئێوە لەو زیكرو زمانە تێناگەن، وە ئەم حاڵەتەیش تایبەتمەندی هەیە بە عەبدانی دیاریكراوی خواوە لەم بوونەوەرەدا.

وە هەروا خوای گەورە زیكر و یادی خۆی باس كردووە و فەرمانی بە بەندەكانی داوە كە زیكری خوا بكەن، وە ئەو كەسانە كە زیكرو یادی خوا ئەكەن خوای گەورە تەعریفی كردوون، وە ئینسانەكانی مەنع كردووە لەوە كە غافڵبن لە زیكرو یادی خوا، وە هەروا مەنعی كردون كە ڕەفیقی ئینسانی غافڵ و دوور لە خوا بكەن ئەمەیشی لە چەن ئایەتێكدا و لە چەن عیبارەتێكدا بەیانكردووە.

وە هەم تەعریفی ئەو ئینسانانەی كردووە كە زیكری خوا ئەكەن و لە هیچ حاڵەتێكدا لەو زیكرە دوور ناكەونەوە، چ لە حاڵەتی ڕاوەستانا و، چ لە حاڵەتی دانیشتانا (ڕاكشانا) و، چ لە حاڵەتی پەنامەكی و ئاشكراداو، چ لەحاڵەتی خۆشی و ناخۆشیدا.

جا خۆشبەختی بۆ كەسانێك كە بەو وەسفانە خۆیان جوان و ڕازاوە كردووە، پاشان با بزانین زیكرو یادی خوای گەورە هەروەكووو بە دڵ

ئەکرێت بە زمانیش ئەکرێت، وە ئەو بەشەی ئەووەڵە، بە چەن شێوە و جۆر پێك دێت مەسەلەن بە مولاحەزەکردنی زاتی خوا و، وەسفەکانی یا بەتێبینی و مولاحەزەکردنی ئاسەوارە دروستکراوەکانی لەم جیهانە بەرینەدا، بەشێوەی گشتی، وە یا لە ناو نەفسی ئینسانەکاندا بە شێوەی خسوسی و تایبەتی، وە یا بە وەرگرتن و دەرككردن بۆ شتە سەرسوڕهێنەرەکان لە ناو نەفسەکاندا و... وە هەروا بە مولاحەزە کردنی ئەوەی خوا دایناوە لە ناو ئەم بوونەوەرەدا لە شتە سەرسوڕهێنەرە ودروستبووەکان، وە لە شتە مادییەکان و مەعنەوییەکان، بە جۆرێکی وا، کە دڵی ئینسان بە وێنەی بولبول هەڵ ئەخوێنێ بەم فەرموودەیەدا کەخوا لەسوورەتی نەمل ئایەتی ژمارە هەشتاو هەشتدا فەرموویەتی:﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ واتە: ئا ئەو دروستکراوەی سەرسوڕهێنەرەی خوایە سەنعەتێکەو دروستکراوێکە مەحکەم و دامەزراوی کردووە لە دروستبوونەکەیدا، وە لە نێوان ئەو شتە دروستکراوانەدا شتی عەجیب و غەریبی داناوە و دروستی کردووە.

وە هەروا ئەو زیکرە پێك دێت بە تێڕوانین لە نیعمەتە هەمیشەیەکانی خوای گەورەدا کە داویەتی بە سەر دروست کراوەکانیدا لە ئەرزو ئاسمانەکاندا، وە بڕێ کاتیش ئەو زیکرە پێك دێت بە وتنی ڕستەو عیباراتێکی جوان و خاوەن مەجد، یا بە عیباراتی یەکتایی وتن، وە هەروا بە عیباراتی سەناو سوپاس و تەسبیحات وتن، بەشێوەی زاهیرو

ئاشکرا، یا بە فکرکردن لەو نێعمەتانەی کە داویەتی بە سەربەندەکانیا، بەوە کە ڕێگاکانی خێرو چاکە لە فێربوونی زانست و فێرکردنی و بە داهێنانی شتەتازەکان و بەداچوون لە قوڵایی ئاسەواری ئەم کەونە و سوود و قازانجی گشتی کە پێی بەخشیون ئەبێت.

وە هەروا برێ جار ئەو زیکرە پێك دێت و دروست ئەبێت بە وەعز و نەسیحەت و شارەزایی و ڕاکێشانی بەندەکانی خوای گەورە بە هەر شێوە بۆ لای خوا و بۆ بەجێهێنانی ئەو شتانەی کە حەققی خوان، وە لە سەر بەندەن کە بە سۆزو باوەڕو ئیخلاس بەجێیان بێنێ، وە هەروا ئەو زیکرە دڵییە برێ کات دێتەجێ بە جاری کردنی وشەکانی زیکر بە سەر دڵدا، واتە بەڕام کردن و فێرکردنی دڵ بەو زیکرەیە، وەکووو ئەمە کە وشەی موبارەکی «اللّٰه» بەزمان جاری بکات و زمانی بە ملاشوویەوە بچەسپێنێ وە مولاحەزەی مانای ئەو لەفزە گەورەیە بکات، کە بریتییە لە زاتی واجب الوجود، کە بە وەسفی گەورەیی و کەماڵ ڕازاوەتەوە و پاکە لە هەر نەقس و ناتەواوییەك، وە لەو کاتەدا ئەو خاوەن دڵە چاوەڕوانی ڕژانی بەرەکەت و ڕەحمەت ئەکات لەزاتی خوا بەبێ دیاری کردنی جیهەتێك بۆ زاتی پەروەردگار.

جا ئەو خاوەن دڵە ئەگەر دەوامی کرد لەسەر ئەم زیکرەو جاری کردنی ئەم لەفزەیە بەسەر دڵیدا، ئەوکاتە فێر ئەبێت کە چۆن زیکر بکات وە هەم دڵی نوورانی ئەبێت و دڵی بەو لەفزەیە زاکر ئەبێت بە جۆرێ کە

خاوەن دڵەکە ئاگادار ئەبێت و پێی ئەزانێ، وە پێویستە کە ئەو دڵەیە لەگەڵ ئەو لەفزەیە جاری کات لەبەر ئەوەی کە خوا تەنهایە شتی تاك و تەنهای پێ خۆشەو جوانە چ لە زیکرا،وە چ لە کردەوە پەسەندەکان بێت، وە ئەم زیکرەیە زیکرێکە کە خواناسان لە کاتی فێرکردنی شاگردەکانیاندا وەها فێریان ئەکەن و باریان ئەهێنن، وە لەم زیکرە دڵییەوە بەرزئەبنەوە بۆلای زیکری ئەو لەتیفانەی کە لە ڕووی ناوەوەی سینەی ئینساندا جێ گیر بوون کە ناسراون بە لەتیفەی ڕۆح، لەتیفەی سێڕر، لەتیفەی خەفێ، لەتیفەی ئەخفا. وە لە دوای زاکر بوونی ئەم لەتیفانە بەرز ئەبنەوە بۆلای زیکرکردنی لەتیفەی نەفس، کە لە ناوچاوانی ئینساندایە، وە وەختێکیش لەتیفەی نەفس نووورانی بوو، نوورەکەی ئەرژێ بەسەر باقی ئەندامەکانی بەدەندا، وە بەم شێوە ئینسان واردی ئەووەڵین پلەی پاکی ئەبێت، وە ئەم نەوعە زیکرە لای خواناسان ناسراوە بە زیکرو یادی قەلبی، یا زیکرو یادی لەتائف، وە ئەمەیشە شتێکی عادییە لای ئەو پیاوە بەرزانە لە بەندەکانی خوا، خوای گەورە بمانگێڕی لە زومرەی ئەو پیاوە بەرزانە. چون خوا خوایەکە ئەرحەمورڕاحیمینە، وە هەروەها برێ جار زیکری خەفی و پنامەکی ئەوتری و ئیتلاق ئەکری بەسەر ئەو زیکرەیەدا کە بەهێواش لەسەر زمان جاری ئەبێت، وەئینسان نایبیسێ کە ئەم بەشە ساحێبەکەی ناکا بەخاوەن پاداش و ئەجر، لەو جێهەتەوە کە زیکری لەفزییە.

چون عیبادەتی سەرزمانی کاتێ خاوەنەکەی ئەکا بە ساحێبی پاداش و ئەجر، کە خۆی بیبیسی، بەڵکوو ئەم نەوعە زیکرە، کەخاوەنەکەی ئەیکا لەو جیهەتەوە کە خاوەنەکەی خەریکی ئەم زیکرە بووە، وە بووەتە هۆی ئەوە کە لە دڵا تێ‌فکرێ و فێری زیکری قەلبی بێت تا بۆی بێتەمەلەکە لە دڵی جیا نەبێتەوە، وە ئەو ئینسانە بەم شێوە مەجبوور ئەبێت کە ئەو زیکرە لەفزییە جاری کات، ئەوەخێری ئەگات و پاداشی هەیە، ئەوەی کە بە شێوەی گشتی مەشهوورە بە زیکری پەنامەکی، ئەوەیە کە ئەو زیکرە پەنامەکییە بە زمان بکرێ بە جۆرێ بێت کە خاوەنەکەی بۆ خۆی بیبیسێ و بەس، وە ئەگەر کەسێ لەلایا بوو، نەبیسێ.

زیکری ئاشکرا ئەوەیە کەساحێبەکەی گوێی لێ بێت، وە کەسێ لەلایا بوو ئەویش گوێی لێبێت، ئەم دوو بەشە زیکرە، هەردوکیان خاوەن ئەجر و پاداشن وە پلەی پاداش وئەجری ئەم زیکرانە بەگوێرەی مەقام وقەسدی خاوەن زیکرەکان تەفاوت و جیاوازییان هەیە، وە ئەم زیکرە لەفزییە برێ جار لە قاڵبی دوعا و پاڕانەوەدا ئەبێت، وەکووئایەتی ژمارە دوو سەدو یەکی سوورەتی بەقەرە بە ڕوونی ئەمە دەرئەخات کە خوای گەورە ئەفەرمێ: ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَ فِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ واتە: پەروەردگاری ئێمە پێمان ببەخشە لە دونیادا چاکە و خێر، وە لە ئاخێرەتیشا، کە ڕۆژی پەسەڵانە چاکەو خێرمان پێ عەتاکە، وە بمانپارێزە لە سزای ئاوری جەهەننەم، وە هەروا برێ جار ئەو زیکرە بە

شێوەی بانگ کردن لە زاتی پەروەردگار ئەبێت بەم جۆرە ئینسان ئەڵێت: «یاالله» کە ئەم زیکرە بە هەردوو شێوەکە دروستن و ڕستەیەکی تەواون، چون بەشی دووهەم کە ڕستەی «یاالله»یە ماناکەی بەم جۆرەیە واتە: من بانگ ئەکەم لەزاتی «الله» وە ئەمەیش ڕستەیەکی خەبەرییە، بە کارگیراوە لە داخوازی بە ڕوو تێکردنی زاتی خوا بۆ بەندەکەی کە ئەمەیش ئەبێتە ئینشاو ماناکەی وای لێ دێت: ئەی خوایا! بەفەزڵی خوت و ڕەحمەتی خۆت ڕووم تێ بکە ئەو فەزڵ و ڕەحمەتەی کە شموولی بۆ تەواوی بوونەوەر هەیە، وە هەروا برێ جار زیکری خوا بە لەفزی جەلالە واتە: وشەی موبارەکی «الله» ئەبێت بە تەنها بەم شێوە ئەڵێت «الله، الله، الله» وە بەم شێوە زیکر کراوە، وە بووەتە یاسایەکی سەرەکی لە دائیرەکانی زیکرکردنا، بە پەنامەکی و لەخەڵوەتدا، چ لە گوزەشتە و حاڵدا، وە چ لەئایندەدا.

وە زانایانی ئیسلام بەم جۆرە زیکرە ڕازی بوون، وە ئەم شێوە زیکرکردنە وای لێهاتووە وەکووو یەکدەنگی زانایان، واتە ئیجماعی لەسەر بێ ئاوایە، وە ڕەسولی خوا بۆلای ئەم نەوعە زیکرە ئاماژەی کردووە و فەرموویەتی:

**«لَاتَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّىٰ لَايُقَالُ فِي الْأَرْضِ اَللّٰه، اَللّٰه»** ئیمام ئەحمەد ﷺ لەئەنەسەوە ئەم فەرموودەیە لە مەسنەدی خۆیا ڕیوایەت کردووە، واتە: ڕۆژی قیامەت بەرپا نابێت تا خەڵکان لەسەر ئەم ئەرزەدا وایان لێ دێت

کەسێ نییە وشەی «اللّٰە» بڵێت، ئەم فەرموودەیشە ئاماژە بەوەیە ئەم نەوعە زیکرە لە ئاخر زەماندا نامێنێ. وە ئەم زیکرە تەکییە هەموو کات لەسەر ئەساسی ئەوە دانراوە کە شتێك لەو لەفزە لابراوە کە بەو شتە چڕاوە ڕستەکە تەواو ئەبێت. لە ئاخرا ئاوای لێ دێت کەبەم جۆرە ئەخوێنرێتەوە «اللّٰە ربّي» یا «اللّٰهُ المعبُودُ» وە ئەم نەوعە ڕستەیشە بەم جۆرە سەحیحە و جوانە، وەکووو لەئایەتی بە قیمەتی ژمارە سی و هەشتی سوورەتی زومەڕدا خوای گەورەئەفەرمێ ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمٰوٰتِ وَالْأَرْضِ لَيَقُولُنَّ اللّٰهُ﴾ کە تەقدیری ئەم کەلام و ڕستەیە ئاوایە «خَلَقَهُنَّ اللّٰهُ»، کە ڕستەی «خلقهنّ» لابراوە، بەڵام ئەگەر لەفزی «اللّٰە» شتێکی بۆ تەقدیر نەکەین و شتە حەزفکراوەکە لە نییەتیشدا نەبێت ئەوە ئەم وشەیە لە ڕستەی عورفی، کە فائیدەو سود بگەیەنی ئەچێتە دەر، بەڵام لەوە خارج نابێت کە شتێکە لەسەر زمانی ئینسانێ هاتووەتەدەرەوە، وە لەوە خارج نابێت کە ئەمە زیکر نییە و لە زیکر خارجە، چون تەلەفوز کراوە بەناوی کەسێ کە مەقسوودە و پێویستە.

وە زیکریش بەم مانایە لە زاتی خۆیدا خاوەن فائیدەیە، وە فەرەح و خۆشحاڵی تێدایە بۆ ئەو خۆشەویستانەی کە ئولفەتیان بەم زیکرەوە گرتووە، وە خاوەن بەرەکەتە و قووتی دڵانە بۆ کەسانێ کە ئەهلی زیکر و عیبادەتن، وە تەنها بۆ خوایە چاکەی ئەو کەسە کە ئەم تەك شێعرەیەی وتووە:

أَعِد ذِكْرَ نُعْمَانٍ لَنَا فَإِنَّ ذِكْرَهُ    هُوَ الْمِسْكُ مَا كَرَّرْتَهُ يَتَضَوَّعُ

واتـە: دوبارە بکەرەوە ناوبردنی نوعمانی کوڕی سابت بۆ ئێمە چون ناوبردنی ئەو وەکووو میسکی بۆنخۆش وایە، هەتا زۆرتر ناوی بەریت زیاتر بۆنخۆشی ئەکەوێتە ناو مەجلیسی ئێمەوە، جا لە سوورەتێکدا کە دڵان بـە نـاوبردنی نـوعمان خـوشحاڵ بـبن ئـەبێ بـەناوبردنی خـالیق و بەدیهێنەری دڵان، کـە خوایە چۆن بێت، جا زیاتر لەوە کاتێ کە ئینسان زاکیرەو وێـژەری لەفـزی «اللّٰـە»یە ئـەزانـێ کـە مانای لەفـزی «اللّٰـە» زاتـی «واجب الوجـودە» و جـامیعی تـەواوی کـەمالاتە، وە لە دڵی ئـەو کـەسەدا داخوازییە پەنامەکییەکان بە ئەندازەی ئەجزاکانی ئەو مانایە لە دڵیدا حازر ئـەبن، وە لە کـاتێکیشدا کـە ئینسانی خـاوەن ئـاوەز، تـەماشا و سـەیری فەرموودەی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ کە فەرموویەتی: **«اِنَّ لِلّٰهِ تِسْعَةً وَ تِسْعِينَ اِسماً مَنْ أَحْصٰاهٰا دَخَلَ الْجَـنَّةَ»**[1] واتە: بۆ خوای گەورە نەوەدو نۆ ناو هـەیە کەسێ بیان زانـی و هـەڵیانژمێرێ داخڵی بەهەشت ئەبێت، وە ئەزانێ کە هەڵژماردنی ئەو ناوە پیرۆزانە بریتییە لەوە، کە ئینسان دانەدانە هـەڵیانژمێرێ بەم جۆرە، کە بڵێت: «اللّٰه، الَرحمانُ، الرحيمُ» تا ئاخر، ئەو کـاتە یـەقین حـاسڵ ئـەکات کـە تـەلەففوز کـردن بـەناوە جـوانـەکانی خـوا پاداش و سەوابی تەواویان هەیە، هەروەکووو ئەگەر کەسێ بیر بکاتەوە

---

١. سەحیح بوخاری (٢٦١/٩).

لە حاڵو وەزعی کەسانێ کە خالیسەن زیکرو یادی خوائەکەن کە دڵیان نوورانی بووە، ئەو کاتە ئەزانێ کە دڵی ئەو ئینسانە زاکیرانە وەکووو هەوری بەهاری خاوەن باران وایە، وەبارانی زیکری لێ ئەبارێت، وە ئەو لەفزەی جەلالە کە وشەی «اللّٰە»یە وە لەسەر زمانیانا جاری ئەبێت، وەکوو دانە دانەی بارانی ڕەحمەتە، ئەو ڕەحمەتەی کە لەسەردا دێتەخوار لەو خاوەن زیکرانەوە، وە بەسەر زمانیانا جاری ئەبێت، وە ئەزانی کە دڵەکان وەکووو هەوری ڕەحمەتی بەهاریان لێ هاتووە.

وە ئاسەواری ئەو ڕەحمەتە وەکووو پرشنگی خۆرەتاو وایە بۆ سەرزەوی کە چۆن بووژانەوەی شتەکان بەهۆی ئەو نوور و تیشکە ئەبێت، ئەمیشە ئاوایە، وە وێژەری ئەو لەفزەیە ئەبێتە خاوەن ئەجر، وەکووو بە بیرکردنەوە بە دڵ ئەبێتە خاوەنی ئەجرو پاداش چون ئەوەی لە سەر زمانە کردەوەی زمانییە، وە ئەوەی لە دڵدایە قەسدو نییەتە یا دامەزرانی دڵە کە پەیدابووە وە ئەو دامەزرانە بە حوزور و موراقەبەی دڵ بۆ زاتی حەق تەعالا ئەبێت، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ»[١] کەمانای ئەم فەرموودەیە، کە جیاکەرەوەی دروستە لە نادروست بەم جۆرەیە، واتە: بوونی کرداری شەرعی و دامەزرانی بەگوێرەی نییەتو قەسدی خاوەنەکەیەتی، یا پلەی سەواب و

---

١. سحیح بخاری: (٣/١). هەروەها «ابی‌داود و ترمذی و نسائی و ابن ماجە»ش ریوایەتیان کردووە.

پاداشی کردارەکانی ئینسان بەگوێرەی قەسد ونییەتەکەیەتی، یا دەرکەوتنی کـردەوەکانی بـەگوێرەی نـییەتی خـاوەنەکەی دەرئـەکەوێ وە لەسـەر ئـەم ئـەساسەیە مـادام بـوونی زیـکری زمـانی و دەرکـەوتنی بـەهۆی قـەسد و نییەتە، وە قـەسدو نـییەتیش فـەقەت بۆخوایـە، کـەواتـە لە کردنی قـەسدو نییەتا و لە وتنی زیکری لەفزو تەلەففوز کردن بەو زیکرە جەزاو پاداشی زۆرو فراوان هەیـە، بەهەرحاڵ تەلەففوز کردن بەناوی پیرۆزی «اللّٰه» بە تاك یا بەتێکەڵ خێرو ڕەحمەتە، وەنیشانەی خۆش‌ویستنی خوایە لەلایەن ئەوکەسەوە کە زیکرەکە ئەکات، وە ئەمەیش لەژێر دائیرەی گشتی ئەوەدا قـەرار ئـەگرێ کـەئەڵێ: هـەرکەسێ شـتێکی خـۆش بـوێت بـەزۆری نـاوی ئـەبات، وە لە خـوا داوامـان ئـەوەیە لە ڕەدیـفی زاکـیرینا بـمانژمێرێت و حیسابمان بکات «آمین یاربِّ العالمین»

پاشان بابزانین زیکری خوای گەورە هۆی دامەزران و دامرکانی دڵانە، وە هـەروا هـۆی هـاتنە خـوارەوەی بـەرەکەت و ڕەحـمەتی خـوایـە، ئـەو خوایەی کە هەموو شتە غەیبییەکان و نهێنییەکان لەلای ڕون و ئاشکرایە، وە بەهۆی ئەم زیکرەوە خاوەن زیکر توانایی پەیدا ئەکات کە موبارەز و بـەربەرکانێ لەگـەڵ هـەواو ئـارەزواتـی نـەفسیدا بـکات، وە جیهاد لەگـەڵ نـەفسی ئـەممارەدا بـکات ئـەو کـاتە ئـەگات بـەخۆشبەختی و سـەعادەتی هــەمیشەیی، خــوای گــەورە لە ســوورەتی نــازعات لەئـایەتی ژمـارە چل‌ویەکدا فەرموویەتی:

﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَ نَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوىٰ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوىٰ﴾ واتە: کەسێ بترسێ لە عەزەمەت و گەورەیی خوا، وە یا بترسێ لەو کاتەیە کە لەبەر دەستی خوای گەورەدا قەرار ئەگرێت لەکاتی حیساب و کیتابدا، وە نەفسی خۆی پارێزی لە تاوان، وە لەو شتانەی کە خوا مەنعی کردوون وە نەفسی خۆی بگرێ لە ئارەزواتێ کە ڕای‌ئەکێشن بۆ تیابردن و نابوودی، ئەوە ئەو کەسە مەنزڵ و جێگای بەهەشتە.

وە ئەم جیهاد و بەربەرەکانێ لەگەڵ هەوای نەفسەدا جیهادی گەورەیە و واجبەو پێویستە لەسەر هەموو خاوەن عەقڵ و ئاوەزێك لە ئینسانەکان.

خەتیبی بەغدادی لە کتێبی خۆیدا ڕیوایەتی کردووە هەروەکووو لە «جامع الصّغیر»یشدا هاتووە، کە نوێنەری خوا حەزرەتی موحەممەد ﷺ پێشوازی کرد لە کۆمەڵێك لە جیهادگەران، کاتێ کە لە جیهاد گەڕانەوە، فەرمووی:

«قَدِمْتُمْ خَيْرَ مَقْدَمٍ مِنَ الْجِهادِ الْأَصْغَرِ إِلَى الْجِهادِ الْأَكْبَرِ مُجاهَدَةُ الْعَبْدِ هَواهُ»[1] واتە: هاتنەوە بەخێر بێنەوە لە جیهادی بچووك بۆ لای جیهادی گەورە، کە ئەم جیهادی گەورەیە بریتییە لە بەربەرکانێ کردنی بەندەی خوا لەگەڵ نەفس و هەوای نەفسدا، وە فەلسەفەی ئەمە کە ئەمە

---

١. جامع الکبیر للسیوطي جلد ١ باب حرف القاف. هەروەها خەتیب بەغدادیش لە جابیرەوە ریوایەتی کردووە.

جیهادی گەورەیە، ئەوەتە جیهاد لەگەڵ کافراندا و بەرگری لەگەڵ موعارزینی ئیسلامدا بۆ ئامادە بوونە بۆ فەرمانبەرداری خالیس بۆ خوای گەورە، وە ئەم تاعەتە خالیسە دەس ناکەوێ مەگەر لە ئینسانێکی وادا کە لە هەوای نەفس دووربێت، کەوابوو جیهاد لەگەڵ کافراندا موقەددیمە و هۆیەکە بەڵام جیهاد لەگەڵ نەفس و هەوادا بۆ غایەت و دەسکەوتی ئینسانە، هەر بۆیە پێویست کراوە و سابت بووە جیهاد لەگەڵ هەوای نەفسدا فەرزی عەینە و واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێ چ ژنان و چ پیاوان، بەڵام جیهاد لەگەڵ کافراندا بڕێ‌جار واجبە و بڕێ‌جاریش واجب نییە.

پاشان بابزانین زیکر و یادی خوای گەورە هەروەکووو بەتەکی و ئینفیرادی فەرمانی پێدراوە کە ئینسانەکان بەجێی بێنن هەروا بەسوورەتی کۆمەڵ و دەستەجەمعیش فەرمانی پێدراوە. ئیمام نەوەوی رحمه الله کە شەخسێیەتێکی ئاگا و شەرع زانە، وە ڕیوایەتی حەدیسی ڕەسولی خوائەکات ئەفەرمێ:

«**اِعْلَمْ أَنَّهُ كَمَا يُسْتَحَبُّ الذِّكْرُ يُسْتَحَبُّ الْجُلُوسُ فِي حَلَقِ أَهْلِهِ**» واتە: تۆ بزانەو ئاگاداربە ئەی خاوەن بڕوا، چۆن زیکرکردن خۆی سوننەتە هەروا بەو شێوە لەدائیرەی حەڵقەی ئەهلی زیکردا دا نیشتن سوننەتە، وە بەڵگەو دەلیلەکان لەسەر ئەم بابەتە ئاشکراو ڕوون و زۆرن، وە تەنها بەڵگە بۆ ئەم مەتڵەبە حەدیسی ئیبنو عومەر رضي الله عنهما بەسە و کافییە کە فەرموویەتی:

**«قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ إِذٰا مَرَرْتُمْ بِرِيٰاضِ الْجَنَّةِ فَارْتَعُوا، قَالُوا: وَ مٰا رِيٰاضُ الْجَنَّةِ يٰارَسُولَ اللّٰهِ؟ قٰالَ حَلَقُ الذِّكْرِ فَإِنَّ لِلّٰهِ تَعٰالىٰ سَيّٰارٰاتٌ مِنَ الْمَلٰائِكَةِ يَطْلُبُونَ حَلَقَ الذِّكْرِ فَإِذٰا أَتَوا عَلَيْهِمْ حَفُّوٰا بِهِمْ»**[1] واتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر زەمانێ ئێوە ڕۆیشتن بەلای باغی بەهەشتا ئیستیفادەی لێ بکەن وە لێی‌بخۆن، عەرزی نوێنەری خوایان کرد باغی بەهەشت کامەیە ئەی نوێنەری خوا؟ لەولاّمدا فەرمووی: حەڵقەکان و دائیرەکانی زیکرکردنە، وە خوای گەورە چەن فریشتەیەکی هەیە کە سەییار و گەردشگەرن و ئەگەڕێن لەدوای ئەو کەسانەی کە لە کۆڕ و کۆمەڵی زیکری خوادا کۆبوونەتەوە، جاکاتێ ئەو فریشتانە ئەو کۆمەڵیانە پەیداکردن بە باڵی ڕەحمەتی خۆیان دایان ئەپۆشن و دەوریان ئەگرن تا لەو زیکرەئەبنەوە.

وەهەروا ڕیوایەت کراوە لە سەحیحی موسلیم دا کە حەزرەتی مەعاوییە رضي الله عنه فەرموویەتی:

**«خَرَجَ عَلَيْنٰا رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ عَلىٰ حَلْقَةٍ مِنْ أَصحٰابِهِ، فَقٰالَ: مٰا أَجْلَسَكُمْ؟ قٰالُوا أَجْلَسَنٰا نَذكرُ اللّٰهَ تَعٰالىٰ وَنَحْمَدُهُ عَلىٰ مٰا هَدٰانٰا لِلْإِسْلٰامِ وَ مَنَّ عَلَيْنٰا. قٰالَ: آللّٰهِ مٰا أَجْلَسَكُمْ إِلّا ذٰاكَ. أَمّٰا أَنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَ لٰكِنَّهُ أَتٰانِي جِبْرِيلُ فَأَخْبَرَنِي أَنَّ اللّٰهَ يُبٰاهِي بِهِمُ الْمَلٰائِكَةَ»**

---

١. موسنەدی ئەبی یەعلای موسڵی: (٤٥٢/٧).

واتە: نوێنەری خوا ﷺ چوو بەسەر کۆڕێ لەیارەکانیا کە دانیشتبوون لە حەڵقەی زیکری خوادا ئێمەیش لە ناو ئەو کۆڕەدا بووین پاشان فەرمووی: چ شتێك بووەتە هۆی ئەوە کە ئێوەی لێرەدا کۆکردووەتەوە و دانیشتوون؟ لە وڵامدا فەرموویان: دانیشتووین زیکری خوا ئەکەین و ستایشی ئەکەین لەسەر ئەوەی کە شارەزای کردووین و ڕێنموونی کردووین بۆ سەر دینی ئیسلام و بە ڕەحمەتی خۆی مینەتی ناوتە سەرشانمان. نوێنەری خوا تەئیدی کردن فەرمووی: سوێند بەخوا ئێوەی دانەنیشاندووە ئیللا بۆ زیکر کردن نەبێت واتە: شتێکیتر نەبووەتە هۆی دانیشتنی ئێوە ئەو زیکرە نەبێت، وریابن من داخوازی سوێنتان لێناکەم بۆ ئەم کارە تا ئێوە تووشی گومان و دوودڵی نەبن، بەڵام فریشتەی نگا هاتووەتەلام و خەبەری پێداوم خوای گەورە بەیانی عەزەمەت و گەورەیی خۆی ئەکات بەو بەندانەی بەسەر فریشتەکاندا.

وە هەروا لە سەحیحی موسلیمدا دوبارە ڕیوایەت کراوە لە ئەبیسەعیدی خدریەوە ئەویش لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ کە ئەم دوو شەخسە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ حازر بوون، نوێنەری خوا فەرموویەتی:

**«لايَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرونَ اللّٰهَ تَعالىٰ إلّاغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَ ذَكَرَهُمُ اللّٰهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ»** واتە: کۆنابنەوە گەلێك کە زیکر و یادی خوای گەورە بکەن ئیللا فریشتەکانی خوا بۆ ئیحتیرامی ئەو

ئینسانانە دەوریان ئەگرن، و بەرەکەت و ڕەحمەتی خوا و فەزڵی پەروەردگار ئاسەواری لەواندا دەرئەکەوێ، وئارامشی ڕۆحی ئەبارەێتە سەر دڵیان و نەفسیان دامەزراو ئەبێت، وە خوای گەورە لە ڕەدیفی پیاوەگەورەکاندا حیسابیان بۆ ئەکات.

وە هەروا حەسەنی کوڕی سەفیان لە سەهلەوە ڕیوایەتی کردووە، کە نوێنەری خوا فەرموویەتی: «**مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ عَلىٰ ذكْرٍ فَتَفَرَّقُوا إلّا قيلَ لَهُمْ قُومُوا مَغْفُوراً لَكُمْ**»[1] واتە: هیچ گەلێك و قەومێك دانانیشن و کۆ نابنەوە بۆ زیکری خوا، پاشان لەو زیکرە ببنەوە و بڵاوەی لێبکەن ئیللا لەلایەن مەئموئرەکانی خوای گەورەوە پێیان ئەوترێ هەستنەوە ئێوە چاوپۆشی کراوە لە تاوانەکانتان، وەخوای گەورە لە ئێوەخۆش بووە.

وە هەروا ئیمام ئەحمەدﷺ لە مەسنەدەکەی خۆیدا، و زیاء لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

«**مٰا جَلَسَ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللّٰهَ تَعٰالىٰ إلّا نٰاداهُمْ مُنٰادٍ مِنَ السَّمٰاءِ قُومُوا مَغْفُوراً لَكُمْ**» واتە: هیچ قەومێك و گەلێك دانانیشن بۆ زیکر و یادی خوا و مەشغوڵی زیکری خوابن ئیللا لەلایەنی مەئموورەکانی خواوە لە ئاسمانەوە بانگەوازیان لێ ئەکرێ هەستن ئێوە لەلایەنی خوای گەورەوە چاوپۆشی کراوە لە تاوانەکانتان و لێتان خۆش بووە.

---

١. موسنەدی ئیمام ئەحمەد و جامع الصغیر.

وەهەروا تەبەرانی و زیاء لە سەهلی کوڕی حەنزەلە بە ئیسنادێکی شیرین و جوان ریوایەتیان کردووە، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:

**«ماجَلَسَ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللّٰهَ تَعَالىٰ فَيَقُومُونَ حَتَّى يُقَالُ لَهُمْ قُومُوا فَقَدْ غُفِرَتْ لَكُمْ ذُنُوبُكُمْ وَ بُدِّلَتْ سَيِّاتِكُمْ حَسَنَاتٍ»**[1] واتە: دانەنیشتوون گەلێك کەوا زیکری خوا بکەن پاشان هەستنەوە تا لەلایەنی مأموورەکانی خوای گەورەوە پێیان ئەوترێ هەستن بەحەقیقەت چاوپۆشی کراوە لە تاوانەکانی ئێوە و تاوان و هەڵەکانتان ئاڵوگۆڕ کراون بەچاکە بۆتان.

وە هەروا ئیمام بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە ئەفەرمێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**«لأنْ أَذْكُرَ اللّٰهَ تَعَالىٰ مَعَ قَوْمٍ بَعْدَ صَلاٰةِ الْفَجْرِ إِلىٰ طُلُوعِ الشَّمْسِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا وَمَافِيهَا، وَ لأنْ أَذْكُرَ مَعَ قَوْمٍ بَعْدَ صَلاٰةِ الْعَصْرِ إِلىٰ أَن تَغِيبَ الشَّمْسُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا وَمَافِيهَا»** واتە: ئەگەر مـن لەگەڵ قەومێکدا زیکری خوای گەورە بکەم لە دوای نوێژی بەیانی تا وەختێ کە خۆرهەڵدێت، خۆشترە بەلامەوە لە دونیا و ئەوەی لە دونیادا هەیە، وە هەروا ئەگەر لەگەڵ قەومێکدا زیکری خوای گەورە بکەم لە دوای نوێژی عەسر تا خۆرئاوا ئەبێت دوبارە بەلامەوە باشترە لە دونیاو ئەوەی وا لەدونیادا.

---

١. المعجم الكبير للطبراني : (١٠/۶).

ئـەم فـەرموودەیە ئیمام بـەیهەقی لە ئـەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە کە ئیسنادەکـەیش جوانە، وە ئەم ڕیوایەتە لە «جامع الصغیر»ی شێخی سیوتیا هاتووە.

وە هەروا لە حەدیسی قودسیدا وارد بووە پێغەمبەری خوا ﷺ لەزاتی باری تەعالاوە ڕیوایەت ئەکات و ئەفەرمێ: خوای گەورەفەرموویەتی:

**«مَاذَكَرَنِي عَبْدِي فِي مَلأٍ إِلّا ذَكَرْتُهُ فِي مَلأٍ خَيْرٌ مِنْ مَلَئِهِ»**[١] واتـە: لە نـاو هیچ جەمع و کۆمەڵێکدا نییە بەندەی من یادی من بکات ئیللا من یادی ئـەو بـەندەئەکەم و پاداشـی گـەورە بـۆ ئـەو دیـاری ئـەکەم لە نـاو کـۆڕو کۆمەڵێکدا چاکتر لەو کۆڕو کۆمەڵەی کە یادی منی تیاکردووە.

وە لەم بوارەدا، فەرموودەی خوای گەورە لە سوورەتی کەهف ئایەتی ژمـارە بـیست و هـەشتدا بـەسە و کـافییە کـە ڕوو لە خـۆشەویستەکەی ئەکات و ئەفەرمێ:

**﴿وَلا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطاً﴾** واتـــە: ئـەی مـوحەممەد ﷺ تـۆ فـەرمانبەرداری مـەکە بـۆ کـەسێك کـە دڵی ئـەومان بێئاگا کـردووە لە زیـکرو یـادی خـۆمان وە شـوێن قـسەی ئـەوە مەکەوە، کە شـوێن ئارەزواتی هـەوای نـەفسی کـەوتووە کە لە حاڵێکیشدا کاری ئەو زایعەو تیاچووە.

---

١. موسنەدی ئیمام ئەحمەد: (٤٠٧/٢) .

وەهەروا بەسە کە زیکری خوا، سەمەری دڵی ئینسانە، وە بەهۆی ئەو زیکرە دڵان ئارام ئەگرن و نوور و ڕەحمەتی خوا تیایا جێگیر ئەبێت و ئارامی و بێوەیی لەلایەنی خواوە ئەڕژێتە ناوی، وە ئەو خاوەن دڵە بەهۆی ئەو زیکرەوە خۆشەویستی خوای گەورەی دەس ئەکەوێ، وە ئینسانی خاوەن بڕوا بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە سەری تەسلیمی کز ئەکات، وە ئەو شتانەی کە لەلایەنی خوای گەورەوە لێ مەنع کراون تەرکیان ئەکات، وە ئەم شێوەیشە بەم جۆرە ڕاو ڕەسمی کەسانێکە کە خوایان خۆش ئەوێت.

با ئەوەیشە بزانین و بزانرێ لە کاتێکدا هەدەف لە زیکرکردن نزیك بوونەوەیە لە خوای گەورە و کەسبی ڕەزامەندی خوایە، پێویستە چەن خاڵێك دیاری بکرێن بۆ ئەوانەی کە ئەهلی زیکرن:

**یەکەم خاڵ**، ئەو کەسانەی کە زیکر ئەکەن ئەشێ پاك بن واتە بە دەسنوێـژۆبن و خاوێن بن لە پیسییەك کە لەبەدن و لیباسیاندا هەیە.

**دووهەم خاڵ**، ئەوەیە ئەو جێگایە کە زیکری تیائەکەن خاوێن و پاك بێت.

**سێهەم خاڵ**، ئەوەیە کاتێ کە ئەو لەفزانە لە سەر زمانیاندا جاری ئەبێت ئەبێ واژەکانی ئەو زیکرە بەڕەوانی و سەحێحی تەلەفوزیان پێ بکرێ، وە لە جەنبەی قەواعیدی ئیعراب و بیناوە جامێع بێت، وە هەروا قەواعیدەکانی تەجویدی تیا مولاحەزە بکرێت لە قەسرو لە مەددو لە

شەددەو و تەخفیف وە غەیری ئەمانەش وەك ڕوو کردن لە قیبلە، وەك ئارام بوون و لەسەرخۆ، و خاڵی لەشتی لەغوو بێ‌هودە، وەك تێکەڵی لە ژن و پیاوی بێگانەو نامەحرەم بەیەك.

**خاڵی چوارەم**، ئەوەتانێ بەو زیکرە موازحیمی کەس نەبێت، وەك ئینسانی خەوتوو یا نەخۆش یاکەسێ کە لە پێش ئەودا دەس بەکاری خوێندنی قورئان و تەعلیم و تەدریس بوبێت، یا مەشغووڵی عیبادەتێك، وەك وەعزو نەسیحەت و ئیرشادی موسوڵمانان بوبێت، چون هەر عیبادەتێك کاتێك ئەبێتە هۆ و وەسیلە بۆ بەختەوەری ئینسان، کە بەرابەر بێت بۆ ئەساسی شەریعەتی بەرزی خوای گەورە، وە لەسەر ئەم پێداویستانە بەڵگەو دەلیلی قاتیع لە کتێبە تایبەتییەکاندا زیکر کراوە، وە ڕەهنوما و ڕێگە پیشاندەریش بەس خوایە بۆ بەندەکانی خۆی.

# خۆشویستنی حەزرەتی ڕەسوول

هیچ گومان و دوودڵی نییە لەوەدا کە ئینسانە تەکلیف لێکراوەکان بە هۆی تەبلیغ و فەرمانی ئەو نوێنەرەوە ڕوو لە زاتی خوا ئەکەن، وە تەنها ئەو نوێنەرە ڕێگە پیشاندەرە بۆ ئینسانەکان لە ڕێگەی ڕاست و بێ‌خەوشدا، کەواتە باوەڕهێنان بەو نوێنەرە ﷺ لەپێش هەموو شتێکدا پلەی یەکەمە بۆ ڕۆیشتن بۆلای زاتی خوای پەروەردگار، وە باوەڕیش جێگیر نابێت و جێ خۆی ناگرێ مەگەر بە جەزم نانی زانستی و عەمەلی، واتە بە گەردن کەچ کردنی نەفسی ئینسانی بۆ فەرمانبەرداری نوێنەری خوا لەو شتانەیدا کە فەرمانی داوە ئەنجام بدرێن، وە لە خۆگرتن لەو شتانەی کە مەنعی کردون، وە ئەم مل کزکردنی نەفسە بۆ فەرمانبەرداری ئەو نوێنەرە ئەبێتە هۆی مەحەببەتی ئەو و گەورەیی ڕێزو ئیحتیرام و کۆمەك و یاوەری دینە کەی و بڵاوبوونەوەی لە نێوان خەڵکدا و کۆمەك و هاوکاری لەگەڵ باقی موسوڵمانانندا لە ڕێگەی دیندا و نزیك

بوونەوە بۆ لای خوای عالەمیان، وە پێشەکی و پلەی ئەووەڵی نزیك بوونەوە بۆ لای خوا، خۆش‌ویستنی حەزرەتی موحەممەدە ﷺ وە ئەو مەحەببەت وخۆش‌ویستنە ئەبێتە هۆی تەشویق و عیشق بۆ چاو پێکەوتن و زیاتر خۆش‌ویستنی و ڕەفیقی ئەو خۆشەویستە و هۆی عەلاقە پەیداکردن بەو لە حاڵی حەیاتا و ڕەبت و عەلاقەی ڕۆحی بە زیکرو یادی ئەو لە دوای وەفاتی ئەو نوێنەرە، وە تێکۆشان و تەلاش لە بە دەس‌هێنانی ئەوەی کە ئارەزوو و ویستی ئەوی لەسەرە و تەرك کردنی ئەو شتەی کە پێی‌ناخۆشە و دووری لێ ئەگری وە لەسەر ئەم ئەساسەیە خوای گەورە و پاك لە هەرچی نەقسە، لە سوورەتی ئەعرافدا لە ئایەتی ژمارە سەدو حەفتاو پێنجدا فەرموویەتی:

﴿اَلّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الّذي يَجِدُونَـهُ مَكْتُوباً فِي التَّوْراةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَ يَحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّباتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الخَبائِثَ وَيضَعُ عَنْهُم إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلالَ الَّتِي كانَتْ عَلَيْهِمْ فَالّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا نُورَ الّذي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ واتە: ئەو ئیماندارانەی کە ڕەحمەتی خوا شامیلیان ئەبێت کەسانێکن شوێن‌کەوتووی موحەممەدن ﷺ ئەو نوێنەرەی کە نژادی عەرەبێکی نەخوێندەوار، کەسەوادی نووسین و خوێندنەوەی نەبووە، ئەو نوێنەرەی کە لە تەورات و ئینجیلا وەسفەکانی ئەویان دەس ئەکەوێ کە خوا تەعریفی گەورەیی ئەوی کردووە، وە زاناکانی ئەوان ئەو وەسفانەیان

زانیوە و دیویانە، وەسیفەتی ئەو نوێنەرە وایە فەرمان ئەدا بە چاکە و مەنعیان ئەکات لە خراپە، وە ئەوشتانەی کە پاك و بێزیانن بۆیان حەلاڵ ئەکات و ئەو شتانەی کە پیس و ناپەسەندن لێیان مەنع ئەکات، و حەرامیان ئەکات لەسەریان، وە ئەو شتە سەختانەی کە گران بوون لەسەرشانیان لایان ئەبات و لای بردوون و ئەو شتانەی کە وەکووو زنجیر وابوون لە گەردنیانا، وکوو کوشتنی نەفس لەجێ تەوبەکردنیان، یا وەك برینی لیباس لە کاتێدا کە پیس بوایەت، یا وەکووو کوشتنەوەی نەفس لەبەرابەر هەر نەوعە کوشتنێکەوە هەر هەمووەکەی لابردوون، وە ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە حەزرەتی موحەممەد ﷺ کردووە و بە گەورەیان زانیوە و ڕێزیان بۆ دیاری کردووە و پشتگیری دینەکەیان کردووە و پەیڕەوی لەو قورئانەی ئەکەن کە وەکووو نوور وایە ئەو نوورەی کە نازڵ کراوەتە لای حەزرەتی موحەممەد ﷺ ئەوانە ڕەستگارن و خۆشبەختی هەمیشەییان دەس ئە کەوێ.

وە لە ڕاستیا بە گەورەدانانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە لەگەڵ ئەوەدا سەری تەسلیمی بۆ دانەوێنی و فەرمانەکانی بەجێ بێنی، وە یارمەتیدانی دینەکەی ئەوەیە بە گوێرەی تواناو دەسەڵات بە ماڵ و بە گیان و بە ئەولاد جانفدایی بکەی بە هەرچێ کە لە ژێر سەیتەرەی تۆدایە، وە بەڕۆح قوربانی بکەی لەڕێگەی گەیشتن بۆ ڕەزایەتێك کە ئینسان ئەگەیەنێ بەڕەزایەتی خوای گەورە، وە ئەم حاڵەتیشە پێك نایەت مەگەر

بە مەحەببەتێکی یەگجار تەواو پاك نەبێت.

وە لە پێداویستی ئەو مەحەببەتەیە، پەیڕەوی کردن لەو دینەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی و هەم بەتەتبیق کردنی یاسا و سوننەتەکانی، وە هەروا بە عەمەڵ کردنی ڕەوشت و ئەخلاقی بەرزی بە گوێرەی توانا، وە بەخۆ فێرکردن و خۆڕازاندنەوە بە ئەخلاقی بەرزی ئەو پێغەمبەرە ﷺ ئەبێت چ بەئاشکرا و چ بەنهێنی، بەجۆرێکی وا خۆشبەختی خۆی لە غەیری ئەوەدا نەبینێ، وە هەروا خۆش‌ویستن دروست نەبێت و پێك‌دێت بە سەڵەوات دانی زۆر لە سەر پێغەمبەرو ئال و یارانی رضي الله عنهم وە شوێن‌کەوتنی بە جوانترین شوێن‌کەوتن، وە بە بڵاوکردنەوەی وەسفە بەرزەکانی‌و موعجیزەکانی، وە بە زیندووکردنەوەی یادو جێژنی لەدایك بوونی و میعراج و سیرە و غەزەواتەکانی و بە بەیان‌کردنی تەواوی بەسەرهاتەکانی و باسی ئەوەی ڕەبت و عەلاقەی هەیە بەنوێنەرایەتی ئەو زاتە بەرزەوە، لە بانگ کردن ئینسانەکان بۆ سەر ڕێگەی سەعادەت.

وە هەروەها باسی خۆگرتن و کۆچ کردنی لە مەککەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە و جیهاد و تێکۆشانی و ڕاهنمایەکانی، وە بە بەیانکردنی فەرموودەکانی ئەوپێغەمبەرە ﷺ ئەوانەی کە خوای گەورە پێی ڕاگەیاندووە بەهۆی زانستی غەیبی و بەهۆی نگاوە یا بەهۆی ئیلهام، واتەهاویشتنی ئەو شتانە بۆ دڵی پێغەمبەر ﷺ بەبێ دوودڵی و گومان،

وە بە بەیانکردنی وشە بەنرخ و گشتییەکانی لەگەڵ خۆ ڕاگری و وەستان لەسەر ئەم ڕێبازە دامەزراوە ڕوونە تا کاتی کۆچی دوایی کردن.

وە لە پێشدا زانراوە و جێگیربووە کە بڕواو ئیمان جێگیر نابێت بەبێ ئەو خۆشویستنە، باوجوودی ئەوەیش کە ئینسان ئاگاداری ببێت بەگەورەیی ئەوخۆشەویستە خوای گەورە بۆ ئیسباتی ئەم مەتڵەبە کەناسین بەبێ خۆشویستن سوود و کەڵکی نییە و لەحەققی ئینسانە پێگەیشتووەکاندا لە سوورەتی بەقەرە ئایەتی ژمارە سەدو چلوچواردا فەرموویەتی:

﴿ٱلَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَائَهُمْ وَإِنَّ فَرِيقًا مِنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئەو کۆمەڵەی لە فەلەکان و جووەکان، کە کتێبی ئاسمانییان بۆ نێررابوو و پێیان درابوو، حەزرەت موحەممەدیان ئەناسی بەناسینێکی وا، کەگومانی تیدا نەبوو، وەکووو چۆن هەریەکە لەوانە بە یەقینی منداڵەکەی خۆی ئەناسی، وە کۆمەڵێك لەوانە کە بریتی بوون لە سەرۆکەکانیان و زاناکانیان ئەوەی کە حەقیقەت بوو، ئەیانشاردەوە و ئاشکرایان نەئەکرد. وە وەسفەگرنگەکانی حەزرەتی موحەممەدیان ﷺ ئەشاردەوە لە عامەی خەڵك لەگەڵ ئەوەشدا بە چاکترین وەسف تەعریف کراوە و ناسراوە بەلای ئەوانەوە.

وە هەروا خوای گەورە لە سوورەتی نەمل لە ئایەتی ژمارە چواردەدا، فەرموویەتی:

﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْماً وَعُلُوّاً فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾ واتـه: لە کاتێکدا کە گەلی حەزرەتی مووساعليه السلام ئینکاری موعجیزەی حەزرەتی مووسایان کرد و ئەیشیان زانی کە ئەمە شتێکی حەققە و لەلایەن زاتی خواوەیە و سیحرو تەڕدەسی نییە بە ئینکارییەکەیان ستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد و پشتیان لەحەق هەڵکرد، وە چ ستەمێك لەوە گەورەترە کە ئینسان بزانێ و باوەڕی وابێت کە ئەوانەی لەسەر دەسی حەزرەتی مووسادا سادربوون و لەلایەنی خواوە هێناویەتی نیشانەکانی خوان وحەقن، بەڵام پاشان ئینکاریان بکات و بڵێ ئەمانە سیحرن، جا ئەی خاوەن بڕوا، بڕوانە و تێبینی بکە و ئەی خاوەن گوێ بە دڵ تێفکرەو بزانە چییە و چی ئەبێت؟ عاقیبەت و ئاخری کاری ئەوانەی کە ئەهلی فەسادن کە بریتییە لە سزای فراوان و عەزابی سەخت لە دونیا و ئاخیرەت دا. ئیبنو کەسیر ئەفەرمێ: لە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزەوە وەرئەگیرێ کە مانای ئەم ئایەتە بەشێوەی «فحوی الخطاب» ئاوایە: ئەی ئەو کەسانەی کەحەزرەت موحەممەد ﷺ بەدرۆ ئەخەنەوە و مونکیرن بەوەی کە حەزرەت موحەممەد هێناویەتی خۆتان پارێزن لەوەی، کە پێتان بگات ئەو بەڵاو چارەڕەشییەی کە گەیشت بە گەلی حەزرەتی مووسا، بەڵکوو چاکتر و باشتر بە ئێوە ئەگات، چون حەزرەت موحەممەد ﷺ گەورەترە و بەڕێزترە لای خوا لەحەزرەت مووسا، وە بەڵگەکانی چاکترو مەحکەمترن لەبەڵگەکان و دەلیلەکانی

حەزرەتی مووسا عليه السلام.

خـوای تـەعالا لەم ئـایەتە پـێشووەدا کـەتمان و شـاردنەوەی حـەققی کـردووە بـە مـەنشەء و ڕیـشەی فـەسادو بـێ بـەندوباری، وە ئـەمـە بەڵگەیەکی قـەتعی و ڕاستە لەسەر ئەوەی کە ئیمان و باوەڕ پێکنایەت و دروست نابێت بەبێ ئارەزوو و مەحەببەت بۆ حەزرەتی موحەممەد ﷺ.

وە ڕوونە و ئاشکرایە پلەی باوەڕو ئیمان زیادو کەم ئەکات بەگوێرەی پلەکانی ئەو مەحەببەتە، واتە دەرەجەی مەحەببەت و خۆش‌ویستن چەن دەرەجـە بێت پـلەی بـاوەڕیش بـەو گـوێرەیە ئەبێت، وەبـەڵگەیش بۆئەم قـسەیە فـەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ وە ئـەم فـەرموودە بەسە بۆ ئیسپاتی ئەم دەعوایە، ئەفەرمێ:

«وَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّىٰ أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ نَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَوَالِدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ» (رواهُ أحمدُ في مَسنَدِهِ وَالسَّنَدُ صَحيحٌ) واتـە: قەسەم بەو کەسەی کە نەفسی من وا لەدەستی قودرەتی ئەودا، هیچ یەك لە ئێوە باوەڕ و ئیمانی تەواو نابێت تا وای لێ نەیێت منی خۆشتر بوێت و بـەلایەوە خـۆشەویستربم لە نـەفسی خـۆی و لە ئـەولادی و لە بـاوك و دایکی و لە هەموو خەڵکی بەتێکڕا.

وە بـەڵگـەیش لەسـەر خـۆش‌ویستنی پـێغەمبەر ﷺ لەدڵدا، شـوێن کـەوتـنی یـاساو ڕەوشـتی بـەرزی پـێغەمبەرە ﷺ وە خـۆڕا گـری و پایەدارییە لە سـەر عـەمەڵ کردن بە شـەریعەتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ وە

ناوبردنیەتی بە زۆری، وە تێکۆشان و تەلاشە لە پشتیوانی کردنی دینەکەی خوا لە نێوان خەڵکدا، وە بڵاوکردنەوەیەتی لە نێوان ئینسانەکاندا ئەمما بە گەورە زانین و گەورە گرتنی قەدرو مەنزیلەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوەیە خوای گەورە ئیمان و باوەڕێ کە هۆی رزگاری ئینسان بێت، خۆلاسەی کردووەتەوە لە شوێن‌کەوتن و تەبەعییەت کردن لە نوێنەری خوادا ﷺ و بەجێ هێنانی فەرمانەکانی و تەسلیم بوونە بە دڵ و گیان بۆ بەرنامەو یاساکەی، وە پشتیوانی و کۆمەك کردنیەتی بە رووونی، جا لەبەر ئەوە لە بەشێك لە ئایەتێکدا خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ﴾ واتە: بەگەورەی بزانن و پشتیوانی دینەکەی بکەن، لەم بەشەی ئایەتەدا وشەی تەعزیرشموول ئەکات بۆ بەگەورە دانانی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە دیققەت کردن و مولاحەزە کردنی فەرمانەکانی، وە هەروا شموول ئەکات بۆ گەورە دانان و رێزگرتن لە مەقامی بەرزی ئەو پێغەمبەرە ﷺ وەستایش و بە گەورە دانانی ئەو حەزرەتە، کەواتە هەرکەسێ باوەڕ بهێنێ بە حەزرەتی موحەممەد ﷺ وە خۆشی بوێت وەپەیڕەوی بکات لە دینەکەی و رێزدانێ بۆ ئایین و یاساکەی و پشتیوانی دینەکەی بکات بەوە کە یاساو سوننەتەکەی زیندوو بکاتەوە لە نێوان خەڵکدا و هەمیشە زیکرو یادی ئەو دوپات بکاتەوە و یادی گەورەبوونی و لە دایك بوونی و دەرەجەو پلەوپایەی باس بکات وە

ئـەمانەتداری بـاس بـکات و بـاسی خـەبەردان بـە نـاردن و چـلۆنیەتی بـانگەشەی ئـەو نـوێنەرە بـکات و دڵی هـەموو چـینە جـۆربەجۆرەکان ڕابکێشێ بۆ خوێندنەوەی چەن دێڕێك لە ژیان و بەسەرهاتی گەورەیی ئـەو پـێغەمبەرە ﷺ بـەتایبەت یـادو و بیرهێنانەوەی بـەرزبوونەوەی بـۆ ژوورەوەی ئاسمانەکان، لە ڕۆژانی پێویست و لازمدا، وە باسی شەوڕەوی پـێکردنی لە بـەشێك لە شـەودا لە مـەککەی مـوکەڕرەمەوە بـۆ مـزگەوتی قودس واتە: «بیت المُقدس»!

چـون بـەڕاستی ئـەم فـەرمانەگەورە کە «خارق العادة»ێکی نـوورانی و گـەورەو یـەگجار موهییم سابت ئـەکات و پیشان ئـەدات خـوای گـەورە فەزڵ و ڕەحمەتی یـەگجار گـەورەی هەیە نیسبەت بەم پێغەمبەرە ﷺ. وە لەلای خـوای گـەورە پـلەی زۆربـەرزە، وەخـوای گـەورە لوتـف و میهرەبانی هـەیە لەگەڵ ئەونوێنەردا بەجۆرێ تـەجەللای خۆی ئـەڕژێنێ بەسەریا بە جەزب و ڕاکێشانی مەعنەویەت و پاکی لە ساتێکی کەمدا، بـەوە کـە بـەرزی کـردەوە بـۆلای ژوورەوەی ئـاسمانەکان. وە لەوێـشەوە بۆلای ئەوجێ و مەقامە کە خوا ویستی لەسەربوو لە پلەی هەرەبەرز و لە مەقامی گەورە. ئەوە ئەو کەسە خاوەنی باوەڕێکی پاك و بەحەققە، وە ئەوانە وان لە ڕیزی چاکان و هەڵبژێرراوانی ئوممەتی موحەممەدا ﷺ وەچاکترین ئوممەتن.

ئەوانەی کە موسوڵمانان شانازیان پێوە ئـەکەن، وە ئـەو یاد و زیکرە

پیرۆزانە لە دڵی تازەپێگەیشتووەکاندا بەعیباراتی شیرین و پاك و نوورانی جێگیر ئەکەن، وە دامەزرانی تیا بە وجـود ئەهێنن و شوێنەواری خۆیان لەدڵی ئـیمانداران و مـوسوڵماناندا دیـاری ئـەکەن، بـەجۆرێکی وا کـە نـەسیحەت و ڕەهـنومایی و مەوعێزەیەك کە بۆ جوانـان و پیران ئـەکرێ ئـەو تەئسیرەی تیا پەیدا ناکات، چون هەر لە قەدیمەوە وتراوە فێربوونی زانـست لە گـەنجیا وەکـووو نـەقشی سـەر بـەرد وایـەپاك نـابێتەوە و هەرنەمێنێ، وە کەسێکیش ئەو زیکر و یادانە مەنع بکات ئەوە ئەو کەسە لەوانـەیە کـە ئـەهەمییەت و ئـەرزشی بـە بـارهێنان و ڕاهـێنانی ئـەولادی ئـیمانداران نـەداوە، بـەڵام ئـەوجێژن و حـەفلانە، و ئـەویادو زیـکرەیاتە پێویستە هـەریەکە لە جێی خۆیدا بەرابەربێ بۆ یاسای شـەرعی ئیسلام، واتـە بێشەرعی تـیا نـەبێت! وە بۆ ڕەعـایەت کـردنی ئەدەب و ئەخلاقی تـەواو پـەسەندی ئـیسلامی ئـەوانـەی کـە ڕەچـاو ئـەکرێن لەحـەفـلە ئـیسلامییەکانـدا لە نـاو مـوسوڵماناندا. وە هـەروا لە پـشتیوانـی کـردنی پێغەمبەری خوایە ﷺ. بەرزکردنەوەی زیکرو یادی ئەو و بڵاوەپێدانی فـەرمانەکانی ئـەو، ئـەوەش بـە بـەیانکردنی موعجیزاتـی ئـەو پێغەمبەرە ﷺ ئـەبێت بـۆخەڵکان، تـابزانـن کـەمەودا و قـۆناغی پـلەی بـەرزی لای خـوا چـەندێکە و بـاوەڕێشی پـێ بـکەن! مـوعجیزە خـۆی کـارێکی «خـارق العادە»یە، واتە: دوورە لە هێزو توانای ئینسانی عادی کە بە عادەت بتوانێ کـارێکی وا بـکات، وە هـەموو عـادەتەکان یـەکاڵا ئەکاتەوە، وە ئـەیاندڕێنێ

خوای گەورە ئەو موعجیزانە لەسەر دەستی نوێنەرە بەڕێزەکانی خۆی ئاشکرا ئەکات و پیشانی خەڵکی ئەدات، بەبێ عەلاقەو ڕەبت دان بە تەلاش و کۆشش، وە یا بەبێ فێربوون فەنێك لە فەننەکانی زانست لەلاین ئەو نوێنەرانەوە. بەڵکوو بە مەحزی لوتفی خوا و خەلقی خوایە!

وە بیشزانین، کە موعجیزاتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ زۆرن وە لە ناو پەرتۆکە ئیسلامییەکاندا کۆکراونەتەوە و لە هەموویان گەورەتر و ماندگارتر قورئانی پیرۆزە، کە لە دونیادا تا ڕۆژی قیامەت واتە: ڕۆژی پەسەڵان ئەمێنێتەوە و لە هەر چەرخ و خولێکدا موسوڵمانان عەمەڵ بەو قورئانە بکەن پلەیان بەرزئەبێتەوە، وە یا ئەبن بە خاوەن نەفسێکی پڕ بەها و گران قیمەت.

وە لە هەر چەرخ و خولێکدا موسوڵمانان ئەگەر دوور کەونەوە لە عەمەڵکردن بە قورئانی پیرۆز پلە و پایەی ئینسانییەتیان لای خوا کزو لاواز ئەبێت، وە لە بەین ئەچن، کەئەم قورئانە موعجیزەیە بۆ تەواوی ئینسانەکان و پەرییەکان لەوەدا کە بتوانن وێنەی ئەم قورئانە، یا دە سورە یا تاکە سوورەتی لە وێنەی ئەو بێنن، کە وەکووو قورئان وابێت لە پلەو بەرزیبا، کە هۆی ئیعجاز بێت لەلایەن هەر فەردێکەوە چ لە ئینسانەکان یا لە پەرییەکان، نەخوێندە بێت یا خۆیندەوار، یازۆر زانا بێت لەسەر گۆشەی ئەم ئەرزەدا!

کەوابوو لەمەدا بەڵگەیەکی گەورەو دەلیلێکی بێگومان هەیە بۆ

موسوڵمانان بەڵکوو بۆ تەواوی خەڵکی کە ئەم پەرتۆکە کەلام و فەرموودەی خواییێکە کە زانایە و ئاگایە بە سەر هەموو شتێکدا و غەیری خوا کەستر بە حەقیقەت لە سیرڕیاتی ئیعجازی قورئان نازانێ و تێ‌ناگات، هەر چەن زانایانی پایە بەرزی قورئانی لە سیرڕی ئیعجازی قورئان شتی زۆریان باس کردووە کە یەکێ لەو شتانە ئەمەیە ئەم کەلامی خوا ئوسلوب و شێوەی دارشتنی لەگەڵ باقی پەرتۆکەکانی ئەهلی عەرەب زماندا جیاوازی زۆرە، لەگەڵ جۆراوجۆری ئەو هەموو زمان و لەهجانەی کە هەیانە!

جائەم قورئانە کەلام و نووسراوێکە هاتووەتە خوارەوە بۆسەر دڵی شەخسێکی نەخوێندەوار کە لەناو گەلێکی نەخوێندەواردا ژیاوەو گەورە بووە، کە ئەم گەلە جیاوازی هەیە بە ئەدبێك و فەرهەنگێك کە لە عالەمدا تاك و بەرز بووە.

وە یەکێ‌تر لەو شتانەی کە قورئان شموولی هەیە بەسەریا بەیان کردنی ئەو شتە غەیبییانەیە لە زەمانی ئیستە و داهاتوودا. وە هەروا یەکێتر لەو شتە عەجایبانە کە لە ناو قورئاندا هەیە بەیانکردنی چەن شتێکی زانراوی ڕیزن لەعاسمانەکانداو لەزەویدا و لەباقی ئەم بوونەوەرەدا، لە بەحرو لە هەوا وە... وە هەروا باسی حەرەکەت و جوولانی ئەم کەونەو جێگە خولانەوەی ئەو کوراتانەیە، وە بەرابەری کردنیانە بە یەکتر و چلۆنیەتی وەزعییەتی دەریاکان و ڕووبارەکانە، وە پێدایەك چونی شەو و

ڕۆژە لە یەکتردا و سەعات و دەقیقەکانی شەو و ڕۆژە بڕێکیان لەناو بڕێکی تریاندا، بەخاتر زیادو کەم کردن یا بەرابەرییان لە شەو و ڕۆژدا.

کە ئەمانیشە شتانێکن کە ئاوەزی ئینسانی نەخوێندە تیایانا کۆڵە و بڕناکات بەتایبەت لەو چەرخ و خولەدا کە قورئانی پیرۆز شەرەفی نزوولی بووە کە تا ئەمڕۆ چواردە سەدە بەسەریا تێپەڕبووە ئەویش لە ولاتێکدا کە دوور لە زانستگا و جامیعە و دوور لە حەزارەت و سەقافەت و پێك‌هێنانی مەجلیسەکان و کۆنگەرەکان بووە.

وە یەکێ‌تر لەو شتە عەجیب و غەریبانە، شموولی قورئانە بەسەر نوکاتی بەلاغیدا کە بریتین لە بەرابەری کردنی کەلام بەگوێرەی حاڵ و داخوازییەکانی حازرین لە ژنان و پیاوان، وە هەروا بەسەر فەساحەت و بێخەوشی کەلام لە وشە تاکەکان و تێك ڕژاوەکاندا، وە بەسەر جوانترین دارشتن جوملە لەگەڵ جوملەی تردا، وەسوورەت لەگەڵ سورەتدا بەگوێرەی ئەوەی کە پێداویستی ئاوەزی ئینسانەکانە ئەوانەی کە قورئان لەچەرخ و خولی ئەواندا شەرەفی نزوولی بووە.

وە بەشێ‌تر لەو شتانەی کە قورئانی پیرۆز شموولی هەیە بەسەریانا، خالّی بوونی قورئانە لەو شتانەی کەخیلافی واقیع و حەقیقەتن، چ لە زەمانی ڕابردوا، وە چ لە زەمانی ئیستەو داهاتوودا، وە قورئان خالّییە لەو شتانەی کە زیادەڕەوی و دەس هەڵبەستوو و درۆن، وە بەشێتر لەو شتانەی کە قورئان شموولی هەیە بەسەریا ئەوەیە، قورئان لە کاتی

تیلاوەت و خوێندنەوەدا گڕ بەرئەداتە دڵ و دەروونی ئینسانەکان و زۆر تەئسیر دائەنێ بەتەئسیرێکی نایاب و بێوێنە، کە ئەو تەئسیرە زۆر قەویترە لە تەئسیری دەرزی و دوکتۆر لە نەخۆشدا، بە جۆرێکی وا کە دڵی گوێگران و بیسەران وەحشەت و ترس ڕووی تێ ئەکات و دای ئەگرێ، وە ئەمەیشە لە کاتی خوێندنەوەی ئەو قورئانا ئەبێت، وە یا لە کاتێکدایە کە بخوێنرێ و بگا بە دڵی ئەو کەسانەی لە ئینسانەکان ئەوانەی کە بە وەسفی ئەدەب و ئینساف ڕازاونەتەوە.

وە هەروەها یەکێ تر لەو شتانە کە قورئان شموولی هەیە بەسەریا ئەوەیە، پیتەکانی قورئان و وشەکانی و ئایەتەکانی بەتێك ڕژاوی و بە مورەتتەبی و بە ڕەدیف کردن شموولیان هەیە بەسەر چەن ڕەمزو ئەسرارێکدا کە هەرکەسێ ناتەوان و بێدەسەڵاتە لە دەرخستنی ئەو ڕەمزانەدا، مەگەر ئاوەزی ئەو کەسانەی کە خوا تایبەتمەندی پێداون، کە بتوانن ئەو ئەسرار و ڕەمزانە دەرك کەن، وە غەیری ئەمانیشە قورئان شموولی هەیە بەسەر ئەو شتانەیدا کە لەمەو پێش یا لەمەودوا دەرئەکەون یا دەرکەوتوون.

مەسەلەن وەکوو ئاسوودە بوونی ئینسان لە نەخۆشینە جۆربەجۆرەکان، یا کردنەوەی گرێ کوێرەکان لە موشکێلات و ئەو جۆرەشتانەی کە لەئینساندا پەیدا بوون کە برێك لەخواناسان ئاگاداری پەیدا ئەکەن بەسەریانا، کە بەشێك لەوانە لەلاپەڕەی پەرتۆکی پێشووەکان و پەرتۆکی

زانایانی دوایدا نووسراوە و سەبت کراون، وە هەروا لە پشتیوانیکردنی ئەو نوێنەرەیە تێکۆشان و تەلاشی ئینسانەکان لەڕێگەی فێرکردن و فێربوونی زانستەکانە کە بەزمانی عارەبی دانراون، ئەوانەی کە ڕەسم و یاسای ولاّت پەرتۆکە ئیسلامییەکانی لەسەر نوقتەی دائیرەی ئەوان نوسیوە، وە لەسەر ئەو نوقتەیە ئەخولێنەوە، وەکووو سەرف، نەحو، بەلاغە، ڕێزمان، «اصول الفقه»، ئوسولی دین، وە... وە ئەمەیشەڕوون و سابتە، چون دەوامی ناسینی دین بە ناسینی قورئان و حەدیسە بەرزەکانی ڕەسوولی خوایە ﷺ وە ناسینی ئەم دوو سەرچاوە بەرزە گرنگانە عادەتەن بەبێ ناسینی علوومی عەرەبی مەحالّە، وە هەرشتێ لە سەر خیلاف و پێچەوانەی ئەم ڕەوشتەبخولێتەوە ئەوە تەلاش و زەحمەت کێشانە بۆ تیابردنی دینی خاوەنی میعراج. وە ئەمەیشە بە زۆری تاقی‌کراوەتەوە، وە چەن ڕۆژێك ئێمەیش لەسەر ئەم تاقی کردنەوە ڕۆیشتووین وە هەر ڕێگەیێ موخالیف بێ بۆ ئەم مەنهەج و یاسایە ئەوە موسوڵمانان بەرەو تیاچوون ڕائەکێشێ وە ئەیانبات.

وە هەروەها لە پشتیوانی کردنی نوێنەری خوایە دانانی نامیلکەی ئاسان و سووك، ئەو نامیلکانەی کە منداڵانی موسوڵمانان فێری ئوسوڵ و فرووعی دین ئەکەن، وە هەروەها فێری ژیاننامەی ڕەسوولی خوا و جێ‌نشینەکانی و زانایانی پێشەوا ـ ئەوانەی کە تێکۆشانی بێ وچانیان بوو لەچەن سەدەی ئەووەڵدا ـ ئەکات ئەو سەدانەی کە نوێنەری خوا

شاهیدی لەسەر چاکییان داوە فەرموویەتی:

«خَيْرُ الْقُرُونِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»[١] واتـە: چـاکترین خەڵکی زەمان، خەڵکی زەمانی چەرخ و خولی منە واتە: ئەو قەڕنەی کە پێغەمبەری خوای تیا ژیاوە ﷺ پاش ئەو قەڕنەیە قەڕنی ئەسحابە، وە لەپاش ئەوانیش چەرخ و خولی زەمانی تابیعینی ئەسحابە.

چـون ئـینسانە بـڕوادارەکـانی ئـەو دەورو زەمـانە دەرك و فـەهمیان و هـەڵینجان و کـاری شـیرین و جـوانـی وایـان بـوە، بـەجۆرێك کـە ئاوەزی ئینسانانی ڕۆشنبیرو ژێر سـەرگەردان ئـەکات، وە هـەروەها بەسەرهات و ژیـاننامەی دۆسـتانی خـوا، وە پـیاوە چـاکەکانی بـەرز و تـێکۆشـەر لـە ڕێگەی دونیا و دینا، کە شارەزایی و ئیرشادیان بۆخەڵك وەکوو چرایەکە دڵی مـوسوڵمانان ڕۆشـن ئـەکات و فـێرئەکات، وە هـەروەها لە پـشتیوانـی ئـەوپێغەمبەرە ﷺ دائـەنرێ، تـەربییەتـ و بـارهێنانی مـنداڵانـی بـچووك و تـازەپێگەیشتوو بـە هـەرشێوەیە جـۆربێت و بـگونجێ بـۆ حـاڵی کـردنیان بەرەو لای دینی پیرۆزی ئیسلام، ئەوەش بە دروست کردنی کۆنگەرەی دینی و موناسەباتی دینی، وە حازرکردنی ئەو منداڵانە و ئەدەب دادانیان لە سەرخۆش‌ویستنی خوا و پێغەمبەری خوا ئەبێت.

وە هەروەها لەسەر خۆش‌ویستنی یارانی بەرزی ئەو نوێنەرە و لەسەر

---

١. سحیح بخاری : (١٣٢/٩) . سحیح مسلم لە حەزرەتی عائیشەوە.

خۆش‌ویستنی پێشەوایانی دین و ساڵحانی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەدەب فێرکردنی ئەو منداڵانەو پەروەردە کردنیان و دامەزراندنی بیروبڕوای نوێنەری خوا و یارەکانی لەدڵیاندا، چون بەڕاستی منداڵانێ لەسەر ئەو عەقیدەو باوەڕە تەربییەت بکرێن ئەوانە ئەبنە کۆمەڵ و فیرقەی ناجییە ئەو کۆمەڵەی کەنوێنەری خوا دیاری و ئاماژەی بۆ لاکردوون و فەرموویەتیی: ئەوانە کەسانێکن لەسەر نەهج و بەرنامەیك کە من و یارەکانم لەسەری بووبین ئەڕۆن، وە هەرشتێ بەکاربگیرێ لەڕێگەی ئەوەدا ئەوە وا لە خزمەت ئیسلام و موسوڵماناندا.

وە هەروەها لەپشتیوانی کردنی نوێنەری خوایە ﷺ حاڵی کردنی کۆمەڵی موسوڵمانان بۆ یەکگرتوویی و یەکگرتن. وە خۆپاراستن لە تەفرەقە کە ئەوەش ئەبێتە هۆی جیایی و دووربوون لە یەکتر، چون خوای گەورە لە سوورەتی ئالی‌عمران لە ئایەتی ژمارە سەدو سیدا فەرموویەتێ:

﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعاً وَلَا تَفَرَّقُوا﴾ واتە: هەمووتان دەس بگرن بە دینی خواوە و لەیەك جیامەبنەوە، چون تەفرەقە و جیایی ئەبێتە هۆی تیاچوون و لەبەین چوونتان. وە هەروا لە سوورەتی ئەنبیا لە ئایەتی ژمارە نەوەدو دوودا فەرموویەتی:

﴿إِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ واتە: بەڕاستی ئەی ئینسانەکان ئا ئەمە دینی ئێوەیە کە واجبە و پێویستە لەسەری بن دینێکی تەنهایە هیچ‌گۆنە جیاوازییەکی تیا نییە، کە ئەو دینەش بریتییە لە دینی

ئیسلام، وە ئەمە ڕەوشتی گەلی ئیسلامە کە ناسراون بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت، وە لە ڕاستیشدا تەنها پرۆگرام و ئایینێك کە سوود و قازانج بگەیەنێ بە ئادەمیزادەکان ئایینی پاکی ئیسلامە، وەکووو خوای گەورە لە سوورەتی ئالیعمران ئایەتی ژمارە نۆزدەدا فەرموویەتی:

﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ﴾ واتە: تەنها شەریعەت و ئایینێك کە بە دەرد بخور بێت بریتییە لە شەریعەت و ئایینی بەرزی ئیسلام وە غەیری دینی ئیسلام خوا بەهیچ دینێکیتر ڕازی نییە بۆ ئیمانداران. وە وشەی ئیسلام لە یاسای گشتیدا بە دوو مانا هاتووە: ،مانایەکی گشتی و مانایەکی تایبەتی، مانا گشتییەکەی بەم شێوەیە واتە: دینی تەسلیم بوون بەخوای گەورە و یەکتاپەرەستی و قەبوڵ کردنی ڕیسالەتی نوێنەرانی خوا بەگوێرەی هاتنەخوارەوەی لە هەر عەسر و کاتێکدا. وە مانا تایبەتییەکەیشی بریتییە لەو یاسا ئیسلامییەی کە حەزرەتی موحەممەدی موستەفا ﷺ هێناویەتی، کە ئاخرین نوێنەرانی خوایە لەم سەرئەرزەدا، وە ئەوەیش کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ هێناویەتی باوەڕکردنە بە زاتی خوای گەورە و فریشتەکانی و کتێبە ئاسمانییەکان و نوێنەرەکان و بەڕۆژی ئاخیرەت و قەزاو قەدەری ئیلاهی لە خێرو لە شەڕ.

وە ئەو خوایە بەدیهێنەر و دروستکەری هەرچی شتە لەم کەونەدا و ئەو خوایە بەسەر هەموو شتێکداحازر و نازرە، وە وتنی دوو ڕستەی شەهادەتەینە، وە ئەنجام دانی پێنج فەرزەی نوێژە لە هەموو شەو و

ڕۆژێـکدا و گـرتنی مـانگی مـوبارەکی ڕەمـەزانـە لە هـەموو سـاڵێکدا و عەتاکردنی زەکاتـە بە کۆمەڵی موستەحـەققان و نیازمەندان و ئەنجامدانی حەججی فەرزە لە مەککەی موکەڕەمەدا لە بۆ کەسێ توانای بەدەنی و ماڵی ببێت، وە ئەو نوێنەرە بەڕێزەیە کـە دینی ئیسلامی هێناوە، بـەم مانا دوهەمینە، خوا ناردوویەتی بۆ سەرئینس و جنن بەتێکڕا، ئەو نوێنەرەی کـەهەم مـزگێنی ئـەدا بـە گـەلەکەی، وە هـەم تـرسێنەریشە. وەخـوای گەورەلەسوورەتی ئەنبیادا ئایەتی ژمارە سەدو حەوت فەرموویەتی:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ واتـە: ئێمە تۆمان نەناردووە بۆ سەر خـەڵکی مـەگەر بـە ڕەحـمەت نـەبێت بۆ گـشت بوونەوەر، وە ئـەرکان و پایەکانی باوەڕو ئیـسلامییەت موشتەرەکن لەناو تەواوی خاوەن بڕواکاندا بەتێکڕا.

کەواتە: خوا خوایەکە کە تەنهایە و شەریکی نییە و کەلامی، کە بریتییە لە قـورئان یـەکێکە و نـوێنەری خـوا، کـە حـەزرەتی مـوحەممەدە ﷺ یـەکێکەو قـیبلە یـەکێکەو بـەرهەمی نـوێنەرایـەتی بـریتییە لە ڕووتـێکردنی بـەندەکانی خـوا بـۆلای خـوایـەك، کە تـەنهایە و شـەریکی نییە لە بـوونی واجـبیدا، وە لە بـەدیهێنانی ئەم عالەمەدا و لە پەرەستش و عیبادەت دا و فەرق و جیاوازی لـە نێوان زەیدو عەمرا، کە کامیان گەورەیـە لە ئـەرکان و بـنەمای بـاوەڕی ئـسلامیدا نـییە، کـەوابـوو چـون ئوسول یـەکێکە، یـەك گـرتوویی بـەرەکەت و ڕەحـمەتە و تـەفرەقە و جیاوازی سزاو عـەزابـە، وە

قودرەت و دەسەلاتی خوایی وا لەگەڵ کۆمەڵ و جەماعەتدا، وەپێغەمبەری خوا ﷺ هەمووکات کۆمەڵ و گەلەکەی پاراستووە و ترساندوویە لە تەفرەقەو کێشەی ناوخۆیی و ئیختیلاف بە هەرشێوەو هۆیەك بێت، جا لەسەر ئەم ئەساسەیە لازمەو پێویستە لەهەر کوێدا ئیختیلاف و جیاوازییان دی لەنێوان گەل و کۆمەڵدا، لەسەریان لازم و پێویستە هەوڵ بدەن بۆ بەرگری و تێکۆشن بۆ یەکگرتنیان، جا ئەگەر بۆیان جۆر نەبوو لەسەریانە شوێن کەوتووی زۆربەی خەڵك بکەون. چون ئەمە شتێکی سەرەکییە هەرکاتێ موسوڵمانان یەك گرتوبون و یەکیەتی خۆیان پاراست ئەوەنەفسی خۆیان بیمەکردووە و سەربەستن، وە ئەگەرئیختیلاف و جیاوازیان بوو ئەوە لەبەین ئەچن، چون لە هەووەڵی زەمانەوە تا ئەم کاتەیە کە ئێمەی تیا ئەژین، هیچ دەردێکی گەزندەو نابارتر نەبووە کە پەیکەرەو قەوارەی موسوڵمانان بگەزێ خرابتر بووبێت لەتەفرەقە و جیایی، وە هیچ دەوا و دکتۆرێك بەکەڵك و بەسودتر نەبووە بۆ قەوارەی موسوڵمانان لەوە کە موسوڵمانان لەسەر یەك هێل و یەك کەلیمە هاودەنگبن، چون بەڕاستی تەنها دین و ڕێبازێك، کە بەکەڵك بێت لای خوای گەورە بەس تەنها ڕێبازی ئیسلامە. وە زەعیفی و لاوازی ئەمڕۆی ئێمەی موسوڵمان تەفرەقەو جیاوازیمانە بە چەن تیرە، وە شوێن کەوتنمانە بۆ ڕەوشتی نەفامی‌گەری و عەسەبییەت کە ئەمەش بووەتە هۆی تێشکانی موسوڵمانان و ئەوقەوم و گەلانە.

وه هەروا لە پشتیوانی کردن و خۆش‌ویستنی پێغەمبەری خوایە ﷺ هـەدیەکردن و سـەڵەوات دان بـۆ ڕۆحـی پـاکی ئـەو پـێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ خوای گەورە لەم بوارەدا بەیانی کردووە و فەرموویەتی:

﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيماً﴾ واتە: بەڕاستی خوای گەورە ڕەحمەتی خۆی ئەڕژێنێ بەسەر پێغەمبەردا ﷺ وە فریشتەکانی خوایش داخوازی ڕەحمەتی خوا ئەکەن بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ ئێوەش ئەی کۆمەڵی ئیمانداران داخوازی ڕژانی ڕەحمەتی خوا بکەن بۆ سەر ڕۆحی پێغەمبەری خوا ﷺ. وە ئا شکرایە سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەحیاتی ئاخری هەموو نوێژێکدا چ فەرز بێت و چ سوننەت واجبە بدرێ لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەو نوێژە سوننەتە چ سوننەتی موئەککەدە بێت یا غەیرە موئەککەدە، کەواتە نوێژ بەبێ ئەو سەڵەواتە بەتاڵە وە بەکەڵك نایەت، وە زانایانی موجتەهیدی شەرع هەموویان لەسەر ئەمە هاودەنگن و یەك ڕان. وەئیمام ترمزی ڕەحمەتی خوای لێبێت لەئەنەسەوە ڕەزای خوای لێبێت ڕیوایەتی کردووە ، وە ئەم فەرموودەیشە سەحیحە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

«مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلْيُصَلِّ عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ مَرَّةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

عَشْرَ مَرَّاةٍ»[١]

واتــە: لەلای هــەرکەسێکدا نــێوی مــن هــێنرا بــاداوای ڕژانــی ڕەحــمەتم بۆبکات لای خوا چون هەرکەسێ تاکە سەڵەواتێك بۆ من داوا بکات لای خــوای گــەورە، خــوای تــەعالی دە دانــە لە ڕەحــمەتی خــۆی ئــەڕژێنێ بــەسەریا، وە هــەروا لەو ســونەتانەیە کــە پــێغەمبەری خــوا ﷺ فــەرمانی داوە کە ئەنجام بدرێن، سەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای هەموو بانگێك بــۆ نوێژ، وە... پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:

«إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ يُؤَذِّنُ فَقُولُوا مِثْلَ مَايَقُولُ ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ وَسَلُوا اللّٰهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ»[٢] واتە: هەرکاتێ بیستتان بانگوێژ بانگی وت: ئەو بانگ وێژە چی ئــەڵێت لە بــانگەکەیا ئــێوەش وەکــووو ئــەو دووپــاتی بــکەنەوە. پــاشان سەڵەوات بدەن لەسەر من و داخوازی وەسیلەم بۆ بکەن لای خوای گەورە، کە خــوا ئـــەو مــەقام و پــلەیەم پــێ بــەخشێ. وەهــەروا ئــیبنو حــەببان ڕیــوایــەتی کردووە لە ئەبی هورەیرەوە رضي الله عنه فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا ئەفەرمێ:

«اَلْوَسِيلَةُ دَرَجَةٌ عِنْدَاللّٰهِ لَيْسَ فَوْقَهَا دَرَجَةٌ فَسَلُوا اللّٰهَ أَنْ يُؤْتِيَنِي الْوَسِيلَةَ»[٣] واتــە: وەســیلە پــلە و مــەقامێکە لای خــوای گــەورە کــە لە ژوورەوەی ئــەو پــلەو مــەقامێکیتر بــەرزتر نــییە بــۆ ئــینسانەکان، ئــێوە

١. سونەنی تیرمیزی : (٤٥٦/١١).

٢. موسنەدی ئیمام ئەحمەد و سونەنی تیرمیزی : (٦٠/١١) .

٣. موسنەدی ئیمام ئەحمەد.

پلەو مەقامێکیتر بەرزتر نییە بۆ ئینسانەکان، ئێوە داخوازی بکەن لە خوای گەورە ئەو پلە و مەقامەم پێ ببخشێ. ئیمام ئەحمەد رحمه الله ئەم فەرموودەیە لە ئەبی سەعیدەوە ڕیوایەت کردووە، وەهەروا بزانە ئەی ئینسان سەلات و سەلام داواکردن بۆ ڕۆحی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێوەی گشتی فەرمانی پێدراوە واتە: نەبسراوە بەحەددو حدودو ژمارەوە چ بەسوورەتی ئاشکراو ڕواڵەتی بێت، وە یا بەسوورەتی پەنامەکی و نهێنی، وە قانوونیش وایە هەر شتێك بەشێوەی گشتی وارد بوویێت جوانەو پەسەندە مەگەر ئەمە بەرگری لێوەکرابێت.

جا لەسەر ئەم ئەساسە ئەگەر شەخسێك سەڵواتی دا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵی خۆیا، یا لە دەرەوەی ماڵی خۆیدا یا لە مزگەوتا، وە... بە دەنگێکی هێواش و لەسەرخۆ یا بەدە نگێکی بەرز، یەك جار، یا چەن جارێك ئەوە ئەوکەسە سونەتی پێغەمبەری بەجێ‌هێناوە مەگەر ئەمە شتێك بەرنگاری ئەم سوننەتە بێت، بەو مانا نەهی لێ کرابێت. مەسەلەن کەسێك لە مزگەوتا خەوتبێ بەخەوتنێکی شەرعی، یا نەخۆشێك لەویادا بێت یا کۆمەڵێك خەریکی تەدریس و فیرکردنن، یا خەریکی وەعزو نەسیحەتێکی واجب یا سوننەت بن، ئەوە لەو کاتەدا بە سوننەت بۆی ناژمێرێت، وە هەروەها سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای وتنی بانگ، سێ جار فەرمانی پێ‌دراوە، وە لە وڵاتانی ئیسلامیدا بووە بە یاسا و عادەت هەر لە دەوران حاکمی ئیسلام حاکمی سالح و

شارەزای ڕێگەی ڕاست سەلاحەددینی ئەیوبی‌ﷺ وە موسوڵمانان لەسەر ئەمە هاودەنگن، وە هەرکاتێك ئیجماع بوو لەسەر حوکمێکی شەرعی ئەوەخۆی ئەبێتە بەڵگەو حوجەت، وە درکەوتنی خیلافی ئەو حوکمە لەدوای دامەزرانی ئیجماعەکە زیانی بۆحوکمەکە نییە، وە قسە و نەقدی ئەو کەسانەش کە ئەڵێن بەم سەڵوات دانە، گەورەیی و فەزیلەتی ئەووەڵی وەخت لەدەس دەرئەچێ بۆ نوێژە فەرزەکان، ئەوە نەقدێ بێ جێگەیە و غەیرە سەحیحە؛ چون پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە بیلالی بانگوێژ، کە لە دوای بانگ عەجەلە بۆ قامەت وتن نەکات، بەڵکوو لە دوای وتنی بانگەکە پشوویی بدات، وە هۆکەیشی ئەوەتانێ تا ئەو کەسانە کە نوێژخوێنن و بە جەماعەت کردن ئولفەتیان گرتووە حازری ئەو جەماعەتە ببن.

هەر بەم بۆنەوە، بەلای زانایانی فیقهەوە سابتەو ئیسباتیان کردووە کە سوننەتە چەن دەقیقەیەك دواخستنی قامەت لە دوای وتنی بانگ وە ئەمەیشە لە کتێبە شەرعییەکاندا نوسراوە بەڵام ئەوقسەیە کە وتوویانە ئەو سەڵواتە لەدوای بانگ وتن بیدعەتەو شتێکی پەیدابوو و تازەیە و لە عەسرو زەمانی پێغەمبەردا ﷺ نەبووە و هەروا لە زەمان و کاتی جێ‌نشینەکانیدا واتە: خولەفای راشیدیندا رضي الله عنهم نەبووە، ئەڵێین ئەو کەسە ئەگەر مورادی بە بیدعە بیدعەی لوغەوییە ئەوە موسەللەمە، بەڵام بابزانین هەموو بیدعەیەك و تازەپەیدابوویەك ناپەسەندو خیلاف نییە چون

برێك لەو شتانەی کە لە دەورانی ڕەسولەڵڵادا ﷺ نەبوون بەڵام ئیستە واجبە و لازمە ببن و دایر بکرێن، بۆ نموونە وەکووو دایر کردن و کۆکردنەوەی قورئان، وە هەروا وەکووو نوسینی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە هەروا برێك لەو شتانە کە ئەشێ دایر بکرێن سوننەت و موستەحەببن بۆ نموونە، وەکووو دیاری کردنی میحراب لە ناو مزگەوتەکاندا بۆ دیاری کردنی جیهەتی قیبلە تا جیهەتی قیبلە دەرکەوێ؛ بەڵام ئەو وێژەرە ئەگەر قەسدو نیازی بە بیدعە، بیدعەی شەرعی بێت واتە: موخالیفی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی زانایانەو خاریجە لەمانە ئەوە قسەیەکی ڕەدد و مەمنووعە و لێی وەرناگیرێ لەگەڵ ئەوەشدا تۆی خاوەن بڕوا زانیوتە کە سەڵەوات دان لەدوای بانگ فەرمانی پێدراوەو فەرمان بەو سەڵەواتە بە شێوەی موتڵەق و عوموومە کە ئەگونجێ بۆ چەن شتێکی جیاجیا.

وە لەولایشەوە ئەزانین زۆرێ لە واجباتی ئیسلامی هەن،کە لە عەهدو زەمانی نوێنەری خوادا وە هەروا لە زەمانی جێگەنشینە بەڕێزەکانیدا نەبوون، کەچی ئیستە هەن و پێویستیشە کە ببن مەسەلەن، وەکووو نووسین و جەم کردنی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەهەروا وەکووو دانانی علوومە بنەڕەتیەکان، وەکووو نەحو، سەرف، فیقه ، بەلاغە «اصول الفقه»، «اصول الدین» وە غەیری ئەمانیشە لە واجباتی‌تر، وە هەروەها، وەکووو دەرکەوتنی زانستە سەنعەتیەکانی ڕۆژ لە ناو موسوڵمانانندا.

کەوابوو دەرکەوت بیدعەیەك و تازەپەیدابوویەك گومڕاییە و

سەرلێشێوانە کە بیدعە بێت لە ڕوانگەی عورف و یاسای شەرعا، واتە: موخالیف بێت و نەساز بێت لەگەڵ موقتەزای کیتاب و سوننەت و ئیجماعدا، وە زۆر جێگای ئەسەفە نەزانکاری بڕێك لە موسوڵمانان بە ئوسولی دین و فروعی دین بە جۆرێکە کە حەق لە بەتاڵ جیا ناکەنەوە، وە بە نەزانکاری خۆیان ئینسانە نەزانەکان و بێ‌ئاگاکان ئەخڵەتێنن، وە ئیددیعا ئەکەن ئەڵێن هەرشتێ لە عەهدو دەورانی ڕەسولی خوادا ﷺ نەبوبێت بیدعەتە و گومڕاییە، پەنا ئەگرین بەخوا لە جەهالەتی نەزانکاران.

وە هەروەها لە پشتیوانیکردنی پێغەمبەری خوایە ﷺ بەشارت دان بەموسوڵمانان بەوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ پلەو مەقامی شەفاعەت و تکاکردنی بۆ هەیە لای خوا، بۆ تاوانبارانی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ وە بە یەقینی ئیمام ئەحمەد رحمه الله لە مەسنەدی خۆیدا ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە رضي الله عنهما کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**«خُيِّرْتُ بَيْنَ الشَّفَاعَةِ وَ بَيْنَ أَنْ يَدْخُلَ شَطْرَ أُمَّتِي اَلْجَنَّةَ فَاخْتَرْتُ الشَّفَاعَةَ فَإِنَّهَا أَعَمُّ، أَتَرَوْنَهَا لِلْمُؤْمِنِينَ الْمُتَّقِينَ؟ وَلٰكِنَّهَا لِلْمُذْنِبِينَ الْمُتَلَوِّثِينَ الْخَاطِئِينَ»**

واتە: لەلایەن خوای گەورەوە ئیختیارم پێ‌دراوە لە نێوان دوو شتا: یەکەم ئەوە لە ڕۆژی قیامەتا لای خوای گەورە تکا بکەم بۆ گەلەکەم. دووهەم کە نیوەی ئوممەتەکەم بچنە بەهەشت، من تکا کردن و شەفاعەتم هەڵبژارد، چون شەفاعەت‌کردنەکەم عامترە و زۆرتر ئەگرێتەوە، ئایا ئێوە وا دەزانن، وە وا دەبینن شەفاعەتم بۆبڕوادارانەو خۆپارێزەرانە لە دونیادا؟

نە وانییە بەڵکوو شەفاعەتم بۆ کۆڕی تاوانبارانە، ئەوانەی تێکەڵ و ئالوودە بوون بە تاوان و خەتاکاری، وە ئەم فەرمودیە سەحیحە.

وە هەروەها ئیمام ئەحمەدﷺ لە مەسنەدی خۆیدا ڕیوایەتی کردووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**شَفَاعَتِي لِأَهْلِ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي**» واتە: تکای من بۆ گەلەکەم لای خوا، لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ کەسانێکە کە تووشی تاوانی ناباروِ خەتای گەورە بوون، وە هەروەها ئەبووهوڕەیرە ڕیوایەت ئەکات و ئەفەرمێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمونیەتی:

«**سَأَلْتُ اللّهَ الشَّفَاعَةَ لِأُمَّتِي فَقَالَ: لَكَ سَبْعُونَ أَلْفاً يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلاعَذَابٍ، قُلْتُ رَبِّي زِدْنِي فَحَسَا لِي بِيَدِهِ مَرَّتَيْنِ عَنْ يَمِينِهِ وَ عَنْ شِمَالِهِ**» واتە: داخوازی تکا و پاڕانەوەم کرد لە خوا بۆ ئوممەتەکەم پاشان خوای گەورە فەرمووی: بە خاتر تۆ حەفتا هەزار نەفەر ئەچنە ناو بەهەشت بەبێ حیساب و عەزاب، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمێ: عەرزی خوای گەورەم کرد: بۆم زیادکە، ئەفەرمێ: خوای گەورە بە عەزەمەت و گەورەیی خۆی بۆی زیاد کردم.

ئەم فەرموودەیە لەسەر ئەو ئەساسەیە، عادەتەن ئینسانی سەخی کاتێ شتێ ببەخشێ و داوای زیاتری لێ بکرێ، بەم دەس و بەو دەس بەلای ڕاست و چەپا شتەکەی ئەبەخشێ و بەرچاو تەنگ نییە. کەواتە لێرەدا مەقسوود ئەوەیە کە خوای گەورە بەزۆری وڵامی پێغەمبەری داوەتەوە و لە بەخشینی گەلەکەیا بۆی زیاد کرد بەو ئەندازەیە کە ڕازی

بـێت، وەکـووو ئـەمە لە فـەرموودەیتردا دەرئـەکەوێ، وە هـەروەها ئیبنوعومەر ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

«اِذٰا سَمِعْتُمُ المُؤَذِّنَ يُؤَذِّنُ فَقُولُوا مِثْلَ مٰا يَقُولُ ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلّٰى عَلَيَّ صَلاٰةً صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ عَشْراً ثُمَّ سَلُوا اللّٰهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ فَإِنَّهٰا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لاٰيَنْبَغِي إِلّا لِعَبْدٍ مِنْ عِبٰادِ اللّٰهِ وَ أَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَاهُوَ، فَمَنْ سَأَلَ اللّٰهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ عَلَيْهِ الشَّفٰاعَةُ» رواه أحمدُ في مَسنَدِهِ وَ السَّنَدُ صَحِيحٌ. واتە: هەرکات گوێتان لێ بوو بانگوێژ بانگیدا، ئێوەش بە وێنەی لەفزەکانی ئەو بانگوێژە بڵێنەوە، واتە: ئەو چی ئـەڵێت ئێوەیش بیڵێن ئـەمجار لە پاش بانگەکە سەڵەوات بدەن لە سەر من چوون هەرکەسێ یەك سەڵەوات بدات لە سەر من خوای گەورە دە دانە ڕەحمەتی خۆی ئەڕژێنێ بەسەر ئەو کەسەدا، پاش ئەوەلای خوا، داخوازی وەسیلەم بۆبکەن، کەخوا لە ڕۆژی قیامەتدا پێم عەتا بکات، چون وەسیلە مەنزیلەتێکە لە بەهەشتدا شیاو و شایانی کەس نییە مەگەر بۆ بەندەیەك لە بەندەکانی خوای گەورە، وە من دڵنیام و ئومێدم هەیە کە ئەو بەندە من بم، جا هەرکەسێ داخوازی ئەو پلەو پایەیەم بۆ بکات لە دەرگانەی خوادا تکاو شەفاعەتی من لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا شامڵی حاڵی ئەبێت.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ زَارَ قَبْرِي وَجَبَتْ

لَهُ شَفٰاعَتِي»[1] واتە: هەرکەسێ لە بڕواداران بێتە سەرگۆڕی من بۆ زیارەتم، شەفاعەت و پاڕانەوەی من لەڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەو واجب ئەبێت کە بۆی بکەم. ئەم فەرموودەیەئیمام بەیهەقی لەئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ زٰارَنِي بِالْمَدِينَةِ مُحْتَسِباً كُنْتُ لَهُ شَهِيداً وَ شَفِيعاً يَوْمَ الْقِيٰامَةِ» واتە: هەرکەسێ بێت بۆ زیارەتی گۆڕی من لە شاری مەدینەی پیرۆزدا، وە باوەڕی وابێت کە خوای گەورە پاداشی بۆ دیاری ئەکات لەقیامەتدا ئەوە من ئەبم بە شاهێدو تکاکاری لەوڕۆژەدا، ئەم فەرموودەیە ئیمام تەبەڕانی لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْوَسِيلَةُ دَرَجَةٌ عِنْدَ اللّٰهِ لَيْسَ فَوْقَهٰا دَرَجَةٌ فَسَلُوا اللّٰهَ أَنْ يُؤْتِيَنِي الْوَسِيلَةَ» ئیمام ئەحمەد رحمه الله ئەم فەرموودەیە لە مەسنەدی خۆیا ڕیوایەت کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحێحە، واتە: وەسیلە پلەیەکی بەرزە لای خوای گەورە، وە لەوە بانتر پلەی بەرزتر نییە، کەوابوو داخوازی بکەن لە خوای گەورە کە لە قیامەتدا ئەو پلەو پایەمە پێببەخشێ.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْمَقٰامُ الْمَحْمُودُ اَلشَّفٰاعَةُ» واتە: مەقامەلمەحموود تکاو پاڕانەوەی منە لە بەرابەر مەحزەری باری تەعالی دا، بۆ کۆمەڵی خەتاباران، وە ئەم فەرموودیە

---

١. بەیهەقی لە شوعەبولئیماندا لە ئیبنو عومەرەوە.

ئیمام بەیهەقی بەسەنەدێکی سەحێح ڕیواەیتی کردووە.

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**لَا تَمَسُّ النَّارُ مَنْ رَآنِي أَوْ رَآى مَنْ رَآنِي**» ئیمام ترمزی و زیاء لە جابرەوە ئەم فەرموودەیانە ڕیوایـەت کـردووە حـەدیسەکەیش سـەحێحە، واتـە: ئـاگر نـاگا بـە لاشـەو بەدەنی کـەسێك چاوی بەمن کـەوتبێ لەگەڵ ئیمان و باوەڕدا، یا چاوی بە کەسێك کەوتبێ کە ئەو چاوی بە من کەوتووە واتە ئەسحابی منی چاو پێ کەوتبێ.

شـەفاعەت و تـکای نـوێـنەری خـوا لای زاتـی حـەق تـەعـالا چـەن بـەشێك و چەن پلەیەکە:

**یەکەم**: شـەفاعەتی گـەورەیە بـۆ ڕزگـاربوونی بـەندەکان لە سـەختی و نارەحـەتی حـەشرگای قیامەت، وە بـەڕێبوونیانە بۆ حیساب و دادگـایی و بەراورد کردنی کردەوەکانیان بە ترازو میزان،

**دووهـەم**: شـەفاعـەت کـردنی پـێغەمبەری خـوایـە ﷺ بـۆ چاوپۆشی کـردن لە بـڕێك لە تـاونباران، کـە شـیاوی چـونە نـاو ئـاگری جـەهەنەمن پاش تکاو پاڕانـەوە ئیتر ناچنە ناوی،

**بـەشـی سـێهەم**: شـەفاعـەت و پـاڕانـەوەیە بـۆ سـووك کـردنی مـاوەی سزای بڕێك لەتاونباران،

**بەشێکی تر لە شەفاعەت**: پاڕانەوەی حەزرەتی **موحەممەدە** ﷺ بۆ بـەرز بـوونەوەی پـلەی بـڕێك لەو کـەسانە کـە فـەرمانبەردارن و ئیتاعەی خوایان لەدونیادابووە.

کورت و کۆتا، شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ حەققە و سابتە هیچ کەسێ ئینکاری ئەوە ناکات مەگەر کەسێ کە مەحروم بێت لەشەفاعەت، ئیبنو مەنیع لە زەیدی کوڕی ئەرقەم، بەحەق ڕیوایەتی کردووە و هەروەها کۆمەڵێ زیاتر لە دە نەفەر لە ئەسحابی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**«شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَقٌّ فَمَنْ لَمْ يُؤْمِنْ بِهَا لَمْ يَكُنْ مِنْ أَهْلِهَا» وَالحَديث صَحيحٌ.** واتە: شەفاعەت و تکای من لای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا حەققەو سابتە، وە جێگای گومان نییە، کەسێ باوەڕی بەم شەفاعەت و تکا کردنە نەبێت ئەوە ئەو کەسە ئەهلی ئەوە نییە و بەر شەفاعەت و تکای پێغەمبەر ناکەوێ لەو ڕۆژەدا، وە ئەم فەرموودەیشە سەحیحە. جا هەر وەکووو شەفاعەت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ سابتەهەروا، بەو جۆرەیش بۆ باقی نوێنەرەکانی خوا پاش کرانەوەی دەرکی شەفاعەت بۆ گەورەی ئێمە حەزرەتی موحەممەد ﷺ سابتە.

وەهەرواپاش ئەوانیش بۆ کوڕی شەهیدان و پیاوچاکان و ئەسحاب و تابعینی ئەسحاب، سابتەو حەققەو جێگای گومانیش نییە، ئیمام ئەحمەد رحمه الله لە مەسنەدی خۆیا لەعەبدوڵلای کوڕی ئەبی جەدعانەوە ڕیوایەتی کردووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**«لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ بِشَفَاعَةِ رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَكْثَرَ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ»** واتە: بەڕاستی داخڵی بەهەشتی خوا ئەبن بە تکاو پاڕانەوەی یەك نەفەر لە ئوممەتی من زیاتر لە ژمارەی هۆزی بەنی تەمیم، وە هەروەها پێغەمبەری

خوا ﷺ فەرموویەتی:

**«سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ أُوَيسُ الْقَرَنِي بْنُ عَبْدَاللّٰهِ وَ أَنَّ شَفَاعَتَهُ فِي أُمَّتِي مِثْلُ رَبِيعَةَ وَمَضَرَ»**[1]

واتە: لەمەودوا پیاوێك لە ئوممەتی من پەیدا ئەبێت پێی ئەوترێ ئووەیسولقەرەن کوڕی عەبدوڵلا، تکاو پاڕانەوەی لە ڕۆژی قیامەتا بۆ ئوممەتی من شمولی ئەبێت بۆ ژمارەیەك کە بە ئەندازەی ژمارەی هۆزو بەرەی ڕەبیعە و موزەر ئەبن.

وە هەروەها لە پشتیوانی کردنی پێغەمبەری خوایە ﷺ و بە گەورە دانانی ئەوە بەیانکردنی ئەوە کە ئەم پێغەمبەرە گەورەی هەموو نوێنەرەکانی زاتی حەقە لەلای خوای گەورە، وە گەورەی هەموو نێرراوەکانی خوای گەورەیە، ئیمام موسلیم و ترمزی ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبی هوڕەیرەوە ﷺ کە پێغەمبەری خوافەرموویەتی:

**«فُضِّلْتُ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ بِسِتٍّ، أُعْطِيتُ جَوامِعَ الْكَلِمِ، وَ نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ وَ أُحِلَّتْ لِيَ الْغَنائِمُ، وَجُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ طَهُوراً وَ مَسْجِداً، وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً وَ خُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ» والحديث صحيحٌ.** واتە: گەورەکراوم و بەرتەریم هەیە بەسەر باقی نوێنەرەکاندا بەشەش شت: پێم عەتاکراوە لەلایەنی خوای گەورەوە وشەی جامیع، واتە کەلامێکم پێ خەلات کراوە هەموو

---

١. جامع الکبیر جلد ١ باب السین.

پێداویستەکانی بەشەرییەتی تێدایە، وە بۆ هەموو کات و سات وڵامی نیازەکانی ئینسان بەراوەردە ئەکات، وە خوای گەورە پشتیوانی و یارمەتی داوم بەوە کە ترس و وەحشەتی خستووەتە دڵی دوژمنەکانمەوە، وە ئەو شتەی لە کەلەپورو ماڵە کە لە شەڕ و تێهەڵچوونی کافراندا ئەبێتە دەسکەوتی ئیمانداران بۆی حەڵاڵ کردوم، وە تەواوی سەرزەوی بۆمان پاکە و خاوێنە ئەتوانین عیبادەت و سوجدەی تیا بەجێ بێنین، وە نێرراوم بۆ لای خەڵکی بە تێکڕایی نەك بۆلای کۆڕێك و هۆزێکی تایبەتی، وەبەهاتنی من کۆتایی بە نوێنەرانی خوا هاتوە، وە بەرنامەی نوێنەرایەتی بەمن خەتم و مۆرکراوە.

ئەم فەرموودەیشە ئیمام تیرمزی لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە، وە ئەم فەرموودەیشە سەحیحە، وە هەروا خاڵێکیتر بە سەر ئەم شەش خاڵانەدا زیادکراوە، کە قورئانی پیرۆزە خەڵاتی پێغەمبەری خوا کراوە، موعجیزەیەکە تا ڕۆژی قیامەت هەیەو ئەمێنێتەوە، وە هەروا دووبارە خاڵێکیتر زیادکراوە بەسەر ئەم حەوت خاڵانەی پێشدا، کە ئەویش بریتییە لەوە کە ئوممەت و گەلی ئەو پێغەمبەرە چاکترین ئوممەتن لەنێوان ئینسانەکاندا، چون فەرمان ئەدەن بە چاکەو بەرگری ئەکەن لەخراپەو شتی نابارو ناڕەوا. وە هەروەها لە پشتیوانی کردنی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە گەورە دانانی ئەو زاتە بەرزەیە، ئەمە کە خوای گەورە شارەزای کردووە و فێری کردووە بەزۆرێ لە شتە غەیبییەکان و

شتە نهێنییەکان، ئەوانەی کە لەمەو دوا ڕووئەدەن و پەیدا ئەبن بەجۆرێ کە خوای گەورە ئەو شتانەی هاویشتووەتە دڵی پاکی پێغەمبەر ﷺ مەسەلەن پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:

**«لاتَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّىٰ تَكُونَ عَشْرُ آيَاتٍ: اَلدُّخَانُ، وَالدَّجَّالُ، وَالدَّابَّةُ، وَ طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَ ثَلَاثُ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ وَ خَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ وَ خَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَ نُزُولُ عِيسىٰ عليه السلام، وَ فَتْحُ يَأْجُوجَ وَ مَأْجُوجَ وَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنْ عَدَنٍ تَسُوقُ النَّاسَ إِلَى الْمَحْشَرِ تَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا وَ تُقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا»**، (رَواه **الإمام أحمَدُ في مَسنَدِهِ عَنْ حُذيفة اليمَانِي و الحَديثُ صَحيحٌ**). واتە: قیامەت ڕوو ناداو بەرپا نابێت تا دە دانە نیشانەو عەلامەت پەیدا ئەبن لەم سەر عەرزەدا:

**یەکەم** پەیدابونی دووکەڵێکە کە دونیا دائەگرێت، **دوهەم** هاتنی دجـجاڵە، **سێهەم** پەیدابونی «دابة الأرض»ە، **چوارەم** هەڵگەڕانەوەی ڕۆژە بەرەو لای خۆرهەڵات کە تا نیوەی عاسمان دێت، پاشان ئەگەڕێتەوە بەرەو لای خۆرنشین و خۆرئاوا، **پێنجەم** ڕۆچوونی زەوییە لە سێ وڵات و شوێندا: یەکەم لە خۆرهەڵات، دووهەم لە خۆرنشین، سێهەم لە «جـزيرةالعـرب»، **شەشەم** هاتنەخوارەوەی حەزرەتی عیسایە عليه السلام بۆ سەرزەوی، **حەوتەم** هاتنی کۆمەڵی یەئجووج و مەئجووجە، **هەشتەم** پەیدابوونی ئاگرێکە لە خاکی عەدەن خەڵکان کۆئەکاتەوە بۆ حەشرگا وە ئەو ئاگرە لەگەڵیانە لێیان جیا نابێتەوە لە هەرکوێ شەویان بەسەردا بێت ها لەگەڵیانا، وە لە هەرکوێ نیوەڕۆ نیسراحەت کەن وا لەگەڵیاندا.

ئــەم فــەرموودەیە ئـیمام ئـەحمەدﷺ لە مـەسنەدی خـۆیدا ڕیـوایـەتی کردووە لەحوزەیفەی کوڕی یەمان وە حەدیسەکەیش سەحیحە.

وە هــەروەها پــێغەمبەری خــوا فـەرموویەتی: **«إِنَّ الْإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيباً وَ سَيَعُودُ غَرِيباً كَمَا بَدَأَ فَطُوبَىٰ لِلْغُرَبَاءِ» رُوِيَ عَنْ سَلْمَانٍ وَسَهْلِ بْنِ سَاعِدَةٍ وَ أَبِي عَبَّاسٍ وَالْحَدِيث صَحِيحٌ.** واتـە: بـەڕاسـتی دیـنی ئـسلام بـە غـەریبی و بێکەسی دەستی پێکردووە و پەرەی سەندووە، وە لە دواییشدا لە ئاخری زەماندا ئەگەڕێتەوە بە غەریب و کەمتر ئینسانێك پشتیوانی لێوە ئەکات، وەکـووو لە ئـەووەڵەوە وەهـابووە، جـا خـۆشبەختی بـۆ کـەسانێك کـە لە ئـاخردا دەس بـەدینی خـوا ئـەگرن و پـشتیوانـی لە دیـن ئـەکەن. ئـەم فەرموودەیە لە سەلمان و لە سەهل کوڕی ساعدە و لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت کراوە و ئەم فەرموودەیە سەحیحە!

وە هـەروەها پێغەمبەری خـواﷺ فـەرموویەتی **«إِنَّ بَيْنَ يَدَي السَّاعَةِ كَذَّابِينَ فَاحْذَرُوهُمْ» رَوَاهُ أَحمَدُ فِي مَسنَدِهِ وَالحَديث صَحِيحٌ.** واتــە: بــەر لە هـاتنی ڕۆژی قیامەت کۆمەڵێك لە ئـینسانەکانی درۆزن و عـەقیدە بـەتاڵ پەیدا ئەبن کە ئیددیعای زانیاری وە... ئەکەن بۆ خۆیان، خۆتان لەوانە پارێزن و بترسن لە شەڕی فیتنەی ئـەوانـە، وە خـۆتان ئـامادە بکەن بـۆ دەرخستنی عەیب و عاریان و سووك کردنی نهێنییەکانیان و بـۆ پوچەڵ کــردنــەوەی وتــەکــانیان و نــاشیرین پــیشاندانــی کــردەوەکانیان تــا ئینسانەکانی‌تر خۆیان لەوانە پارێزن،

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**«إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ لأَيَّاماً يَنْزِلُ فِيهَا الْجَهْلُ وَ يَرْفَعُ فِيهَا الْعِلْمُ وَيَكْثُرُ فِيهَا الْهَرَجُ»** رواهُ **أحمَدُ** رحمه الله **فِي مَسنَدِهِ عَن اِبنِ مَسعُودٍ وَ ابِي مُوسَى وَالحَدِيث صَحيحٌ**. واتە: لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەتدا ڕۆژانێك دێنەپێش نەزانی لەو ڕۆژانەدا زۆر ئەبێت، وەکووسپیش بۆ فێربونی زانست زۆر ئەبن و زانست نامێنێ چون زانا گەورەکان فەوت ئەکەن و بەو ئەندازە پلەی زانست دێتەخوارەوە قەتڵ و قتوڵ زۆر ئەبێت، وە لە ڕیوایەتێکی تریشدا هەر لە ڕێزمانی ئەهلی حەبەشەدا، وشەی «هَرج» بەمانا کوشت و کوشتارە. ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدی خۆیا ئەم حەدیسەی لە ئیبنو مەسعوودو لە ئەبی‌مووساوە ڕیوایەت کردووەو حەدیسەکەیش سەحیحە!

وە هەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«إِنَّ اللّهَ لايَقْبِضُ الْعِلْمَ اِنْتِزاعاً يَنْتَزِعُهُ مِنَ الْعِبادِ لٰكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ حَتّىٰ إِذا لَمْ يَبْقَ عَالِمٌ، اِتَّخَذ النَّاسُ رُؤَساءً جُهَّالاً فَسَئَلُوا فَأَفْتَوا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَ أَضَلُّوا»** رواهُ **أحمَدُ فِي مَسنَدِهِ وَالحَدِيث صَحيحٌ**!. واتە: خوای گەورە زانست هەڵناگرێ و لای نابا بەو جۆرە لە ناو ئینسانەکاندا نەمێنێ بۆ ناسینی خواو باوەڕ بە خوا بەو مانا لە دڵی بەندەکانیا لای بات، بەڵکوو خوای گەورە زانست لائەبا و نایهێڵێ بە تیاچوون و فەوتانی زانا بەرزەکان زانست ئەپێچێتەوە، واتە: زاناکان لەگەڵ زانستەکەیانا پێکەوە نامێنن تا زەمان وای لێدێت زانایەك نامێنێ ڕێنومای ئینسانەکان بکات ئەو کاتە خەڵکان بۆ خۆیان

سـەرپەرەستی نـەزان و نـەخوێندەوار ئـەکەن بـە گـەورەی خـۆیان و پرسیارِیان لێ ئـەکەن، وە ئـەواتیش حـوکم دەربـڕئەکەن بـەبێ زانیاری و زانست بەڵکوو بە ڕا و نەزەری خۆیان فەتوا دەربڕئەکەن، وە لەبەر هەوای نەفس ناتوانن بڵێن نازانین، سەر ئەنجام خۆیان گومڕائەبن، وە خەڵکیش گـومڕا ئـەکەن، وە لەڕێگەی ڕاست دووریان ئەکەنەوە. ئیمام ئـەحمەد ئـەم حـەدیسەی ڕیـوایـەت کـردووە لە مـەسنەدی خـۆیدا و حـەدیسەکەیش سەحیحە.

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**إِذَا رَأَيْتَ النَّاسَ مَرَجَتْ عُهُودُهُمْ وَخَفَّتْ أَمَانَاتُهُمْ وَكَانُوا هَكَذَا، وَ شَبَّكَ بَيْنَ أَنَامُلِهِ فَأَلْزِمْ بَيْتَكَ وَ أَمْلِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ وَخُذْ مَاتَعْرِفُ وَ دَعْ مَاتُنْكِرُ، وَ عَلَيْكَ بِخَاصَّةِ أَمرِ نَفْسِكَ، وَ دَعْ عَنْكَ أَمرَ الْعَامَّةِ**»، **رَواهُ الحَاكِمُ عَن اِبنِ عُمَرَ وَابنِ العَاصِ وَالحَديث صَحيحٌ وَ أَقَرَّهُ الذهبِيُّ وَ قَالَ المَنذريُّ وَالعَرَاقِيُّ سَنَدُهُ حَسَنٌ**. واتـە: هـەرکاتێ دیتت کە خەڵکان عەهدو پەیمانەکانیان تێکەڵ بەیەك بووە، وە ئـەمانەت داری لەلایـان زایـع بـوە، وە ئـەمانەت داری کـزو لاوازبـووە و تێك ئالآن و بـەرنامەی دینەکەیان شێوا بـە یەکدا، بـەجۆرێ کە ئینسانی ئەمین و خەیانەت کار لە یەك جیا نەئەکرانەوە، ئەو کاتە لە ماڵی خۆت وەدەرمەکەوە مەگەر بۆ زەروورەتێك نـەبێت، وە زمـانی خـۆت پـارێزەو شـتی خـراب و بـێ‌جێگەو بـێ‌کەڵکی پـێ مـەڵێ، وە لە کـارو بـاری دیـن ئەوەی کە ئەیزانی حەققە بیگرە و ئەوەی موخالیفی شەرعە دووری لێ

بگرە، ئەو کاتە سەیرکە بزانە خوا چیان لێ ئەکات وە... وە موازبی کارو باری خۆت بە، شوێنی خەڵك مەکەوە و کارو باری گشتی کە بە تۆ چارەسەر ناکرێ و چاك نابێت وێڵ کەو لە سەری مەڕۆ. ئیمام حاکم ئەم فەرموودەیە ڕیوایەت کردووە لە ئیبنو عومەر و ئیبنو لعاسەوە، وە ئیمام زەهەبیش تەسبیتی کردووە و مەنزری عەراقیش فەرموویانە سەنەدەکەی جوانە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِذَا ظَهَرَ الْبِدَعُ وَ لَعَنَ آخِرُ هٰذِهِ الْأُمَّةِ أَوَّلَهَا فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ عِلْمٌ فَلْيَنْشُرْهُ فَإِنَّ كَاتِمَ الْعِلْمِ يَوْمَئِذٍ كَكَاتِمِ مَا أَنْزَلَ اللّٰهُ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ**» **رَوَاهُ إِبنُ عَسَاكِر عَن مَعَاذ**. واتە: هەرکاتێ بیدعەو شتی نالەبار لەناو خەڵکاندا دەرکەوت، وەکوو قسە وتن بە ئەسحابی کرام، یا وەکوو تەعن لێدان لە سەلەفی سالّح و لەئاسەواریان و نەفرین کردنی ئاخری ئەم ئوممەتە بۆ ئەووەڵەکانیان، ئەوکاتە هەرکەسێ زا نستی لەلایە دەرحەق بە سەلەفی سالّح و ئاسەوارە جوانەکەیان و وەسفی چاکەیان وە... با بەیانی کات لە نێو گشتی خەڵکدا بەجۆرێ تا ئینسانی جاهل و نەزان ئاگادار ببێت لە حاڵ و وەزعی ئەوانەی کە لە گوزەشتەدا ژیاون، چون بەڕاستی کەسێ لەو کاتانەدا زانیاری خۆی بشارێتەوە وەکوو ئەوە وایە کەتمانی ئەوەی کردبێ کە نازڵ کراوەتە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم فەرموودەیە ئیبنوعەساکر لە مەعازەوە ڕیوایەتی کردووە.

وە هەروا ئەبی هورەیرە ﷺ ڕیوایەتی کردووە پێغەمبەری خوا ﷺ فـــــەرموویەتی: «**إِذا وُسِّدَ الْأَمْرُ إِلىٰ غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السّاعَةَ**» **وَالحَديث صَحيحٌ**. واتە: هەرکاتێ کاروباری دینی موسوڵمانان وەکوو خەلافەت و جێگەنشینی یا قەزاوەت و فەتوادان درایە دەستی کەسانێك کە شیاوی ئەو کارە نین وە ئەهلییەتی ئەویانە نییە، ئەو کاتە چاوەڕوانی هاتنی قیامەت بکە، چون ئەمەبە شێکەلەنیشانەکانی قیامەت.

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**بَادِرُوا بِالْأَعْمالِ فِتَناً كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِناً وَيُمْسي كافِراً وَيُمْسِي الرَّجُلُ مُؤْمِناً وَ يُصْبِحُ كافِراً يَبيعُ أَحَدُهُم دِينَهُ بِعِرْضٍ مِنَ الدُّنيا**» **رَواهُ أحمَدُ فِي مَسنَدِهِ والحديث صَحيحٌ**. واتە: عەجەلە بکەن بۆ بەجێ‌هێنانی کردەوەی چاك بەر لەوەی تاقی کردنەوەتان تووش بێت، یا بەر لەوەی کە تووشی بەلاّو موسیبەت ببن، کە ئەو بەلاّو موسیبەتە، وەکوو بەشێك لەتاریکی شەو وایە، واتە: بەر لەوەی موشکیلەی قیامەت دامانگیرتان بێت، تەلاش بکەن بۆ ئەنجامدانی کردەوەی چاك، چون زەمان وای لێ‌دێت ئینسان سەرلەبەیانی خاوەنی ئیمان و بڕوایە، کەچی بۆ ئیوارەی ئەو ڕۆژە کافر ئەبێت، یاخەیر ئیوارە ئەکاتەوە بەئیمان و بڕوایەکی چاك بەلاّم سبەینێ کە هەڵئەسێ بەکافری هەڵئەسێ، ئەمەش لەبەر گەورەیی و ئاڵۆزی فیتنەیە، کە ئینسان لە یەك ڕۆژدا چەن جار وەزعی عەقیدەو باوەڕی گۆڕانکاری بەسەردا دێت، پەنابەخوا. وە هەروا ئەوندە فیتنە زۆر ئەبێت بڕێك لە ناو

ئینسانەکانا باوەڕی دینی خـۆی بەکەمێك لە سەروەتی دونیا ئەفرۆشێ.

کە ئەم فەرموودە و چەنها فەرموودەیتر لـەم بابەتە بەڵگە و دەلیلن لەسـەر مـوعجیزاتـی حـەزرەتی مـوحەممەدﷺ وە لە ڕیـزی شـتە غـەیبییەکان ئـەژمێررێن ئـەم فـەرموودەیە ئیمام ئـەحمەد رحمه الله لە مـەسنەدی خـۆیا لە ئـیمام ئـەبیهورەیرەوە ڕیـوایـەتی کـردووە، وە حـەدیسەکەیش سەحێحە، وە هەروا پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:

**«بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ فِتَنٌ كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ» رَواهُ الحَاكِمُ عَن أَنَسٍ والحديث صَحيحٌ.**

واتە: نزیك بەهاتنی قیامەت شەڕو شۆڕو فەساد لە ئارەزوات دا و لە باوەڕ و عـەقیدەدا و لەمـەزهەب و مـەقامدا پـەیدا ئـەبێ، کـە وەکـوو بـەشێك لە تاریکی شەو وانە. ئەم فەرموودەیە حاکم لە ئـەنـەسەوە ڕیوایەتی کردووە.

وە هـەروا لەم بـاسەدا پـێغەمبەری خـواﷺ فـەرموویـەتی: **«سَتَكُونُ فِتَنٌ اَلْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ»**[1] واتـە: لەمـەودوا فـیتنەیەك پـەیدا ئـەبێت ئینسانێك کە دانیشتبێ لەو کاتەدا چاکترەو ئاسوودەترە تا ئەو کەسەی کە بـە سـەرپاوە ڕاوەسـتاوە، چـون ئـەوەی کـە ڕاوەسـتاوە ئـامادەگی هـەیە و نزیکترە کە تووشی بەڵاو فیتنە ببێت زیاتر لەو کەسەی کە دانیشتووە.

وەهـەروا پـێغەمبەری خـواﷺ ئـەفەرمێ: **«سَتَكُونُ فِتَنٌ حَمَّاءُ بُكْمَاءُ عَمياءُ مَنْ أَشْرَفَ لَهَا اسْتَشْرَفَتْ لَهُ وَ إِشْرافُ اللِّسانَ فِيهَا كَوَقْعِ السَّيْفِ» رَوَاهُ**

---

١ بوخاری و موسلیم و ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە.

اَبُوهريرة‌ﷺ واتە: لەمەو دوا فیتنەیەك پەیدا ئەبێت، خەڵكان كوێر ئەكات حەق نابینن، كەڕیان ئەكات حەق نابیسن، لاڵیان ئەكات حەق ناڵێن، هەركەسێ ئاگاداری پەیدا بكات بەسەریا و لێوەی نزیك بێتەوە ڕایئەكێشێ بۆ ناوی خۆی، زمان درێژی لەو كاتەدا وەكوو شمشێری بڕندە وایە كار ئەكات وەكوو شمشێر، ئەبووهوریرە ئەم فەرموودەیە ڕوایەت كردووە.

وە لە فەرموودەیەكی‌تردا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

«سَتَكُونُ فِتَنٌ يُصْبِحُ الرَّجُلُ فيهٰا مُؤْمِناً وَ يُمْسِي كٰافِراً إِلّا مَنْ أَحْيٰاهُ اللّٰهُ بِالْعِلْمِ» رَواهُ الطَّبرانِيُّ عَنْ أَبي أَمٰامَةَ وَ سَنَدُهُ حَسَنٌ. واتە: لەمەو دوا فیتنەیەك پەیدا ئەبێت ئینسانی خاوەن بڕوا ڕۆژی تیا ئەكاتەوە بە ئیمان و بڕوا، بەڵام ئیوارەكەی تیا ئەكاتەوە بە كافری، مەگەر كەسێ خوای گەورە بە نووری زانست دڵی نگاداری كردبێت، وە بڕوای جوان بێت، چون بەهۆی ئەو زانستەیە چاوانی دڵی ڕووناكە و خۆی ئەپارێزی لەو مەڵبەندەیە كە فیتنەی تیا ڕوو ئەدات. ئیمام تەبەڕانی لە ئەبی‌ئەمامەوە ئەم فەرموودەیە ڕیوایەت كردووە، وە سەنەدەكەیشی جوانە.

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سَتَكُونُ فِتَنٌ اَلْقٰاعِدُ فيهٰا خَيْرٌ مِنَ الْقٰائِمِ، وَالْقٰائِمُ فيهٰا خَيْرٌ مِنَ الْمٰاشِي، وَالْمٰاشِي فيهٰا خَيْرٌ مِنَ السّٰاعي مَنْ يَشْرِفُ لَهٰا تَسْتَشْرِفُهُ وَ مَنْ وَجَدَ مَلْجَئاً أَوْ مَعٰاذاً فَلْيُعِذْ بِهِ» رَواهُ أحمَدُ فِي مَسْنَدِهِ عَنْ أَبِي هريرة والحديث صَحيحٌ. واتە: لەمەودوا لە نێوان موسوڵمانانداا

ئیختیلاف دروست ئەبێت ئینسانی دانیشتوو لەو کاتەدا کە خۆی ناگیرێنێتە شت باشترە تا ئەو کەسەی کە خۆی ئەگیرێنێتە شت و ڕاوەستاوە. واتە: ئینسانێ دانیشتوو بێوەیترە لەو فیتنەیە تا ئەو کەسەی کە ڕاوەستاوە، وە ئینسانی ڕاوەستاو لەو کاتەدا باشترە تا ئینسانێ کە بەرەو ڕووی ئەو فیتنەیە ئەڕوا، وە ئینسانێ کە بەرەو ڕووی ئەو فیتنەیە ئەڕوا باشترە و بێوەیترە لەو کەسەی کە تەلاش و کۆششی بۆ ئەکات، وە هەرکەسێ ئاگاداری پەیداکرد بەسەریا و ڕووبەڕووی چوو ئەکەوێتە ناو ئەو فیتنەیە و ئەیکێشێ بۆ ناو خۆی، جا هەرکەسێ لەو کاتەدا پەناگایەکی بۆ پەیدابوو یاجێگای خۆپاراستنێکی دەس کەوت با بڕوا پەنای بۆ ببات و خۆی بپارێزێ.

ئەمە ئیشارە و ئاماژەیە بۆ جیاوازی و گۆڕانکاری ئەو فیتنەیە کە ئینسان خۆی لێ پارێزی و دووری لێ بگرێ. ئیمام ئەحمەدﷺ لە مەسنەدەکەیا ئەم حەدیسەی لە ئەبی‌هورەیرەوە ڕیوایەت کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحیحە.

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**سَتَكُونُ بَعْدِي هَنَاتٌ وَهَنَاتٌ فَمَنْ رَأَيتُمُوهُ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ أَو يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ أَمْرَ أُمَّـةَ مُحَمَّدٍ ﷺ كَائِناً مَنْ كَانَ فَاقْتُلُوهُ فَإِنَّ يَـدَ اللهِ مَـعَ الْجَمَاعَةَ، وَ إِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ يَرْكُضُ**» **رَواهُ اِبنُ حَبَّان عَنْ عَرجَفَةَ والحديث صَحيحٌ.** واتە: لەمەو دوا لە پاش من چەن شتێ ناشیرین و نابار و ناپەسەند پەیدا ئەبن و

دروست ئەبێت و ڕوو ئەدات، جا ئێوە هەر کەسێکتان دی کە جیا ئەبێتەوە لە خەتتی ئەسحاب و سەلەفی ساڵح و جەمعی موسوڵمانان، ئەوە بە شمشێر بدەن لە گەردنی و بیکوژن چون قودرەتی خوا هەموو کاتێ لەگەڵ جەماعەتدایە، واتە: حەق وا لەگەڵ ئەوانەدا کە پەیڕەوی لە بەرنامەی خواوە ئەکەن با بەسوورەتی زاهیریش کەم بن، وە شەیتان وا لەگەڵ ئەوانەدا کە لە کۆمەڵگا جیا ئەبنەوە و شوێنی حەق ناکەون و هەڵپەڕکێ ئەکات و خۆشحاڵە. ئەم فەرموودەیە ئیبنو حەببان لە عەرفەجەتەوە ڕیوایەتی کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحێحە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «**سَيَكُونُ أُمَرَاءُ تَعْرِفُونَ وَ تُنْكِرُونَ، فَمَن نَابَذَهُمْ نَجَا، وَمَنِ اعْتَزَلَهُم سَلِمَ، وَمَنْ خَالَطَهُمْ هَلَكَ**» **رَوَاهُ الطَّبَرانِيُّ عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ والحديث صَحيحٌ**. واتە: لەمەو دوا چەن حاکمێك و کاربەدەستێك پەیدا ئەبن ئێوە ڕازی ئەبن بە بڕێك لە وتارو کرداریان، چون تا حەددێك موافق و بەرابەر بە شەریعەتی خوان، بەڵام بڕێکی‌ترتان بەلاوە ناخۆش و ناپەسەندە، چون موخالیفی شەریعەتن، هەرکەسێك بە زمان بەرنگاریان ببێت ڕەستگار ئەبێت لە نیفاق و زمان چەوری، وە هەرکەسێ دووریيان لێ بگرێ و بەدڵ ناخۆشی بوون بێوەی ئەبێت لە سزا و تۆڵەی لەسەر تەرکی مونکەر، وە هەرکەسێ تێکەڵییان بکات و بەدڵ پێیان ڕازی بێت ئەوە تیا ئەچێت و نابوود ئەبێت، وە ئەکەوێتە ناو بەد بەختی ئاخێرەتەوە چون ڕازی بووە بە کرداریان، و چووەتە ناو ڕیزی

ئەوان ئەم فەرموودەیە ئیمام تەبەرانی لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتی کردووە وە حەدیسەکەیش سەحیحە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**سَيَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي يُحَدِّثُونَكُمْ بِمَا لَمْ تَسْمَعُوا بِهِ أَنْتُمْ وَلَا آبَائُكُمْ فَأَيَّاكُمْ وَ إِيَّاهُمْ**» **رَوَاهُ مُسْلِمٌ عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ**. واتە: لەمەو دوا لە ئاخری زەماندا بڕێك لە ئینسانەکان لە ئوممەتی من پەیدا ئەبن قسە ئەکەن ئێوە وا گومان ئەبەن، وە وا ئەزانن کە ئەوانە زانان قسەتان بۆ ئەکەن بەڵام جۆرە قسەیەك ئەکەن کە ئێوە خۆتان نەتانبیستووە، باوك و باپیریشتان نەیان بیستووە، چون ئەو قسانە درۆن و ئەحکامی دروست کراو و باوەڕی پۆچەڵن، جا لەسەر ئێوەیە دوریان لێ بگرن و نەفسی خۆتان لەوانە دووركەنەوە. ئەم فەرموودەیە ئیمام موسلیم لە ئەبی هوڕەیرەوە ڕیوایەتی کردووە.

هەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**سَيَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ دِيدَانُ القُرَاءِ، فَمَنْ أَدْرَكَ ذٰلِكَ الزَّمَانَ فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللّٰهِ مِنْهُمْ**» **رَوَاهُ أَبُونَعيم فِي الحُلْيَةِ والسَّنَدُ ضعيفٌ**. واتە لە ئاخر زماندا ئینسانهایەك پەیدا ئەبن وەکوو کرمی ناو پێستە وانە بە زۆر خۆیان ئەبەنە سەر سوورەت و سیمای پیاوچاکان کەچی لە ڕاستیا لە چاکە دوورن هەرکەسێ لەزەمان و کاتی ئەواندا ژیا با پەنا بگرێ لەخوای گەورە لەشەڕی ئەوان.

وە لە شەرحی مەناویدا بە سەر «فەیزولقەدیر»ەوە لەسەر ئەم فەرموودەیە زۆرێ لە وەسفەکانی ئەو کۆمەڵ و تاقمەی باس کردوون

کـە ژمارەی حەدیسەکە ئەبێتە چوار هەزار و حەوت‌سەدو حەفتاو نۆ، جا هەرکەسێ پێی‌خۆشە زیاتر ئەو تاقمانە بناسێ با بڕوا لەو کتێبەدا سەیری ئـەو حـەدیسە بـکات، وشـەی دیـدان لە حـەدیسەکەدا بـە مـانا کـرمەکانە، چـون ئـەم وشـەیە جـەمعی «دود»ە کە بـە مـانا کـرمە، وە وشـەی «الفراءِ» بـە مــانا پــێستەکانە، چــون جــەمــعی «فــروة»ە کــە بــە مــانا پــێستەیە، مـەقسوودیش لەو تـاقم و کۆمەڵە ئینسانانە، ئەوانـەن کـە فـاسدو دوور لە دینن لە ناو هۆز و بە ی خۆیاندا.

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**سَيَأْتِـي عَلىٰ أُمَّتِي زَمٰانٌ يُخَيَّرُ فِـيهِ الرَّجُلُ بَيْنَ الْعِجْزِ وَالْفُجُورِ فَمَنْ أَدْرَكَ ذٰلِكَ الزَّمٰانَ فَلْيَخْتَرِ الْعِجْزَ عَلَى الْفُجُورِ**» **رَواهُ الحَـاكِمُ عَن اَبِي هُرَيرةَ** رضي الله عنه **والحديث صَحيحٌ.**

واتـە: دێت بـەسەر ئوممەتی مـندا زەمانێك و کـاتێك کـە ئینسانەکان ئازاد ئەکرێن لە نێوان دوو شت دا، **یەکەم** عیبادەت بکات و ناتەوان بێت بۆ بڕەکارێك، کـە سەختە ئەنجامدانی، **دوهەم** ئەمە کە لە فەرمانی خوا بـچێتەدەر بـەهۆی فـیسق وفـجور و مـەشغوڵ بـە نـافەرمانی بـێت، جـا هـەرکەسێ گـەیشتەئەو زەمـانە واجـبە لە سـەری نـاتەوانـی هـەڵبژێرێ بـە خاتری پاراستنی دینەکەی، وە ئەو کەسانیشە کە ئەم فەرمانی هەڵبژاردنە دەرئەکەن بۆ خەڵك حاکمانی وەختن.

وە هــەروەها پــێغەمبەری خــو افــەرموویەتی: «**سَيَأْتِي عَلىٰ أُمَّتِي زَمٰانٌ يَكْثُرُ فِيهِ القُرّاءُ وَيَقِلُّ الْفُقَهٰاءُ وَ يُقْبَضُ الْعِلْمُ وَ يَكْثُرُ الهَرَجُ (القَتلُ) ثُمَّ يَأْتِي**

**بَعْدَ ذٰلِكَ زَمٰانٌ يَقْرَءُ الْقُرْآنَ رِجٰالٌ لٰايُجٰاوِزُ تَرٰاقِيَهُمْ ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذٰلِكَ زَمٰانٌ يُجٰادِلُ الْمُشْرِكُ بِاللّٰهِ الْمُؤْمِنَ فِي مِثْلِ مٰايَقُولُ» رَواهُ الطَّبَرانِيُّ عَنْ أبِي هُرِيرةَ والحديث صَحيحٌ!**

واتە: لەمەو دوا دێت بەسەر ئوممەتی مندا زەمانێك قورئان خوێن لەو زەمانەدا زۆر ئەبن واتە لەبەری ئەكەن بەڵام لە ماناكەی تێ‌ناگەن، وە ئەوكەسانە كە زانای ئەحكامی شەرعن كەم دەبنەوە و نامێنن و زانست بە تیاچوون و مردنی زاناكان نامێنێ و كوشت و كوشتار زۆر ئەبێ پاش ئەوە زەمانێك دێت پیاوانێ لە ئوممەتی من هەن قورئان ئەخوێنن، كە ئەو قورئانە لە قورگیانا ناچێتە خوارەوە. واتە: فەقەت بەزمان جاری ئەكەن دڵی پێنادەن، پاش ئەوەیش زەمانێك دێتەپێش كەسێ كە موشریكە بەخوا، كێشەو موجادەلە ئەكات لەگەڵ خاوەن بڕوادا بەو بەڵگەو دەلیلانە كە خاوەن بڕواكە پیشانیان ئەدات، وە بەرانبەری ئەكات لەگەڵ ئەو خاوەن بروانەدا بەو بەڵگانە، وە زاڵ ئەبێت بەسەریانا، بەڵام بەڵگەكانی ئەو موشریكەیە بەتاڵن و بەڵگەكانی خاوەن بڕواكە ڕاست و سەحیحن. ئیمام تەبەرانی ئەم حەدیسەی لە ئەبیهورەیرەوە ڕیوایەت كردووە، وە حەدیسەكەیش سەحێحە.

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**سَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ رِجٰالٌ لٰايُجٰاوِزُ حَنٰاجِرَهُم، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمٰا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ**» **رَوٰاهُ الأَرْبَعَةُ عَنْ عٰائِشَةَ رضي الله عنها والحديث صَحيحٌ**. واتە: كۆمەڵێك لە پیاوان

لەمەودوا پەیدا ئەبن، قورئان ئەخوێنن، بەڵام لە قورگیانا ناچێتە خوارەوە.

ئیمام نەوەوی ئەفەرمێ: مەقسوود ئەوەیە ئەوانە بەشێکیان لەجەزاو پاداش، کە لە دڵیاندا تەئسیر دانێ نییە، مەگەر ئەوەنەبێت کە بەسەر زمانیاندا ئەڕوا و جاری ئەبێت، ئەوانە لە هێڵی دین ئەچنەدەرەوەو خارج ئەبن لە بەرنامەی دین، وەکوو تیر لە کەوان ئەچێتەدەر، ئەم فەرموودەیە چواریار لە حەزرەتی عائیشەوە رضي الله عنها ریوایەتیان کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحیحە.

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«كَيْفَ بِكُمْ إِذَا كُنْتُمْ مِنْ دِينِكُم كَرُؤْيَةِ الْهِلَالِ» رَواهُ ابنُ الْعَسَاكِر عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ والحديث ضعِيفٌ.** واتە: چۆنە وەزع و حاڵی ئێوە لەکاتێکدا کە ئەحکامی دینەکەتان لە ئێوە پەنهان بووە لەبەر جەهل و نەزانی نایبینن، وە پەردە هاتووە بەسەر دڵتانا، کەچی وەکوو مانگی شەوی چواردە ڕۆشن و روونە. ئیبنوعەساکر ئەم فەرموودەیە ریوایەت کردووە لە ئەبی هورەیرەوە بەڵام ئەم فەرموودەیە لاوازە.

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُمْ وَ إِمَامُكُمْ مِنْكُمْ» رَواهُ اِبْنُ عَسَاكِرَ عَن أَبِيهريرة!.** واتە: چۆنە حاڵ و وەزعی ئێوە لەکاتێکدا کە حەزرەتی عیسا عليه السلام دێتەخوارەوە بۆ ناو ئێوە کە ئێوە ئەو ئیفتیخارتانە هەیە لە پشت سەر ئێوەوە نوێژ ئەکات و ئەبێتە مەئمومی ئێوە، یا ئێوە لە پشت سەر ئەو پێغەمبەرە نوێژ ئەکەن، کە

ئەمە خۆی جێگای شانازییە بۆ ئوممەتێك کە چاکترین ئوممەتن.

هەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لَتَتَّبِعَنَّ سُنَنَ مَنْ قَبْلَكُمْ شِبْراً بِشِبْرٍ وَ ذِرَاعَاً بِذِرَاعٍ حَتَّىٰ لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ دَخَلَ جُحْرَ ضبّ لَدَخَلْتُمْ وَحَتَّىٰ لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ جَامَعَ زَوْجَتَهُ بِالطَّرِيقِ لَفَعَلْتُمْ**» **رواهُ الْحَاكِمُ عَنْ إِبنِ عَبّاسٍ والحديث صحيحٌ**. واتە: ئێوەی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ شوێن ڕێگەو ڕەوشتی کەسانێ ئەکەون کە لەپێش ئێوەدا بوون و ژیاون، عەرزی حەزرەتیان کرد قوربان فەلەو جووەکانن؟ فەرمووی ئەی کێن. بەڵێ فەلەکان و جووەکانن ئێوە لە یاساو ڕەوشتا شوێنکەوتوویان ئەبن، واتە: شوێنکەوتنی ئێوە لەکردارو ئەنجامدانی تاوان و موخالەفەی یاسای خواییدا وەجەب بە وەجەب و گەز بە گەز ئەبێت، بەو مانا بێ حەددو مەرز لەدوای ئەوان ئەڕۆن، واتە ئەگەر ئەوان لەو شتانەیدا کە دایریان کردووە هەر جۆر بڕۆن ئێوەیش وا ئەڕۆن موو بە موو شوێنیان ئەکەون، بۆ نموونە ئەگەر یەکێ لەوان بچێتە ناو لانەی سوسمار ئێوەیش شوێنکەوتووی ئەبن، وە هەروەها ئەگەر یەکێ لەوانە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لە ڕێگای عمومیدا ڕەفێقی هاوسەرەکەی بکات ئێوەیش شوێن ئەو کاریانە ئەکەون.

ئەمەبەومانایە کە ئێوە لە ئەوپەڕی هێزو تواناداشوێنیان ئەکەون کە ناشوکری نەبێت ئێستە وای لێهاتووە ئیمام حاکم لەئیبنو عەبباس ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحیحە.

وەهەروا پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «**لَتَسْتَحِلَنَّ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ بِاسْمٍ يُسَمُّونَهَا إِيَّاهُ» رَوَاهُ أحمَدُ عَنْ عُبَّادَةَ ابْنِ الصَّامتِ**ﷺ. واتە: بەڕاستی کۆمەڵێ لە ئوممەتی من شەراب بە حەلاڵ دەزانن وە پێیان وایە ئەو عەرەق و شەرابەی کە خوا مەنعی کردووە لە موسوڵمانان بەهۆی گۆڕینی ناوەکەیەوە لەلایەن ئینسانەکانەوە حەلاڵەو مەنع نییە، ئەمەیشە هەڕەشەیە لەو کەسانە کە ئەو کارە ئەکەن و شتی حەرام بەحەلاڵ دەزانن، ئەم فەرموودەیشە ئیمام ئەحمەدﷺ لە مەسنەدی خۆیا لە عوببادەی کوڕی صامتەوە ڕیوایەتی کردووە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لَيَنْتَقِضَنَّ عُرَى الْإِسْلَامِ عُرْوَةً عُرْوَةً فَكُلَّمَا انْتَقَضَ عُرْوَةً تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا فَأَوَّلُهُنَّ نَقْضاً الْحُكْمُ وَ آخِرُهُنَّ الصَّلاةُ» رَواهُ أحمَدُ فِي مَسنَدِهِ عَن أَبِي أَمَامَةَ!**

واتە: تێك ئەدەن و هەڵدەوەشێننەوە لە بەرنامەکانی دین وە لە بەشەکانی دین بەش لە دوای بەش، وە جێگا دەس لە دوای جێگا دەس، وە هەرکاتێ جێگا دەسێکیان تێکداو هەڵوەشاندەوە خۆیان هەڵدەسپێرن بە یەکێتردا بۆ ئەوەی تێکی بدەن و ئەووەڵ شتێك کەتێکی ئەدەن حوکم کردنە، واتە حوکمی خوا جێ بەجێ ناکرێت، وە دووهەم شت کە نامێنێ نویژکردنە، واتە: نوێژ کردن هەڵدەگیرێ و خەڵکان لە نوێژکردن دوور ئەکەونەوە، ئەگەربیشیکەن بە ڕیاو تەزویر ئەنجامی ئەدەن. ئەم فەرموودەیە ئیمام ئەحمەدﷺ لە مەسنەدەکەی خۆیا لە ئەبی ئەمامەوە

ڕیوایەتی کردووە!

وە هەروها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی «**مِن أَشْراطِ السّاعَةِ اَلْفَحْشُ وَالتَّفَحُّشُ وَ قَطيعَةُ الرَّحِمِ وَ تَخْوِينُ الأَمِينِ وَائْتِمَانُ الْخائِنِ**» **رَواهُ الطبَرانِيُّ عَنْ أَنَسٍ وَالْحديث حَسَنٌ**. واتە: لە نیشانەو عەلامەتەکانی قیامەتە، بەدگۆیی کردن و بەدگۆیی وتن لە ناو خەڵکدا پەیدائەبێت، وە خەڵکان قەتعی سیلەی ڕەحم ئەکەن سەر لەخزمانی خۆیان نادەن، وە ئینسانی ئەمین بەخەیانەتکار ئەدرێتە قەڵەم، وە ئینسانی خائن بە ئەمین ئەناسرێت. ئیمام تەبەڕانی ئەم فەرموودەیە لە ئەنەسەوە ڕوایەت کردووە وە حەدیسەکەیش جوانە.

وەهەرواپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لَيَهْبِطَنَّ عِيسَى ابْنُ مَريمَ** ؈ **حَكَماً وَ إِماماً مُقْسِطاً وَ لَيَسْلُكَنَّ فَجّاً فَجاً حَاجّاً أَوْ مُعْتَمِراً وَلْيَأْتِيَنَّ قَبْرِي حَتّىٰ يُسَلِّمُ عَلَيَّ وَلأَرُدَّنَّ عَلَيْهِ**» **رَوَاهُ الحَاكِمُ عَن أَبِي هريرة والحديث صَحيحٌ**! واتە: نزیکە کە حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم؈ بێتەخوار کە حاکمێکی عادل و پێشەوایەکی دادگەر بێت لە نێوان ئێوەدا و حوکم بکات بەو شەریعەتەی پێغەمبەری خوایە ﷺ نەك بەو شەریعەتەی کە خۆی لە دەورانی خۆیدا بۆی هاتبوو، وە ڕێگەکان ئەپێوێ دێت حەجج و عەمرە بەجێ ئەهێنێ و دێتە سەر گۆڕی من و سڵاوم لێ ئەکات و منیش وڵامی سڵاوەکەی ئەدەمەوە.

ئیمام قورتوبی فەرموویەتی: ژن ئەهێنێ وە منداڵیشی ئەبێت لە دوای

ئەوە فەوت ئەکات و لە ڕەوڵەی پیرۆزدا دەفنی ئەکەن. حاکم لە ئەبی هورەیرەوە ئەم فەرموودەیە ڕیوا یەت کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحیحە.

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَمُرَّ الرَّجُلُ فِي الْمَسْجِدِ وَ لَا يُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ وَأَنْ لَا يُسَلِّمَ الرَّجُلُ إِلَّا عَلَى مَنْ يَعرِفُ وَأَنْ يبْرِدَ الصَّبِيُّ الشَّيْخَ» رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ عَنْ إِبنِ مَسْعُودٍ والحديث ضعيفٌ.** واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەتە ئەمە کە ئینسانەکان ئەچنە ناو مزگەوت دوو ڕەکات نوێژی سەوقات و دیاری مزگەوت ناخوێنن، وە هەروا لە نیشانەکانی قیامەتە کە ئینسانەکان لە نێوان خۆیاندا سلاو ناکەن لە یەکتر مەگەر لە کەسێك کە بیناسن، واتە کەسێ نەیناسن سلاوی لێ ناکەن، وەهەروا لەنیشانەکانی قیامەتە کە منداڵ و بێتەمەن ئینسانی پیر ئەنێرێ بەشوێن نیازمەندییەکانیا و بۆ کارو بارەکانی خۆی. ئیمام تەبەڕانی ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەت کردووە، وە حەدیسەکەیش زەعیفە.

وە هەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لَاتَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ حَتَّىٰ يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ» رَوَاهُ الحَاكِمُ عَن عُمَر رضي الله عنه والحديث حَسَنٌ!** واتە: کۆمەڵێك لە ئوممەتی من لەسەر حەق ئەمێننەوەو زاڵ ئەبن و کۆمەکیان ئەکرێ و لانادن لەسەر ئەو بەرنامە تا فەرمانی خوا بۆ بەرپابونی ڕۆژی قیامەت دێتەبەرەوە و قیامەت هەڵدەستێ. ئەم

فەرموودەیە ئیمام حاکم لەحەزرەتی عومەرەوﷺ ڕیوایەتی کردووە و سەنەدەکەیشی جوانە.

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«لاتَذْهَبُ الدُّنْيَاحَتَّىٰ تَكُونَ لِلُكَّعِ بْنِ اللُّكَّعِ»، رَوَاهُ أحمَدُ عَن اَبِي هريرة والحديث حَسَنٌ.** واتە: دونیا کۆتایی پێ نایت و تەواو نابێت تا هەمووەکەی ئەبێتە بەشی کەسانێ، کە بەخیلی کوڕی بەخیلن یا کافری کوڕی کافرن. ئەم فەرموودەیە ئیمام ئەحمەد لە ئەبی‌هورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە و حەدیسەکەیش جوانە.

وەهەروا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«لَاتَبْكُوا عَلَى الدِّينِ إِذَا وَلِيَهُ أَهْلُهُ وَلٰكِنْ أبكُوا عَلَيْهِ إِذَا وَلِيَهُ غَيرُ أَهلِهِ» رَوَاهُ أحمَدُ عَن اَبِي اَيُّوبٍ وَ الحَديث صَحيحٌ!** واتە: کاتێ دین و یاساکەی لە دە ستی ئەهلی دینابوو، وە پارێزگاریان لێوەکرد، بۆی مەگریین بەڵام کاتێ کەوتە دەستی کەسانێ کە شیاوی دین نین و عەمەڵی پێ‌ناکەن ئەو وەختە بۆی بگریین. ئەم فەرموودەیە ئیمام ئەحمەدﷺ لە ئەبی ئەییوبەوە ڕیوایەتی کردووە و حەدیسەکەیش سەحیحە.

وەهەرواپێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«لَاتَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّىٰ يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ أَخِيهِ فَيَقُولُ يَالَيْتَنِي كُنْتُ مَكَانَهُ» رَوَاهُ أحمد عَنْ أَبِي هريرة، والحَديث صَحيحٌ!** واتە: قیامەت بەرپا نابێت تا زەمانە وای لێ دێت ئینسان ئەچێ بەلای گۆڕی برای موسوڵمانیا، ئەڵێ: خۆزگایە من لەجێ تۆدا بوایم، ئەمەمانای ئەوەیە خەڵکی زەمانە خراب ئەبن و ئینسان تۆزێ

خاوەن دین بێت ئاواتی مردن ئەخوازێ کە خوا زوو بە زوو بیکوژێ ئیمام ئەحمەدﷺ ئەم فەرموودەیە لە ئەبی هورەیرەوە ڕیوایەت کردووە. وە حەدیسەکەیش سەحێحە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لاتَقُومُ السّاعَةُ حَتَّیٰ یَخْرُجَ سَبْعُونَ کَذّاباً**» **رَواهُ الطَبَرانيُّ عَنْ اِبنِ عُمَرَ** رضي الله عنه **والحدیث صَحیحٌ!** واتە: قیامەت هەڵناسێ و بەرپانابێت تا حەفتا نەفەر پەیدا ئەبن کە ئیددیعای پێغەمبەرایەتی ئەکەن و واگومان ئەبەن کە نوێنەری خوان، کەچی لەڕاستیدا درۆ ئەکەن، ئەم فەرمودەیە ئیمام تەبەرانی لە کوڕی حەزرەتی عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە، وەحەدیسەکەیش سەحیح و جوانە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «**یَأْتِي عَلَی النَّاسِ زَمَانٌ اَلصَّابِرُ فِیهِمْ عَلیٰ دِینِهِ کَالْقَابِضِ عَلَی الْجَمْرَةِ**» **رَوَاهُ الْترمِزِيُّ عَن اَنَسٍ وَالسَّنَدُ صَحیحٌ.** واتە: لە ئاخر زەماندا ئەکەونە ناو چەرخ و خولێکەوە کاتێك دێت بەسەریانا هەرکەسێ لەناو ئەواندا خۆی بگرێ لەسەر دینکەی و ڕای‌بگرێ، وەکوو ئەوە کە پشکۆیەکی لەئاور هەڵگرتبێ وایە، واتە: هەڵگرتنی پشکۆی ئاور چەندە سەختەو گرانە، ڕاگرتنی دینیش بەو ئەندازە سەخت و گران ئەبێت لەو زەمانەدا. ئیمام ترمزی ئەم فەرموودەیەی لە ئەنەسەوە ڕیوایەت کردووەو سەنەدی حەدیسەکەیش سەحیحە و جوانە.

وە هەروەها حەزرەتی موحەممەد ﷺ فەرموویەتی: «**یَذْهَبُ الصَّالِحُونَ الْأَوَّلُ فَالْأَوَّلُ وَیَبْقَی حُثَالَةٌ کَحُثَالَةِ الشَّعیرِ أَوِ التَّمْرِ لَایُبَالِهِمُ اللّٰهُ بَالَهُ**» **رَوَاهُ**

**أحمدﷺ في مَسنَدِهِ عَن مَرداسِ الأسلمِيِّ والحديث صَحيحٌ.**

واتە: چین لە دوای چین پیاوە ساڵحەکان ئەڕۆن و فەوت ئەکەن ئەمێننەوە پیاوە خراپەکان، وەکوو بنەخاڵەی جۆ و خورما ئەوانەی بەدەردی خواردن ناخۆن، خوای گەورە هیچ وەزن و قیمەتێك بۆ ئەوانە دانانێت، وەگوێیان پێ نادات. ئەم فەرمودەیە ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدی خۆیا لەمەرداسی ئەسلەمیەوە ڕیوایەتی کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحیحە.

وە هەروەهاپێغەمبەری خواد.فەرموویەتی: «**يَقْتُلُ اِبْنُ مَرِيَمَ الدَّجَّالَ بِبَابِ لُدِّ**» **رَواهُ التِّرمِزِيُّ عَنْ مَجْمَعِ بْنِ جَابِرٍ والحديث صَحيحٌ.** واتە: حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەمعليه السلام دەججاڵ ئەکوژێت لە «بابُ لد»دا، کێوێکە لە شامدا یا لە فەلەستیندا، ئەمەیش لە دوای نازڵ بوونی حەزرەتی عیسا لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی ڕوو ئەدات، ئەم فەرموودەیە ئیمام ترمزی لە مەجمەعی کوڕی جابرەوە ڕیوایەتی کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحێحە.

وە هەروا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**يَنْزِلُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ**عليهما السلام **عِنْدَ مَنَارَةِ البَيْضَاءِ شَرْقِيِّ دِمِشْقٍ**» **رَوَاهُ الطبَرانِيُّ عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ والحديث صَحيحٌ.** واتە: لە ئاخر زەماندا حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەمعليه السلام لە عاسمانەوە دێتەخوار بۆ سەر زەوی لە شەرقی شاری دیمیشقا لە خاکی سورییە لەپاڵ مەنارەی سپیدا، کەئەم مەنارە لە شەرقی شاری دیمیشقا قەراری گرتووە.

وە حیکمەت لە نازڵبوونی حەزرەتی عیسادا ؑ بۆ ڕەددە لەسەر یەهوودییەکان کە ئەڵێن لە وەختی خۆیدا حەزرەتی عیسا لە دار دراوە و کوژراوە، ئەم فەرموودەیە ئیمام تەبەڕانی لە ئەوسی کوڕی ئەوسەوە ڕیوایەتی کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحیحە.

وە هەروەها حەزرەت موحەممەد ﷺ فەرموویەتی: «**يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ عُبَّادٌ جُهَّالٌ وَقُرَّاءٌ فَسَقَةٌ**»، **رَوَاهُ اِبنُ حَبَّانٍ وَالحَاكِمُ عَن أَنَسٍ والحديث صَحيحٌ**. واتە: لە ئاخر زەماندا ئینسانانێك پەیدا ئەبن کە خۆیان زۆر بە عابیدو زاهید ئەزانن، بەڵام لەڕاستیدا جاهیل و نەزانن، وە هەروا قورئانخوێن زۆر ئەبن بەڵام فاسق و تاوانبارن قورئانەکەیان لە دڵیاندا ئەسەری دانەناوە فەقەت ڕواڵەتییە، ئەم فەرموودەیە ئیبنوحەببان و حاکم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە، وە حەدیسەکەیش سەحیحە!

وە هەروەها لە گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەژمێررێت بەیانکردنی ئەوە کە بزانرێت ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە هەموو عەرەب زمانێك قسەڕەوان و فەسیحترو بەلیغتر بووە، وە وشەی کامڵ و گشتی و تەواو بەو عەتاکراوە و بەخشراوە، لە بواری بارهێنان و ئەدەب و پاڵفتەکردنی دڵ و دەروونەکاندا، وە بەیانکردنی ئەمانەش بۆ خەڵکان بۆ کەڵك وەرگرتن و ڕاهنمایی و شارەزاکردنە، چون بەشێکن لەحێکمەتی خوایی کە حیکمەتی خوایی بۆ هەر خاوەن بڕوایە بەتایبەت کە لە سەرچاوەی مەعدەنی ئەدەبەوە کە ڕەسوولەڵلایە وەربگیرێ، وەجەنابی

شێخ یووسفی نەبهانی باسی خۆشەویستی و خۆشویستنی لە کتێبی شەمائلدا، کۆ کردووەتەوە منیش لەوێوە لەسەر شێوازی ئەلف بای عەربی نەقڵم کردووە و وەرم گرتووە تا ئێوەیش کەڵك و سوودی لێوەربگرن، بەیارمەتی خوا.

# «جوامع الكلم»

## پیتی ئەلف

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «أُوتِيتُ جَوامِعَ الْكَلِمِ»[1] واتە: بە من عەتاکراوەو بەخشراوە لە لاینی زاتی خواوە بەیانێك و کەلامێك، کە خێرو قازانجی بۆ هەردوو دونیای ئینسانەکان تێدایە، وە هەروەها ئەفەرمێ: «اِتَّقِ اللّٰهَ فِي عُسْرِكَ وَيُسْرِكَ»[2] واتە: لە خوا بترسەو تەقوا و خۆپارێزیت ببێت لە کاتی تەنگی و چەڵەمەداو لە کاتی خۆشی وئاسایشدا. کەواتە ئینسان نابێ لەهیچ کاتێکدا غافڵ و بێموبالات بێت لەبەرانبەر فەرمان و یاسای خواداوە، وە هەروەها ئەفەرمێ: «اِتَّقُوا مَواضِعَ التُّهَمِ»[3] واتە: خۆتان پارێزن و دووری بگرن لەو جێگانەیدا کە ئینسان مەترسی هەیە تۆمەت و قسەی ناڕەوای لێ بدرێ هەروەها فەرموویەتی: «أَتَمُّكُمْ عَقْلاً أَشَدُّكُمْ

---

١. موسنەدی ئیمام ئەحمەد: (١٧٣/١٥).

٢. جامع الكبير: (١/ رقم الحديث: ٧٤٤).

٣. البخاري.

خَوْفاً»[١] واتە: عاقڵترینی ئێوە کەسێکە زۆرتر مەترسی و خەوفی خوای لە دڵدا بێت. کەواتە هەرکەسێ ترسانی لەخوا زیاتر بێت لە باقی ئینسانەکان ئەوە زۆر بە عاقلتر دائەنرێ و لە ڕیزی عاقڵاندا ئەژمێررێت.

وە هەروەها فەرموویەتی: «اِجتَنِبوُا الخَمْرَ فَإِنَّهَا مِفتَاحُ كُلِّ شَرٍّ»[٢] واتە: خۆتان بپارێزن و دور کەونۆ لە هەرشتێ کە سەرخۆشکەرو مەستکەرە لە هەر نەوعێکی بێت، لە دروست کردنی، یا فرۆشتنی یا هەڵگرتنی بەڵکوو هەڵگرتن و تەماشاکردنیشی وە... چون بەڕاستی شەراب کلیل و هەڵگری هەموو شتەخرابەکانە، وە هەڵگری هەموو بەدبەختییەکە بۆ ئینسانەکان!

وە هەروا فەرموویەتی: «اَلْأَجْرُ عَلىٰ قَدَرِ النَّصَبِ»[٣] واتە: جەزاو پاداشی هەرئینسانێك لە قیامەتدا بەگوێرەی سەهم و تێکۆشانیەتی لە دونیادا، کەواتە: سەهم و تەلاشی لە دونیادا چۆن بووبێت پاداش و جەزاکەی بەو ئەندازەیە ئەبێت لە ڕۆژی پەسلاندا.

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اجْمِلُوا فِي طَلَبِ الدُّنْيَا فَإِنَّ كُلاً مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ»[٤] واتە: ئیوە بگەڕێن بەشوێن ڕزق و ڕۆزیا

---

١. بغية الحارث: (٢٥٦/١).

٢. المستدرک علی الصحیحین للحاکم عن عثمان بن عفان.

٣. بخاري.

٤ . سونەنی ئیبنو ماجە : (٣٦٠/٦). وە سونەنی بەیهەقی: (٤٦٦/٥).

ئەوەی کە حەڵاڵە و پاکە، وە تەلاشی بۆ بکەن چون بەڕاستی هەریەکە لە مەخلووقی خوا ئامادەکراوە بۆی ئەوەی کە بۆی نووسراوە و بۆی دیاری کراوە لە ڕزق و ڕۆزی، خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی هەر گیانلەبەرێکی لە ئەزەلدا دیاری کردووە بەرودوا، یا زیادوکەم ناکات، چۆن لە عیلم و ئیرادەی خوای گەوردا گوزەرابێت وا ئەبێت وە لە وەختی خۆیدا دێتەجێ، وە هەروەها فەرموویەتی: «اَلْإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللّٰهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ»[1] واتە: کاری چاك و پەسەند ئەوەیە کاتێ کە تۆ عیبادەتی خوای گەورە ئەنجام ئەدەیت و نیایشی ئەکەیت وابزانی کە تۆ لەو کاتەدا خوای گەورە ئەبینیت و لەبەر چاوت دایە، جا ئەگەر تۆ توانای ئەوتە نییە خوای گەورە ببینیت لەبەر ئەوە، کە دیتنی خوای گەورە لە دونیادا بۆ کەس جۆرنەبووە، غەیری حەزرەت موحەممەد نەبێت ﷺ خۆ خوا تۆ ئەبینێت وە چاوی لە تۆیە، وە بەسەر وەزعی تۆدا ئاگادارە.

وە هەروەها فەرموویەتی: «اِخْتِلَافُ أُمَّتِي رَحمَةٌ»[2] واتە: جیاوازی ڕاو نەزەری موجتەهیدانی ئوممەتی من لە مەسائلی ئیجتیهادی و فروعیدا لە وانەی کە جێگای ڕاو نەزەری موجتەهیدینە، خێرو ڕەحمەتە بۆ

---

١. بوخاری: (٨٦/١) . و موسلیم: (٨٧/١).

٢. بەیهەقی لە ریسالەی نەشمەرییەدا و جامع الكبير: (١/ رقم الحديث: ١١٦٤).

موسوڵمانانی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ تا ئینسانەکان نەکەونە ناو تەنگی و نارەحەتی.

وە هەروا فەرموویەتی: «أُخْزُنْ لِسَانَكَ إلّاَمِنْ خَيْرٍ»[١] واتە: زمانت بگرەو بیپارێزە لە وتارو وشەی ناپەسەند، مەگەر لە شتی چاکا نەبێت، ئەوەی کە قازانج و نەفعی شەخسی یا گشتی تێدایە قسەی پێ بکە!

وە هەروا فەرموویەتی «أَخْلِصِ الْعَمَل يُجْزَكَ مِنْهُ الْقَلِيلُ»[٢] واتە: با کردەوەکانت بێ‌ریا و پاك بێت لە ئارەزواتی نەفسی، وە لەبەر زاتی خوا بێت ئەو کاتە پاداشێکی کەم کیفایەتی تۆ ئەکات کەواتە ئەگەر پاداشێکی کەم لە بەرابەر کردەوەکانتا کە ریایی تیا نەبوو بێت باشترەو چاکترە بۆ تۆ تا کردەوەیەکی زۆرو ئەعماڵێکی وا، کە ریای تێکەڵ بێت، چون کرداری، کە ریا و تەزویری تێکەڵ بێت نەزۆر و نەکەم جەزاو پاداشی نییە، وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «أَدِّ الْأَمَانَةَ إِلىٰ مَنْ اِئْتَمَنَكَ وَلاتَخُنْ مَنْ خَانَكَ»[٣] واتە جێ بەجێ بکە ئەوەی، کە لەسەر شانت پێویستە ئەدای بکەی، وە موحافەزەی لەسەر بکەی بۆ

١. جامع الكبير: (١/ رقم الحديث: ٢٠٧). و لە «غريب الحديث»دا لە باتی «احزن» «احفظ» هاتووە.

٢. جامع الكبير: (١/ رقم الحديث: ١٢١٥).

٣. سنن ابو داود: (٩) . و سنن ترمذی: (٤١٤) لە ئەبوو سەعیدی خیدرییەوە.

کەسێکە تۆی کردووە بە ئەمیندارو موحافیزی ئەو شتە واتە ئەو کەسەی کە تۆی بە ئەمیندار ناسیوە، وە شتێکی لەلا داناوی بەڕێك و پێکی پێی بدەرەوە، وە خەیانەت مەکە لەگەڵ کەسێکدا، کە خەیانەتی بە تۆ کردووە چون ئەگەر تۆیش وەکوو ئەو خەیانەتکار بێت فەرقتان نامێنێ، بەڵکوو لەگەڵ کەسێکدا کە خەیانەتی لەگەڵ تۆدا کردووە لێبوردنت هەبێ و چاکە بکە، هەرچەن زانایانی شەرع لەمانای ئەم فەرموودەدا ڕا و نەزەری جیاوازیان هەیە، کە کاکڵەی هەر هەمووەکەیان ئەوەیە ئەگەر ئینسان حەققێکی ماڵی لەسەر کەسێ بوو ئەتوانێ بە ئەندازەی حەققەکەی خۆی لێ وەربگرێ نە زیاتر!

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**أَدَّبَنِي رَبِّي فَأَحْسَنَ تَأْدِيبِي**»[1] واتە: خوای من، منی فێری ڕیازەی نەفس و ئەخلاقی شیرین کردووە چ بەشی ئاشکرایی و چ بەشی نهێنیەکەی وە شارەزای کردم کە چۆن بانگەواز بکەم لە ئینسانەکان بۆلای کردەوەی چاك و بەئەرزش وە بەباشترین فێرکردن منی فێرکردووە، وە ڕەحمەتی خۆی ڕژاندووە بەسەر مندا بە جۆرێ کە تائیستە بۆ هیچ کەسێك ڕەحمەتی خۆی بەو شێوە نەبەخشیوە.

---

١. جامع الكبير: (١/ رقم الحديث: ١٢٤٩).

وە هـەروا فـەرموویەتی: «**إِذا أَرَادَ اللّهُ بِعَبْدٍ خَيْراً زَهَّدَهُ فِي الدُّنيا وَ بَصَّرَهُ بِعُيوبِ نَفْسِهِ وَ فَقَّهَهُ فِي الدِّينِ**»[1] واتـە: هـەرکاتێ خـوا ویـستی لەسـەر خێرو قازانجی کەسێك بێت شارەزای ئەکات لەدینا و دڵی ئەبزوێنێ بۆ ئەوە کە نـاسینی بـۆ زاتـی خـوا وە... زۆرتـرو زیـاتربێت، وە ئـەیکا بـە ئـینسانێکی زاهدو خواناس وە ئیراد و عەیبەکانی ئەخاتە پێش چاوی تا خۆی لەوانە لابدات و خۆی بپارێزێ!

وە هەروا فەرموویەتی: «**إِذا أَسَئْتَ فَأَحْسِنْ**»[2] واتـە: هـەرکاتێ کردەوەیەکی خـرابت ئـەنجام دا پـاش ئـەوە کـارێکی جـوان و پـەسەند ئـەنجام بـدە، مەسەلەن لەپاش خشوونەت و توندی نـەرمی و ئارامی، وە لەپاش ڕق و تووڕەیی چاوپۆشی و نەرمی، وە... ببێت!

وەهـەروا پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**إِذا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ ماشِئْتَ**»[3] واتە: هەرکاتێ تۆ شەرم و حەیات نەبوو لەو خوایەی کە تۆی دروست کـردووە پـاش ئـەوە هـەرکارێ مـەیل و ئارەزووت لەسـەریەتی ئەنجامی بدە.

---

١. ئیبنو سەمعان لە ئەدەبولئیملادا لە ئیبنو مەسعوودەوە.

٢. المستدرك علی الصحیحین للحاکم.

٣ . مسند امام احمد (٣٢٧/٥) . و معجم الکبیر للطبراني (١٨٥/١٢).

وە هەروا فەرموویەتی: «**إِذَا نَزَلَ الْقَضَاءُ عَمَى الْبَصَرُ**»[١] واتە: هەرکاتێ خوای گەورە دیاری کردبی کە شتێ لەو شتانەی کە خۆی دیاری کردوون لە ئەزەلدا بێنیتە رێی ئینسانێك بە قەتعی لەو کاتەدا چاوانی ئینسان لە عاستی ئەو شتەدا نابینا ئەبێت و شت نابینێت.

وە هەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**ارْحَمُوا تُرْحَمُوا**»[٢] واتە: ئێوە بەزەیتان بێتەوە بە خەڵکدا، چون رەحم و بەزەیی گەورەترین وەسفێکە کە ئینسان بەو وەسفە رازاوەتەوە و پێوە جوانە، بۆیە خوا بەپێویستی داناوە کە ئینسان خاوەن بەزەیی بێت لە هەموو کارێکدا حەتتا لەگەڵ کافراندا، وە لەگەڵ گیانلەبەرەکاندا لەکاتی سەربڕینیاندا، تا خوای گەورە بەزەیی بێتەوە بە ئیوەدا، هەم لە دونیادا و هەم لە رۆژی پەسڵاندا.

وە هەرواپێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «**اِزْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبُّكَ اللَّهُ وَازْهَدْ مَا فِي أَيْدِ النَّاسِ يُحِبُّكَ النَّاسُ**»[٣] واتە: پشت هەڵکە لە دونیا، مەگەر بە ئەندازەی نیازمەندییەکانت نەبێ، چون ئەوەی لە دونیادایە لای خوا بێبایخە و ئەرزشی نیە کەوابوو تۆی خاوەن ئیمان و بڕوایش بەکەمی بزانە و بەکەمی بگرە، ئەگەر وات کرد خوای گەورە تۆی خۆش ئەوێت،

---

١. الحاكم عن ابن مسعود . و جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ٣٢١٨).

٢. مسند امام احمد (٢٩٣/١٣).

٣. المستدرك على الصحيحين (٢٤٤/١٨). و المعجم الكبير للطبراني (٤٨٦/٥).

چۆن پشتت هەڵکردووە لە دونیایەك کە خوای گەورە نایەوێت، جا ئەم فەرموودەیە ئەوە ئەسەلمێنێ ئەگەر تۆ دونیات بوێت خوا لە تۆ خۆشی نایت وە ئەگەر دونیات نەوێ و دونیا نەویست بیت ئەو کاتە خوای گەورە تۆی خۆش ئەوێت، کەواتە مەحبەتی دونیاپەرەستی و مەحبەتی خوای گەورە لەیەك دڵدا کۆنابنەوە وە پشت هەڵکە لەوەی لە دەستی خەڵکدایە ئەو کاتە خەڵکان تۆیان خۆش ئەوێت!

وە هەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«اِسْتَعِينُوا عَلَى الْحَاجَاتِ بِالْكِتْمَانِ فَإِنَّ كُلَّ ذِي نِعْمَةٍ مَحْسُودٌ»**[1] واتە: داخوازی نیازمەندییەکانتان بکەن لە خوا بە پەنامەکی چون خوا خۆی ئاگادارە بەسەر نیازمەندییەکانی ئێوەدا، وە دڵی ئینسان بەوە پارێزراو ئەبێت، وە ئەگەر ئێوە نیازمەندییەکانتان بۆ خەڵکان باس بکەن بەرنگارتان ئەبن لە گەیشتن بە مەتڵەبەکانتان، چون هەر خاوەن نیعمەتێك لەلایەنی خەڵکەوە بەخاڵەت و حەسودی پێ ئەبرێ.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«اِسْتَعِينُوا عَلىٰ كُلِّ صَنْعَةٍ بِأَهْلِهَا»**[2] واتە: دا خوازی نیاز مەندییەکانتان بکەن بۆ هەر ئیش و کارێك و پیشەیەك، بە کەسێك،کە شیاوی ئەو کارەیە، بەو مانا لە هەر

---

١. المعجم الكبير للطبراني (٣/٤).

٢. الدرر المنتثرة في الأحاديث للسيوطي (٥/١).

کەسێك هەر فەرمان و ئیشێك جۆرنابیت، مەسەلەن ئینسانێك بەننایە فەقەت لەو ئیشەدا شارەزایە قەت داوای فەتوای شەرعی لێ ناکرێت، هەر بەوجۆرە کارەکانیتریش هەتەد...

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اِسْتَفتِ قَلْبَكَ وَاِنْ اَفتَوكَ»[1] واتە: پرس و ڕا بکە بە نەفسی دامەزراوی خۆت ئەو نەفسەی کە بەنووری خوای گەورە ڕازاوەتەوە ، وە فەرق و جیاوازی ئەخاتە نێوان حەق و باتڵەوە هەر چەن بە زاهیر کەسانێکیش فەتوایان بۆ دابیت، چون ئەوان ئاگاداریان بەس بەسەر ڕواڵەتی کارەکەدا هەیە، وە ئەم فەرموودەیشە تایبەتمەندی بە بڕێك لە ئینسانەکان هەیە و بۆ هەمووکەس نیە، وە ئەگەر بە سوورەتی گشتی سەیریش بکەین بۆ کەسێکە دڵی نوورانی بێت بەنووری یەقین.

وە هەروەها فەرموویەتی: «أَسْلِم تَسْلِمْ»[2] واتە: بەڕێك و پێکی خۆت داخڵی بەرنامەی ئیسلام بکەو هەڵس و کەوتت بەو بەرنامەیە بێت لە دونیادا ئەو کاتە تۆ پارێزراو ئەبیت هەم لە دونیادا و هەم لە سەرای بازاری قیامەتیشدا!.

---

١. مسند امام احمد (٣/٣٠).

٢. متفق علیه.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اِسْمَحْ يُسْمَحْ لَكَ**»[1] واتە: لە بەندەکانی خوادا ئەوانەی کە پێیان ئەوترێ «عیالُ اللّه». واتە: عائیلەی خوان، لێبوردن و چاوپۆشی بکە خوای ئەوانیش لە تۆ چاوپۆشی ئەکات، وە لە هەڵەکانت ئەگوزەرێ و چاوپۆشیان لێ ئەکات،

وە هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**أَصْحَابِي كَالنُّجُومِ بِأَيِّهِمْ اِقْتَدَيْتُمْ اِهْتَدَيْتُمْ**»[2] واتە: یارەکانی من وەکوو ئەستێرەکانی عاسمان وانە شوێن ڕێبازی هەرکامیان بکەون بەرێك و پێکی شارەزاتان ئەکەن بۆ سەر ڕێگەی چاکەو خێر، چون ئەوان لە زانستگای ڕەسوولی خوادا چاکتر لە مانای قورئان و حەدیس تێگەیشتوون و حاڵی بوون، وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**أَعْجَلُ الْأَشْيَاءِ عُقُوبَةً اَلْبَغْيُ**»[3] واتە: تەنها شتێ کە خوای گەورە زووبەزوو تۆڵەکەی ئەسێنێ ستەم کردنە لە کەسێك کە شیاوی ستەم لێکردن نییە. واتە: تۆڵەی ستەم کردن کەمتر نەکەوێتە ڕۆژی قیامەت، بەڵکو خوای گەورە هەر لە دونیادا تۆڵەی ئەو ستەمە ئەسێنێ لەو ستەمگەرە، وە هەروها ناسزایی وتن بە دایك و باوك خوای گەورە کەمتر سزاکەی بخاتە ڕۆژی قیامەت، ئەکسەرەن هەر لە دونیادا حەقیان ئەسێنێ.

---

١. مسند امام احمد (٥/ ١٥٤)

٢. الابانة الكبرى لابن بطة (٢/٢٢٠).

٣. وسائل الوصول الى شمائل الرسول (١٩٤).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**أَعْدَىٰ عَدُوِّكَ نَفْسُكَ الَّتي بَيْنَ جَنْبَيْكَ**»[١] واتە سەر سەختترین دوشمنی تۆ کە دوشمنایەتی لەگەڵ تۆدا هەبێت نەفس و ئارەزواتێکە کە لە نێوان دووتەنشتەی قەوارەی تۆدا قەراری گرتووە، کە لە هەموو دوشمنێك بەتۆوە نزیکترە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**أَكْثَرُ النَّاسِ خَطَايَاً أَكْثَرُهُم خَوْضاً بِالْبَاطِلِ**»[٢] واتە: هەرکەسێ زۆرتر بچێتە ناو شتی بەتاڵەو نابار و بۆی دابچێ ئەوە لە هەموو کەس تاوانی زۆرترە و گەورەترە، کەواتە ئەگەر ئینسانێ کوتوپڕ تووشی هەڵەیەکی بچووك بێت لەگەڵ ئەو کەسەدا کە بە ڕیشەیی دابچێت فەرق و جیاوازییان زۆرە، ئەڵبەتە هەردوکیان هەڵەن لای خوا بەڵام سزای ئەو زۆرترو سەخترە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمێ: «**أَعْظَمُ النَّاسِ خَطَايَاً اَللِّسَانُ الْكَذُوبُ**»[٣] واتە: لەهەموو کەسێ خەتابارتر لە ئینسانەکان کەسێکە بە درۆزنی عادەتی کردبێ وە هیچ هەڵەو تاوانێك نیە کە ڕوو بدات ئیللا زمانی ئیسنان لەو تاوانەدا شەریکەو بەشدارە، کەواتە ئیسنان لە شەڕو زیانی زمان ڕزگارنابیت مەگەرئەمە کە بە لەغاوی شەریعەت لەغاوی کات و شتی ناشەرعی پێ نەڵێت!

---

١. الجامع الكبير (١/ رقم الحديث: ١٧٣).

٢. المعجم الكبير للطبراني (٢٠/٨).

٣. مسند شهاب القضاعي (٢٤/٥).

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**أَعْمَى الْعَمىٰ اَلضَّلاٰلَةُ بَعْدَ الْهُدىٰ**»[١] واتە: لە هەموو گومڕایەك گەورەتر ڕۆیشتنە بە شوێن ڕێگەی زەلالەتا لە پاش وەرگرتنی ڕیگەی هیدایەت، کەواتە قەبوڵ کردنی ڕێگەی گومڕایی لەپاش وەرگرتنی ڕێگەی هیدایەت لە هەموو شتێ ناپەسەندتر و نابارترە بۆئینسان.

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اِعْمَلْ لِوَجْهٍ وَاحِدٍ يَكْفِيكَ الْوُجُوهُ كُلُّهٰا**»[٢] واتە: تۆ لەبەر زاتی خوا کردەوەکانت ئەنجام بدە بەس هەدەفت زاتی خوابێت و ڕەزامەندی خوات مەنزور بێت خوای گەورە هەموو نیازمەندیەکانت بۆ جێبەجێ ئەکات.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**أَفْضَلُ الْجِهٰادَ أَنْ تُجٰاهِدَ نَفْسَكَ وَهَوٰاكَ فِي ذٰاتِ اللّٰهِ**»[٣] واتە: گەورەترین جیهادو موبارەزە ئەوەیە تۆ لەگەڵ نەفس و ئارەزواتی خۆتدا جیهادو بەربەرەکانێ بکەیت، وە نەیلێی بە مەیل و ویستی خۆیان بەرەو ڕیگەی چەوت و هەڵەت بیانبا و بڕون، وەڕامیان بکەیت لەسەر کرداری چاك و پەسەند چون بەگوێرەی فەرموودەی حەزرەت ﷺ کە فەرموویەتی: وا لەجیهادی بچووك

١. مسند شهاب القضاعی (٢٣/٥)
٢. جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ٤١٣٧).
٣. جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ٤١٣٧). و صحيح كنز السنة (١/١٤).

نــەجاتمان بـوو بـاجیهادی گـەورەیش ئـەنجام بـدەین عـەرزی نـوێنەری خوایان کرد: بۆچی جیهاد لەمە گەورەتر هەیە؟ فەرمووی: بەڵی موبارەزە لەگەڵ هەواو نەفسدا!!

وە هەروەها حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: «اِفْتَضِحُوا فَاصْطَلِحُوا»[1] واتە: ئێوە عـەیب و عـارەکانتان و تـاوانـەکانتان بـەڕەسی بکەن و بیهێننە پێش چاوتان، پاش ئەوە چارەسەریان بکەن و تەوبەیان لێ بکەن!

هــەروەهـاپێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «أَفْضَلُ الدِّينِ اَلْوَرْعُ»[2] واتە: بەرزترین پلەی دینداری لای خوای گەورە خۆپاراستنە لەو شتانەی کـە مـەنع‌کراون لەسـەر ئـوممەتی مـوحەممەد ﷺ وە لەو شـتانەی کـە حەرامن لە هەڵەو تاوان چ گەورە و چ بچوك وە..

وە هـەروەها پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ جُهْدُ الْمُقِلِّ، وَابْدَءْ بِمَنْ تَعُولُ»[3] واتـە: لەڕیـزی گـەورەترین بـەخشینی ئـینسان ئەژمیرریت، بەخشین و سەرف کردن لەڕێ خوادا بەو کەسەی کە کەم دەرئامەدە. واتە هـەژارە لە ماڵدا، بەڵام دڵێکی بـەرفراوانی هـەیە. کەواتـە: ئەی ئینسانێ کەدڵ و دەروونێکی چاك و پڕ لە سەخاوەتت هەیە، بەر لە

۱. سیر اعلام النبلاء لامام الذهبي (۴۶۱/۱۵).

۲. معجم الكبير للطبراني (۱۱۳/۱۱).

۳ . سنن ابی‌داود (۴۹۳/۴) . و مسند امام احمد (۳۹۰/۱۷).

هەمووکەسێ نەفەقەو خەرجی مناڵەکانی خۆت و ئەوانەی نزیکن بەتۆ. بکێشەو دەس پێبکە پاش ئەوان بگە بە هەژارانی دەوروبەری خۆتدا!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**أَفْضَلُ النَّاسِ أَتْقَاهُمْ وَ أَوْصَلُهُمْ لِلرَّحِمِ**»[1] واتە: بەڕێزترین ئینسان لای خوا کەسێکە کە پارێزگاری زۆربێت و ئەهلی تەقوابێت، وە قەتعی سیلەی ڕەحم نەکات بەڵکوو سیلەی ڕەحم بەجێ بێنێ، واتە سەر لە خزمان بدات بە تایبەت ئەوانەیان کەزۆر نزیکن وە پێویستە سەریان لێ بدەیت.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**أَفْلَحَ مَنْ رُزِقَ لُبّاً**»[2] واتە: سەربەرزەو ڕەستگارە کەسێك کە خوای گەورە عەقڵ و ئاوەزی جوانی پێ بەخشیوە، کە بەو عەقڵە ڕێگەی شارەزایی بۆلای دینی ئیسلام پەیدائەکات ، وە کاری چاك و پەسەند ئەنجام ئەدات و خۆی لە شتی ناپەسەند ڕزگار ئەکات و دوور ئەخاتەوە، وە هەرکات و زەمان وەسفی عەقڵ لەئینساندا زیاتربێت حاڵی بوون و دوور بوونی لە گومڕایی زۆرترو زیاتر ئەبێت بۆیە ئەگەر یارە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ کەسێکیان بەعیبادەت و تێکۆشان باس بکردایی، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیفەرموو: ئاوەزی تاقی بکەنە وە، چون ئاوەزی هەرئینسان سەرچاوەی ڕەستگارییە بۆ مرۆڤ لە دونیادا!

---

١. مصنف ابن ابی‌شیبه (۶/۹۸).

٢. المعجم الكبير للطبراني (۱۳/۳۶۳).

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (اَلْاِقْتِصٰادُ فِي النَّفَقَةِ نِصْفُ الْمَعيشَةِ وَ التَّوَدُّدُ نِصْفُ الْعَقلِ وَحُسْنُ السُّؤٰالِ نِصْفُ الْعِلْمِ»[1] واتە: شارەزایی لە سەرف کردنی ماڵدا کە چۆن سەرف بکرێت و لەکوێدا سەرف بکرێ و کەی سەرف بکرێ نیوەی ژیانی ئادەمیزادە، وە مەحەببەت نیشاندان و نزیك بوونەوە لە خەڵك بە ئەنجامدانی کردەوەی چاك و مولاحەزەکردنی نیازمەندان و بەجێهێنانی ڕەفتاری پەسەند نیوەی ئاوەزە بۆ ئینسان، چون بەهۆی ئاوەز ئەم کارانە جێ بەجێ ئەبن، وە پرسیاری جوان کەئینسان چۆن پرسیار بکات لە گەورەتر و زاناتر لە خۆی نیوەی زا نست و عیلمە بۆ ئینسان!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَللّٰهُ في عَوْنِ الْعَبْدِ مٰادٰامَ الْعَبْدُ في عَوْنِ أَخيهِ» واتە: خودا یاریدەدەری بندەیە ئەگەر بندە لە فیکری یاریدەدانی برای موسوڵمانی خۆیدا بێت.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «أَمِتْ أَمْرَ الْجٰاهِلِيَّةِ إِلّامٰاأَمَرَهُ الْإِسْلٰامُ»[2] واتە: تەرك بکە ڕەوشتی جاهیلییەت ئەوانەی کە نەفامەکانی بەر لەئیسلام ئەنجامیان ئەدان و ئەبوونە هۆی تیاچونوی ئەوان و دەورو بەریان، مەگەر ئەوانەی کە دینی ئیسلام تەئید و پەسەندی کردوون، وە بەجوانی ژماردوون.

---

١. المعجم الكبير للطبراني (٢٦١/١١) . و شعب الايمان للبيهقي (٨٦/١٤).

٢. وسائل الوصول الى شمائل الرسول للامام النبهاني (١٩٥/١).

وەهەروایپێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (**أُمِرْنَا أَنْ نُكَلِّمَ النَّاسَ عَلىٰ قَدَرِ عُقُولِهِمْ**»[١] واتە: لەلایەنی زاتی خواوە فەرمانمان پێدراوە کاتێ کە لەگەڵ ئینسانەکاندا ڕووبەڕوو ئەبین و باس ئەکەین لە گەڵیاندا بەگوێرەی وەرگرتنی ئاوەزیان قسەیان لەگەڵ بکەین، واتە: شتێ لە توانا وحاڵی بوونی ئەواندا نییە لەگەڵیان باس نەکەین وە...

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِنَّ اللّٰهَ بَعَثَنِي رَحْمَةً مُهْدَاةً**»[٢] واتە: بەڕاستی خوای گەورە منی کردووە بە نوێنەر و ڕەوانەی کردووم، کە ڕەحمەت و خێربم بۆ خاوەن بڕواکان بەوە کە ڕێگەی بەختەوەری و سەربەرزیان پێ نیشان بدەم، و بۆکافرەکانیش، کە لە دونیادا عەزاب و سزای سەخت نەیێتە ڕێگەیان تا ڕۆژی قیامەت، وە منی ناردووە کە ڕەحمەت بم و ئینسانەکان شارەزا بکەم بە ڕێگەی هیدایەت کە ڕێگەی دینی ئیسلامە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**بُعِثْتُ بِرَفْعِ قَوْمٍ وَخَفْضِ آخَرِينَ**»[٣] واتە: خوای گەورە منی کردووە بە نوێنەرو ڕەوانەی کردووم تا برێك لە ئینسانەکان بەهۆی باوەڕ هێنانەوە و داخڵ بوونیان لە

---

١. جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ٥٧٢٧).
٢. جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ٨٣٩٢).
٣. جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ٨٣٩٣) .

دائیرەی دینی ئیسلامدا بەرزەوە بکەم و پلەیان لای خوا بەرزو دیاری بێت، وە برێکیشیان بەهۆی سەرپێچی و پشت هەڵکردن لە یاساو بەرنامەی ئیسلام و بێباوەڕی خوار و ڕسوا بکەم .

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَنِ النِّسْيَانِ وَمَا أُكْرِهُوا عَلَيْهِ**»[1] واتە: بەڕاستی خوای گەورە چاوپۆشی و گوزەشتی هەیە بۆ گەل و ئوممەتی من لەشتێکدا کە دێت بە خەیاڵیانا، وە بەزمان ئاشکرای ناکەن، وە هەروا لە شتێکیش کە لە بیریان نەبێت ئەنجامی بدەن چ بەکردەوە و چ بە وتارو قسە، وە لەشتێکیش کە بەزۆر بیسەپێنن بەسەریاندا، و زۆریان لێ بکرێ کەواتە هەرشتێ، کە بەخەیاڵ و فیکری ئینسانا ئەگوزەرێ یا لەسەر خۆی نیە، کە کارێك ئەنجام ئەدات یا بەزۆری زۆردارێك ئەنجامی ئەدات خوای گەورە عیتاب و عەزابی بۆ دیاری ناکات بە خاتر ئیحتیرام و ڕێزی پێغەمبەر ﷺ !

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِنَّ اللَّهَ جَعَلَ الْحَقَّ عَلَىٰ لِسَانِ عُمَرَ وَ قَلْبِهِ**»[2] واتە: بەڕاستی خوای گەورە حەققی لەسەر زمانی حەزرەتی عومەر رضي الله عنه دەربڕو ئاشکرا کردووە، چون زمانی ئەو بەڕێزە، وەکوو شمشێری بوڕەندە وابووە، وە هەروا حەققیش لەسەر دڵ و

---

۱. المعجم الكبير (۳۳۰/۹).

۲. سنن ترمذی (۱۴۲/۱۲).

دەروونی ئەو جاری کردبوو، بەو مانا حەق لەسەر دڵی ئەو ئەجۆشا تا فەرمانی خوای گەورە ئەهاتە خوارەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ وە فەرمانەکەی جێبەجێ ئەبوو بە وتاری ئەو یا حاڵ وەزعی ئەو.

هەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«إِنَّ اللّٰهَ لَا يَنْظُرُ إِلىٰ أَجْسَامِكُمْ وَ لَا إِلىٰ صُوَرِكُمْ وَلٰكِنْ يَنْظُرُ إِلىٰ قُلُوبِكُمْ»**[١] وە لە ڕیوایەتێکی‌تردا ئەفەرمێ **«وَلٰكِنْ يَنْظُرُ إِلىٰ قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ»** واتە: خوای گەورە جەزاو پاداشی ئێوە ناداتەوە بەهۆی شکڵ و شێوەو قەوارەتانەوە، کە چۆنەو چۆن نییە، وە هەروا سەیری ماڵێ، کە لە ڕێی خەیرو خەیراتا سەرف نەکرێ ناکاو، وە جەزاو پاداشی نیە، بەڵام خوای گەورە سەیری دڵی ئێوە ئەکات، کە جێگای تەقواو خۆپاراستنە. وە خەزانەی خوا ناسینە، وە سەیری کردەوەکانی ئێوە ئەکات و جەزای کردەوەکانی ئێوە ئەداتەوە بە خێرو بە ڕەحمەت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«إِنَّ اللّٰهَ يُحِبُّ مَعَالِ الْأُمُورِ وَيُكْرِهُ سَفْسَافِهَا»** واتە بەڕاستی خوای گەورە پێی‌خۆشە ئەخلاقێ کە بەرزو موافقی یاسای شەریعەتی ئیسلام بێت، وە بەلایەوە نابارو ناپەسەندە ئەو ئەخلاقیاتەی کە ناشیرین و نابارن، کەواتە هەر بەندەیەك لە بەندەکانی خوا ڕازاوە بەئەخلاقی شیرین و جوان بێت خوای گەورە

---

١. متفق علیە.

خۆشی ئەوێت، وه هەر کەسێ له بەندەکانی خوا، خاوەنی وەسفی ناله‌بارو ناشیرین بێت خوای گەوره نایەوێت.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اِنَّ اللّٰهَ يُحِبُّ الِّرفْقَ فِي الْأُمُورِ كُلِّهِ»[1] واته: بەڕاستی خوای گەوره پێی خۆشه نەرم و نیانی له کردەوەو وتاردا، وه لەهەر کارێکی پەسەندا چ کاری دینی و چ کاری دونیایی وەچ کارو باری فەردی یا کۆمەڵایەتی وه... بێت، وه له هەر موعامەلەو ڕەددو بەدەڵێکدابێت. زانایانی بەرزی ئیسلام وشەی «رفق»یان به گەردنکەچی بۆ بەجێ هێنانی کاری پەسەندو جوان مانا لێداوەتەوه

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی «إِنَّ اللّٰهَ يَنْزِلُ الرِّزْقَ عَلىٰ قَدَرِ الْمُؤْنَةِ»[2] واته: بەڕاستی خوای گەوره ڕزق و ڕۆزی بەگوێرەی خەرج و ئینفاق ئەنێرێ بۆ بەندەکانی.

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِنَّ أَخْسَرَ النَّاسِ صَفقَةً مَنْ أَذْهَبَ آخِرَتَهُ بِدُنْيَا غَيْرِهِ»[3] واته: بەڕاستی زیانمەندترین ئینسان له پاداش و سەوابدا که له هەموو کەس حەسرەت و داخی زیاتر بێت له قیامەتدا، لەجەنبەی عەقدو موعامەلەوه، واته: زیانی موعامەلەیی

١. مسند امام احمد (١١٧/٩).

٢. الجامع الكبير (١/ رقم الحديث: ٩٠٠٤).

٣. الجامع الكبير (١/ رقم الحديث: ١٢٠٠٩).

قورستربێت کەسێ تووشی ئەبێت، کە عاقیبەت و ئاخێرەتی خۆی لائەبات بەهۆی دونیای کەسێکی‌ترەوە واتە: قیامەتی بفرۆشی بە دونیای کەسێکی‌تر خەیانەتی پێ بکات وەیا ستەم و زوڵمی لێ‌بکات.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ وَ لَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلّا غَلَبَهُ»**[1] واتە: بەڕاستی بەرنامەکانی دینی ئیسلام نیسبەت بەدینە پێشووەکان ئاسان وسووکن، چون سەختییەك و توندیەك کە لەناو ئایینە پێشووەکاندا بووە لە ناو ئایینی ئیسلامدا نییە، وە هیچ کەسێك نییە بیەوەێ لەبەرابەر دینەوە بوەستێ و زۆر تیاداچێ ئیللا دین زاڵ ئەبێت بەسەریا، کەواتە ئەوەیش مەنزور نییە کە ئینسان نەچێ بەشوێن تەکمیڵ کردنی دینەکەیا، بەڵکوو مەقسوود ئەوەیە ئینسان نابێ زیادەڕەوی بکات بە جۆرێك ببێتە هۆی پەژارەو ماندوبوونی بێ جێگەو زیاد لەحەدد.

وەهەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدَمِةِ الْأُولىٰ»**[2] واتە: بەڕاستی خۆڕاگریەك پەسندە و تەواوە، کە خاوەنەکەی لەکاتی پەیدابونی موسیبەتەکەدا لە ئەووەڵەوە خۆگر بێت، واتە لەکاتی توندی موسیبەتەکەدا خۆڕاگرتن قیمەت و بایەخی هەیە، وە گەرنە بە مرور ئینسان ئەبێتەخاوەن سەبرو خاوەن حیلم و حەوسەڵە.

---

١. صحيح بخاري (٦٩/١).

٢. صحيح بخاري (٢٩/٥).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی «**إِنَّكَ لَمْ تَدَعِ لِلّٰهِ شَيْئاً إِلّاعَوَّضَكَ اللّٰهُ خَيراً مِنْهَا**»[1] واتە: بەڕاستی تۆ ئەی ئینسان ئەی خاوەن بڕوا و خاوەن عەقڵ، هیچ شتێك تەرك ناكەی لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە ئیللا خوای میهرەبان لەبری ئەوشتە پاداش و عەوەزێكت پێ ئەدات زۆر چاكتر لەوەی كە تۆ تەركت كردووە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِنَّكُمْ لَنْ تَسَعُوا النَّاسَ بِأَمْوالِكُمْ فَسَعَوْهُم بِأَخْلَاقِكُمْ**»[2] واتە: ئێوە ناتوانن بگەن بەخەڵك بەهۆی سەروەت و كەلەپوورێكەوە كە هەتانە، چون شتی وا غەیرە مومكینە كە ئینسان بەهۆی سەروەت و سامانەوە بگا بە تەواوی خەڵكیدا، بەڵكوو بگەن بە ئینسانەكاندا بەهۆی ئەخلاق و ڕەوشتی جوانتانەوە، واتە: ئێوە بە ئەخلاقی جوانتان ئەتوانن بگەن بە ئینسانەكاندا بەو مانا ئینسان بە ئەخلاق شیرینی ئەتوانێ خەڵكان ڕام بكات و بیانكێشێ بۆ سەر ڕێگەی حەقق نەك بەسەروەت و كەلەپووری ئەم دونیایە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقالاً**»[3] واتە: بەڕاستی بۆ هەر ساحێب دینێك و حەققێك هەیە داخوازی بەڵگەی لەسەر وەرگرتنی حەققی خۆی،

---

١. شعب الايمان للبيهقي (٢٣٧/١٢).

٢. مصنف ابن ابي شيبه (٩٠/۶).

٣. صحيح بخاري (٩٥/٨).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ**»[١] واتە: تەواوی کردەوەکانی ئینسان بۆ دامەزراندن و بۆ ئەوە پاداشی ببێت لای خوای گەورە، بەگوێرەی نییەت و ئیخلاسی ئەو شەخسەیە، واتە: چەن دەرسەد کردەوەکانی ئینسان بۆ خوان ئەو ئەندازەیش جەزاو پاداشیان لای خوا هەیە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِنَّمَا الْبَيْعُ عَنْ تَرَاضٍ**»[٢] واتە: بەڕاستی دامەزران و سیحەتی ئاڵو وێڕ لە شتەکاندا لە واقع و ڕاستیدا بەستراوە بە ڕەزامەندی هەردوولای کڕیار و فرۆشیارە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ وَالْحِلْمُ بِالتَّحَلُّمِ**»[٣] واتە زانستێ کە بایەخداربێت دەسکەوتنەکەی بە زەحمەت و تەلاش کردن لەلای خاوەن زانستەکان و خاوەن عیلمەکان ئەبێت، وە حیلم و خۆڕاگری نەفس لە تووڕەیی و لە غەزەب بە خۆشحاڵ کردنی نەفسە بۆ لای خۆگرتن لە بەجێهێنانی ئارەزواتەکانی نەفس دەس ئەکەوێت!

---

١. صحيح بخاري (٣/١).

٢. سنن ابن ماجه (٤١٩/٦). و مصنف ابن ابي شيبة (٥/٥).

٣. معجم الكبير للطبراني (٢٥٨/٢٠).

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّمَا الْمَرْأُ بِخَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرِ الْمَرْأُ مَنْ يُخَالِلُ»[1] واتە: هەر ئینسانێك لە بارەی شەخسییەت و پیاوەتییەوە بە دۆستان و خۆشەویستانیەوە ئەناسرێت، جا مادام وەهایە با هەرکەسێ سەیری دەوروبەری خۆی بکات و چاوی وردکاتەوە بزانێ کێ ئەکات بە ڕەفێق و دۆسی خۆی، کەواتە ڕەفێق بۆ ئینسان ترازوو و باسکۆڵن یاسەنگی مەحەککن بۆ هەڵسەنگاندنی وەزنەی ئینسان و پاڵفتە کردنی، کەوابوو با هەرخاوەن ئاوەزێك تێبینی بکات و بزانێ کێ ئەکا بە ڕەفێق و هاوەڵی خۆی!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْراً»[2] واتە: بڕێك لە قسەکان و خوتبەکان وەکوو سێحر وانە هەروەکوو دڵی ئیسنان لە سێحرا مەیل ئەکات بۆ لای ئەوە کە ئینسان وائەزانێ ڕاستەو حەقیقەتە، بڕێك لە وتارو قسەکانیش وانە، دڵی ئیسنان مەیل ئەکات بۆلای ئەوە کە ئینسان وائەزانێ حەققن چون ئەو وێژەرە ئەو قسانەی کە ئەیانکات با وجوودی ئەوەیش کە بەتاڵن ڕووکەشیان ئەکات بە شتێك کە زۆر لە حەقق ئەچن و وەکوو حەقق وانە، کەچی لە ڕاستیا وانین.

١. جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ٩١٧٤).

٢. موطأ امام مالك (١١٨/٦) . و صحيح بخاري (١١٤/١٦).

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**أَنَا مَدِينَةُ الْعِلْمِ وَعَلِيٌّ بَابُهَا**»[١] واتە: من شارو خەزانەی زانستم، وە حەزرەتی عەلیش رضي الله عنه وەکوو دەرکی ئەو شارە وایە، بەو مانا حەزرەتی موحەممەدﷺ وەکوو شارێکە مانای تەواوی دینەکان ئەزانێ و ئاگای بووە بەسەریانا، وە حەزرەتی عەلیش رضي الله عنه وەکوو دەرکی ئەو شارەی ناساندوە و دیاری کردووە، بەو مانا هەرکەسێ لە ڕێگەی حەزرەت عەلی و باقی خەلیفەکانەوە رضي الله عنهم واردی ئەو بازارو شارە ببێت ئەوە ڕەستگارە و ڕێگەی هیدایەتی دۆزیوەتەوە، وە هەر کەسێ لە ڕێگەی ئەوانەوە نەڕوات ئەوە ڕێگەی ون کردووە و سەر لێ‌شێواوە!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**أَنْتَ وَ مَالُكَ لِأَبِيكَ**»[٢] واتە: تۆ ئەی کەسێ کە ئەڵێیت باوکم ویستی ئەوەیە ماڵەکەم ببات، خۆیشت و ماڵەکەیشت هەرهەمووەکەی هی باوکتە، چون باوکت هۆی پەیدابونی تۆیش و ماڵکەی تۆیشە، کەواتە: ئەو شیاوترە بە تۆیش و ماڵەکەیشت، وە هەرکاتێ ویستیبوو ئەتوانێ لە ماڵەکەی تۆ کە ئەڵێی هی منە، هەڵبگرێ بۆ نیازمەندییەکانی خۆی!

---

١. مستدرك على الصحيحين للحاكم (٤٤٣/١٠) .

٢. سنن ابن ماجه (٧١/٧). و مسند امام احمد (١٤٢/١٤).

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «إِنْ تَفْعَلِ الْخَيْرَ خَيْرٌ لَكَ»[1] واتـە: ئـەگەر تـۆ لە شـەرتێكدا كـردەوەی چـاك ئـەنجام بـدەيت وە هـەدفت ڕەزامـەندی خـوای گـەورە بـێت، ئـەوە خـێرە بـۆ دونـیاو بـۆ ئـاخێرەتت، وە بـەو خـێرو قـازانـجە سـەربەرزی بـە دەس ئـەهـێنیت لای خوای گەورە!

هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «أَنْزِلُوا النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ»[2] واتــە نــگاداری بــكەن و بــپارێزن ڕێــزو حــورمەتی هــەر ئـینسانێك بــە ئــەندازەی ڕێزو حورمەتی خۆی، وە لەگەڵیا بجووڵێنەوە بە جۆرێ كە مـوناسبی حـاڵی ئـەوە، وە هـەر ئـینسانێ ئـەشـێ وەفـا بـە ڕێـزو حـقوقی بكرێ، وە هەر شەخسییەتێ لە عاستی خۆیدا ڕێزی پارێزراوە، مەسەلەن زانـای دیـنی لەجـێی خۆیدا ئـەولیای خـوا لە جـێی خـۆیدا، وەشـەخسی خاوەن شكۆ هەر بەو جۆرە هتد...!

وە هــەروەها پــێغەمبەری خــوا ﷺ فــەرموویەتی: «اُنْظُرِي فَإِنَّمَا هُوَ جَنَّتُكِ وَ نَارُكِ»[3] واتـە: ئـەی ئـەو ئافرەتەی، كە خـاوەن میردی سـەیركە تـۆ وای لە چــەپلەیەك و مــەڕحەلەیـەكدا، واتــە: خــۆشـەویستنی تــۆ بــۆ

١. سنن ابی داود (۴۸۱/۴) . و مسند امام احمد (۱۳۴/۳۲).

٢. سنن ابی داود (۴۷۲/۱۲).

٣. معجم الكبير للطبراني (۳۵۷/۱۸)

مێردەکەت چۆنە؟ وە یا چاوی ئاوەزت بخەرەکار ئایا دووری و لە مێردەکەت بێزاری؟، ئایا مێردەکەت لە تۆ ڕازییە تا ببێتەهۆی چوونە بەهەشتت یا ناڕازییەو قەڵسە لێت و تۆیش ڕووت گرژە لەو تا بێتەهۆی چوونە ناو دۆزەخ و هەزاران سزای سەختی جەهەننەمت وە...!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«أَنْهَيْكُم عَنْ قِيلٍ وَ قَالٍ وَكَثْرَةِ السُّؤَالِ»**[1] واتە: من ئێوە مەنع ئەکەم لە قسەکردنێ کە وتنی بێ بایخەو بێ نەتیجەیە. وە هەر وەها ئێوە مەنع ئەکەم لە پرسیاری زۆری بێ جێگە، کە نیاز بەوانە نەبێت، چون هۆی تیاچوونی برێك لەگەلە پێشووەکان لە پێش هاتنی ئیسلامدا ئیختیلاف و کێشەی ئەوانەبوو لە کتێبەکە یاندا، ئەو کتێبەی کە نۆێنەرەکەیان لای زاتی پەروەردگار هێنابووی کەواتە: ئەی گەلی ئوممەتی موحەممەد ﷺ ئێوە لەو جۆرە شتانە خۆتان پارێزن وە لەو کارەساتانە دەرس و عیبرەت بگرن!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«لَاطَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْخَالِقِ»**[2] واتە: ئەی گەلی موسوڵمان بێداروبن و ئاگاداربن! هیچ کات دروست نییە بۆ بەجێهێنانی فەرمانی گەورەو سەرپەرشتیکەری ئەمری خۆی، ئینسان نافەرمانی خوا ئەنجام بدات، واتە ئەگەر حاکمان و

---

١. صحيح بخاري (١١٣/٢٠).

٢. سنن ترمذي (٢٩٩/٦).

فەرمانبەرداران دەستووریان دا بە کردنی تاوان و گوناه بۆ هەر مەقسەد و مەرامێك، وە یا هەر نەوعە تاوان و گوناهێك، نابێ فەرمانبەرداریان بەجێ بێنن چـون وەلی ئـەمرن، نـا نـابێت، وە دروست نـییە ئینسان بـەهۆی فـەرمانی ئەوانەوە خۆی تووشی هەڵەو تاوان بکات لای خوا شەرمەسار بێت!

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: **«اَلْإِسْلاٰمُ حُسْنُ الْخُلُقِ»**[1] واتە: دینی ئیسلام، کە بریتییە لە سەردانەواندن بۆ فەرمانی خواو پـێغەمبەری خـوا ﷺ عـەینی ئـەخلاق شـیرینی و ڕەفـتاری جـوان و پەسەندە، کەواتە: خوو و ڕەوشتی جوان لە بەرنامە و یاسای دین بەدەر نـییە و زیـاتر نـییە! وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: **«اَلْإِسْلاٰمُ يَجُبُّ ماٰقَبْلَهُ وَالْهِجْرَةُ تَجُبُّ ماٰقَبْلَهَا»**[2] واتە: ئیسلامهێنانی ئیسنانێکی بێ بڕوا و داخڵبوونی بۆ دینی ئیسلام قـەتع ئـەکات و لائـەبات ئـەوەی نافەرمانی و ناڕەوایی بێت، کە بەر لەوەی کردوویەتی لە حـەقی خـوادا، بەڵام حەقی خەڵکان ساقت نابێت و نافەوتێ، وە هەروەها بە جێ‌هێشتنی وڵات بە خاتری پاراستنی دین و لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە ئەویش قـەتع ئـەکات و لائـەبات ئـەوەی کە هـەڵە و نـافەرمانییە لە حـەقی خـوادا، بەڵام حەقی خەڵکان واتە: «حق النّاس» هەرئـەمێنێ و نافەوتێ!

---

١. جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ١٦٩).

٢. السيرة النبوية للصلابي (٢/٢٦٢).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویتی: «**اَلْإِسْلَامُ يَعْلُو وَلَا يُعْلَىٰ عَلَيْهِ**»[١] واتە: ئەگەر لەدایك و باوكێكی كافر یەكێكیان بە دینی ئیسلام موشەررەف بوون منداڵێكی نابالّغ كە هەیانە ئیسلامییەت بۆ ئەو سابت ئەبێت، وە چاوی لە ئاداب و ڕەوشتی ئیسلامییەتدا لەو دایكەیە یا چاوی لەو باوكەیە، كە موسوڵمان بوون، (ئەمەیشە بە خیلافی یاسا و قەواعیدی مەنتیقە كە ئەڵی نەتیجە تابعی ئەخەسسی موقەددیمەتەینە).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِيَّاكَ وَ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ**»[٢] واتە: لەسەر تۆیە خۆت بپارێزی لە نزاو پاڕانەوەی ئینسانێ كە ستەمی لێكراوە و خۆتی لێ دووربخەرەوە، چون لە نێوان وەرگرتنی نزاو پاڕانەوەی ئینسانی ستەم لێكراو و خوای گەورەدا پەردەیەك نییە بەڵكوو بەزووترین كات نزاكەی لێ وەرئەگیرێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**إِيَّاكَ وَ قَرِينَ السُّوءِ فَإِنَّكَ بِهِ تُعْرَفُ**»[٣] واتە: لە سەر تۆ پێویستە خۆت دوور بكەیتەوە لە كەسێ كە ڕەفیق و هاوەڵتە، بەلاّم ڕەفتاری ناپەسەندو نابارە، چون تۆ بە ڕەفتارەكانی ئەودا ئەناسرێیت، كەواتە خۆتی لێ پارێزە و خۆتی لێ

---

١. صحيح بخاري (١٣٩/٥).

٢. مصنف ابن ابی شيبة (٥٨/٧). و شعب الايمان للبيهقي (١٣/١٦).

٣. مسند ابي يعلى الموصلی (٣٦٨/١٢).

دووربکەرەوە، وە خوای گەورە فەرموویەتی: کەسێ شەیتان نزیك و یاری بێت، شەیتان خراب هاوەڵ وجیرانێکە بۆ ئینسان!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِيَّاكُمْ وَالْخِيانَةَ فَإِنَّها بِئْسَتِ الْبِطٰانَةُ»[1] واتە: لەسەر تۆیە خۆت دوور خەیتەوە و خۆت بپارێزی لە خەیانەت کردن بە هەموو جۆرەکانیەوە، چوون بەڕاستی وەسفی ستەم و خەیانەت کردن خرابترین بەرگ و لیباسێکە هەرکەسێ لەبەری کات ئەبێتە هۆی تێشکانی ئەو کەسە، وە لەبەین ئەچێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِيّٰاكَ وَمٰايَسُوءُ الْأُذُنَ»[2] واتە: لەسەرتۆیە خۆت بپارێزی لە وتارو گوفتارێك، کە ئینسانەکان ناشیرین ئەکات، بەکورتی لەسەر ئینسانی خاوەن بڕوا پێویستە خۆی پارێزی لە غەیبەت کردن هەر کەسێك، کە شیاوی غەیبەت کردن نییە چون ئەگەر ئەو غەیبەت کردنە لە زمانی تۆوە ببیسرێت ئەبێتە هۆی نەفرەت و کینەو دوو بەرەکایەتی، کە ئەمانەش لە کۆمەڵگادا ناپەسەندو ناشیرینە!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویتی: «إِيّاكُمْ وَخَضِراءَ الدِّمِنِ، قِيلَ: وَ مٰاخَضِراءُ الدِّمِنُ يٰا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قٰالَ: اَلْمَرئَةُ الحَسَنٰاءُ فِي الْمَنبَتِ

---

١. المعجم الكبير (٧۶/١۶)

٢. مسند امام احمد (٣٩/٣۴). و جامع الكبير للطبراني (١/ رقم الحديث: ١٠٠۵۶).

**السُّوءِ»**[1] واتە: لەسەر ئێوەیە و پێویستە خۆتان بپارێزن لە سەوزەیەك كە بۆگەنە، عەرزی ڕەسولی خوایان كرد ئەی نوێنەری خو اسەوزەی بۆگەن كامەیە؟ نوێنەری خوا لە وڵامدا فەرمووی: ئافرتێ كە ڕواڵەت و دیمەنی جوانی هەیە ئەوە مەحەلل و جێگای سەوز بوونی خراپەیە، كەواتە لازمە لەسەر ئافرەت بەتایبەت خاوەن جەماڵ خۆی پارێزێ وە ئینسانەكان تووشی گوناهـ و تاوان نەكات!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«اَلْإِيمَانُ نِصْفَانِ نِصْفٌ فِي الصَّبْرِ وَ نِصْفٌ فِي الشُّكْرِ»**[2] واتە: باوەڕ و ئیمانی خاوەن بڕوا، بە دووبەش دابەش ئەكرێت بەشێكی لە ژێر شوكرا نە بژێری خوای گەورەدا لەسەر نێعمەتەكانی دەس ئەكەوێ، واتە خاوەن بڕوا ئەشێ شوكرانە بژێربێت، وە بەشێكی تریشی لە ژێر خۆگرتن و سەبردادەس ئەكەوێ واتەئەشێ خاون بڕوا خۆگرو سەبوو ربێت، كەواتە ئیمان داری كامڵ و تەواو ئەشێ خاوەنی ئەو دوو وەسفەبێت.

---

١. مسند شهاب قضاعي (٤٦٨/٣).

٢. شعب الايمان للبيهقي (١٩٩/٢٠).

# پیتی بێ

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ وَالْإِثْمُ مَاحَاكَ فِي صَدْرِكَ وَ كَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ»[1] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەڵامی نەواسی کوڕی سەمعاندا فەرموی: چاکە بریتیە لە ئەخلاق شیرینی و ڕەفتاری جوان و پەسەند، وە گوناهیش ئەوەیە لە دڵی تۆی نەوعی ئینسانیدا ئارام و قەرارناگرێ، وە پێت ناخۆشە، کە خەڵکان ئاگاداربن بە سەر ئەو کردارەیدا کە تۆ ئەنجامت داوە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی «بَرُّوا آبَائَكُمْ تَبَرُّكُمْ أَبْنَائُكُمْ وَ عُفُّوا تَعْفُ نِسَائُكُمْ»[2] واتە: چاکە بکەن لەگەڵ باوکان و دایکانتان بەو مانا ڕەفتاری ئیسلامیان لەگەڵدا بکەن چون ئەگەر ئێوە ڕەفتارتان وابێت ئەولادەکانی ئێوەش لەگەڵ ئێوەدا چاك ئەبن و ڕەفتاریان باش ئەبێت، وە ئێوە لەخەیانەت کردن بە ناموس و شەرەفی ئینسانەکانیتر خۆتان بپارێزن، دەس درێژییان بۆ مەکەن ئەگەر ئێوە ڕەفتارتان وابێت ئەولادەکانی ئێوەیش شەرەفی ئێوە ئەپارێزن و هیچ کەس دەس درێژییان بۆ ناکات!

---

١. صحيح مسلم (١٢/٤٠٣).

٢. المستدرك على الصحيحين للحاكم (١٤/٩٨).

وە هـــەروەها پـــێغەمبەری خـــوا ﷺ فـــەرموویەتی: «بُعِثْتُ بِمُدَارَاةِ النَّاسِ»[1] واتـە: خـوای گـەورە منی ڕەوانـە کـردووە بەنوێنەرایەتی تـا لەگەڵ ئـینسانەکاندا، بـە نـەرم و نـیانی و لەسـەرخـۆ بـەرخورد بـکەم، وە بـاڵی نـەوازش و میهرەبانی بۆ ئەوان ڕابخەم و توندوتیژ نەبم لە گەڵیان، چون ئـەم وەسفانە ئەبنە هۆی یەك گرتن و یەکیەتی گەل و نەتەوە، وە ئەبنە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی ئینسانەکان!

وە هـەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فرمویەتی: «اَلْبَلَاءُ مُوَكَّلٌ بِالمَنْطِقِ»[2] واتـە: سـەلامەتی ئینسانەکان بەسراوە بە وتـارو قسەی ئینسانەوە، بەو مانا هـەر دەردی سـەرێك کە بۆئینسان دروست ئـەبێت چ لە دونیادا، و چ لە قـیامـەتیشدا، بـەهـۆی وتـاری نـابارو قـسەی نـاشیرینی ئینسانە، کـەواتـە بـــێوەیی ئـــینسان وا لە بـــێدەنگی و ســـکووتی ئـــینساندا، وەکـــوو لە فـەرموودەی‌تردا هـەیە کـە بـێدەنگی بـە گـەورەترین ئـەخلاقی ئـینسان ئەژمیررێت!

وە هـەروەها پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «اَلبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ عَلىٰ مَنْ أَنْكَرَ»[3] واتە: شاهێد بۆ ئیسباتی مەتڵەبێك هەمیشە لەسەر

---

١. شعب الايمان للبيهقي (٢/١٨).

٢. دلائل النبوة للبيهقي (٢٩٧/٢).

٣. صحيح بخاري (١٩٠/٩). و سنن ترمذی (١٨٣/٥).

کەسێکە، کـە ئیددیعای هەیەو داخوازی شت ئەکات، وە سوێندخواردن بـۆ ئیسباتی هـەر مـەتڵەبێك لەسـەر کـەسێکە کـەئینکاری شت ئـەکات و داخـوازی شـتی لێ ئـەکرێت، مـەگـەر لە بابی قـەسامەت دا نـەبێت لەوێ سوێندەکان هەرهەمووەکەی لەسەر موددەعین!

## پیتی تێ

پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرمووبەتی: «تَرْكُ الشَّرِ صَدَقَةٌ»[1] واتـە: تـەرکی شـەڕو ئاژاوەگێڕی، وەکـوو بەخشین و شت دان بەخەڵکی هەژارو فەقیر وایە لە ڕێگەی خوادا، بەو مانا هەر کەسێ ئینسانێك لە هۆکانی ئاژاوەگێڕی دوور بکاتەوە، وەکوو خێری کردبێ لە ڕێگەی خوا دا وایە!

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «تَعَرَّفْ إِلَى اللَّهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَةِ وَاعْلَمْ إِنَّ مَا أَخْطَئَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ وَإِنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ وَ إِنَّ الْفَرَجَ مَعَ الْكَرَبِ وَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرىٰ»[2] واتـە: نـزیك بـەرەوە لە خوا بە بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوای گەورە و بەسوپاس گوزاری نیعمەتەکانی خـوا، وە بـە خـۆڕاگـری لە ژێـر دایـرەی قـەزاو قـەدەری خـوایـیدا. وە بـە

---

١. اعلام النبوة للماوردي (٢٥٤/١).

٢. المستدرك على الصحيحين للحاكم (٤٠٧/١٤).

پەنابردن بۆلای خوا بەڕاستی، وە خوای گەورە هەموو گرێ کوێلەکانی ژیانت بۆ ئەکاتەوە، وە ساغی و سەلامەتیت بۆ دیاری ئەکات، وە لە تەنگو چەڵەمەی ڕۆژگار ئەتپارێزێت. وە بە لوتفی خۆی ڕەحمت پێ ئەکات، وە بزانە بە ڕاستی ئەو شتەی کە لە تۆ لادراوە و پێت ناگات تەقدیری خوایی وابووە کە بە تۆ نەگات، وە ئەوەیش بە تۆ گەیشتووە تەقدیری خوایی وابووە کە لە تۆ لانەدات و پێت بگات، وە بزانەسەر کەوتنی ئینسان وا لە ژێر حەڵقەو دایرەی خۆگری و سەبردا، وە لەگەڵ هەموو سەختییەك و نارەحەتییەکدا لە ژیانا ڕەحەتییەك و ئاسانییەك بۆ ئینسان هەیە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**تَمَسَّكُوا بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقىٰ قَوْلُ لَاإِلٰهَ إِلّا اللّٰهُ**»[1] واتە: دەستی خۆتان توند بکەن و بی ئاڵێننە جێگە دەستی نەپساو و مەحکەم کە وشەی «لااله الاالله»یە، واتە شوێنی کەون و عەمەڵ بە مەفهوم و مانای ئەم لەفزەیە بکەن، وە لە دایرەی ماناو مەفهوومی ئەم لەفزە مەچنەدەر ئەگەر وابکەن دەستتان ئاڵاندووەتە جێگا دەستێکی مەحکەم و نەپساو، وە بەمەتڵەبتان ئەگەینێ!

---

١. وسائل الوصول الى شمائل الرسول للنبهاني (٢٠٣).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی «تَهَادُوا تَحَابُّوا»[١] واتە ئێوەی خاوەن بڕوا دیاری و هەدیە بۆ یەکتر ببەن تا مەحەببەت و ئولفەتتان بۆ یەکتر زیاتر بکات و یەکترتان خۆش بوێ، وە لە کەناری مانای ئەم فەرموودەیەدا ئەشێ بزانین دیاری بردن و هەدیەبردن نابێ بەو شێوە بێت ئەو کەسە کەدیاریەکەی بردوە چاوەڕوانی پڕ کردنەوەی ئەوشتەی بێت کە بردوویەتی بۆ ئەو تەرەفە، وە بە تەمابێت شتی پێبدەنەوە، نا ئەمە دروست نییە!

## پیتی «ث»ی

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاوَةَ الْإِيمانِ أَنْ يَكُونَ اللّٰهُ وَ رَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّاسِواهُ وَ أَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لايُحِبُّهُ إِلّا لِلّٰهِ. وَ أَن يُكْرِهَ أَنْ يَعُودَ إِلَى الْكُفْرِ بَعْدَ أَنْ أنْقَذَهُ اللّٰهُ مِنْهُ كَما يُكْرِهُ أَنْ يُلْقَىٰ فِي النَّارِ»[٢] واتە: سێ خەسڵەت هەن لە هەر کەسێکدا بن و دەس کەون لە هەرئینسانێکدا لە ززەت و شیرینی ئیمان و باوەڕ ئەگات بەو ئینسانە، چون ئەم ئینسانە خۆگربووە لە سەر شتە سەختەکان و

١. سنن الكبرى للبيهقي (١٦٩/٦)

٢. صحيح بخاري (٢٦/١) . و صحيح مسلم (١٥٢/١).

شتە نارەحەتەکان، بەمە کە بەرنگاریان بووە و بەم خۆگرییە ڕەزامەندی خوای گەورە و پێغەمبەری خوای بەدەس هێناوە، وە ئەو سێ خەسڵەتەیش دەس ناکەون مەگەر ئەمە خواو پێغەمبەری خوای لە هەموو شتێ زیاتر خۆشتر بوێن، واتە: مەحەببەتی بۆ خواو نوێنەرەکەی لەماڵ و ئەولاد و هەموو شتێ زیاتر بێت، وە هەر ئینسانێکی خۆشویست لە بەر ڕەزامەندی خوا بێت، وە پێی ناخۆش بێت بەرەو بەرنامەی کوفر بڕوات و بگەڕێتەوە بۆ ناوی پاش ئەوەی کە خوا بە لوتفی خۆی لە کوفر پاراستوویەتی، بە هۆی ئیسلامهێنان و داخڵ بوون لە ناو بەرنامەی ئیسلامدا، وەکوو پێی ناخۆشە کە داخڵ بە ئاور جەهەننەم ببێت پاش ئەوەی، کە لە بەهەشتەکەی خوادا قەراری گرت و دامەزرا!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ حَاسَبَهُ اللّٰهُ حِسَاباً يَسِيراً وَ أَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ بِرَحمَتِهِ، تُعْطِي مَنْ حَرَّمَكَ، وَتَعْفُو عَمَّنْ ظَلَمَكَ، وَتَصِلُ مَنْ قَطَعَكَ**»[1] واتە: سێ خەسڵەت هەن کۆببنەوە لە هەرکەسێکدا خوای گەورە لە قیامەتدا بە سووك و سەهل موحاسەبەی ئەو ئینسانە ئەکات و زۆر بە سەخت لێی ناگرێ لە بازاری مەحشەردا، بەو مانا زۆر ڕاناوەستێ و بە ڕەحمەتی خۆی ئەیخاتە ناو بەهەشتەکەی خۆی هەرچەن کردەوەکانیشی نەگەنە ئەو ئەندازەیە کە شیاوی بەهەشتی

---

١. سنن الكبرى للبيهقي (١٠/٢٣٥).

بێت، یەکەم: لەو خەسڵەتانە ئەوەیە کە تۆ بەخشین و دەس‌گرۆییت ببێت بۆ کەسێك کە ئەو بەخشین و مەحەببەتی خۆی لەتۆ مەنع کردووە، دووهەم: لەو خەسڵەتانە ئەوەیە کە تۆ چاوپۆشی بکەی لە کەسێك کە ئەو ستەمی لە تۆ کردووە لە هەر بابەتێکەوە، ماڵی، گیانی. هتد.. سێهەم: لەو خەسڵەتانە بەجێ‌هێنانی سیلەی ڕەحمە لەگەڵ کەسێکدا کە ئەو قەتعی سیلەی ڕەحمی لەتۆ و لەخزمان و نزیکانی خۆی کردووە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**ثَلَاثٌ مُنْجِيَاتٌ: خَشْيَةُ اللّٰهِ فِي السِّرِ وَالْعَلَانِيَةِ، وَ الْعَدْلُ فِي الرِّضَا وَالْغَضَبِ، وَالْقَصدُ فِي الْفَقْرِ وَالْغِنى! ثَلَاثٌ مُهْلِكَاتٌ، هَوىً مُتَّبَعٌ. وَشُحٌّ مُطَاعٌ. وَ إِعْجَابُ الْمَرْءِ بِنَفْسِهِ!**»[1] واتە: سێ شت هەن هۆی ڕزگار بوونی ئینسانن لە سزاو عەزابی خوای گەورە لە قیامەت دا، یەکەم ترسانە لە خوای گەورە لە پەنامەکی و ئاشکرادا، دووهەم میانەڕەوی و دادگەرییە لە کاتی ئاسایش و کاتی توڕەییدا، سێهەم مامناوەندی و میانەڕەوی ئینسانە لەحاڵەتی فەقرو نەبوونی و لە حاڵەتی دەوڵەمەندی و بووندا، وە هەروا سێ شتیش هەن خاوەنەکەیان تیا ئەبەن و ئەیفەوتێنن: یەکەم شوێن‌کەوتنی ئارەزواتی نەفسە، دووهەم بەجێ نەهێنانی ئەو شتانەی کە خوا واجبی کردون

---

١. شعب الايمان للبيهقي (١٥/٣٠٠).

لەسەر ئینسان و مەنعیانکات، واتە: ئینسان بەگوێی هەوای نەفسی بکات و حقوقاتی خوایی بەجێ نەهێنێت. سێهەم، ئینسان نەفسی خۆی بەکامڵ و تەواو بزانێ، و منەتی خوای لەبیر بچێت و خۆی بە زل بزانێ کەچی لە ڕاستیشدا وانییە!

## پیتی جیم

پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**اَلْجَارُ قَبْلَ الدَّارِ وَالرَّفِيقُ قَبْلَ الطَّرِيقِ**»[1] واتـە: ئینسان بەرلەوەی سکوونەت بکات لە جێگایەکدا یا لە ماڵێکدا و ببێتەخاوەنی ئەو ماڵە ئەبێ تەحقیق بکات لە هاوسێکانی بزانێ چ جـۆرە هـاوسێیەکن و ڕەفـتاریان چـۆنە، وە هـەروا بـەر لەوەی بـبێتە ڕەفـیقی ئـینسانێك لە سـەفەرێکدا یـا لەکـارێك و سـەنعەتێکدا یـا لە پیشەیەکی خـسووسی یـا عـموومیدا ئـەبێ بـزانـێ ئـەو شـەخسە کێیە و ئەخلاق و ڕەفتارو سروشتی هەڵسەنگێنی بزانێ چۆنە، ئەو کاتـە ڕەفێقیی بکات وە ببێتە شەریکی.

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویتی: «**جَـفَّ الْقَلَمُ بِمَا أَنْتَ لَاقٍ**»[2] واتە: قەڵەم و پێنووسی ئەزەلی خوای گەورە لە بارەی ئەو شتانەوە،

---

١. المعجم الكبير للطبراني. (٣٦١/٤).

٢. صحيح بخاري (١١/١٦).

کە تۆ پێیان ئەگەیت لە ژیانتا وشکەوە بووە. بەو مانا هەرچێ لە ئەزەڵدا دیاری کرابێ لە سەرت ئەبێ هەر هەمووەکەی بێتە جێ بەبێ زیادو کەم.

وە هەروەهاپێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «اَلْجَمٰاعَةُ رَحْمَةٌ وَالْفُرْقَةُ عَذابٌ»[1] واتە: پێداویستی بۆ یەکگرتنی کۆمەڵگای موسوڵمانان لازمەو زەروورە، چون ئەو یەکگرتنە بەرەو ڕەحمەتی خوای گەورە ئەیانبات، لە ڕاستیدا خوای گەورە ئیماندارانی لەسەر یەك ئایین و لەسەر یەك شەریعەت کۆکردووەتەوە، تا برێکیان برێکی‌تریان دەرك بکەن و بناسن، وە لەبەرابەر دوژمنانی دینەوە وەکوو یەك کەس وابن و تەفرەقە و جیاوازی لە ئاداب و ڕەوشتی دارو دەستەی شەیتانە، کە لە ئاکامدا ئەیانکێشێ بۆ ناو سزاو ئاوری سەختی جەهەننەم.

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «اَلْجَنَّةُ تَحْتَ أَقْدَامِ الْأُمَّهٰاتِ»[2] واتە: خۆبەکەم نیشان دان و بەدەس هێنانی ڕەزامەندی دایکان هۆی چوونە ناو بەهەشتی خوای گەورەیە، کەوابوو خزمەت کردنی دایك و باوك بەتایبەت دایك، کە لەگەڵ منداڵدا زەحمەتی زۆرترە ئەبێتە هۆی چوونە ناو نازو نیعمەتی خوای گەورە، کە بەهەشتەکەیەتی لەو دونیادا!

---

1. الابانة الكبرى لابن بطة (١٢٧/١).
2. مسند الشهاب القضاعي (١٨٩/١).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْجَنَّةُ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ**»[١] واتە: کێشانی شمشێر لە ڕێگەی خوادا ئەبێتە هۆی چوونە ناو بەهەشتی خوای گەورە، یاجیهاد کردن لە ڕیگەی خوادا و بەدەس هێنانی شهادەت ئەبێتەهۆی چوونە ناو بەهەشتی خوای گەورە، یا سێبەری شمشێر و لێدان لە دوژمن بەهۆی شمشێر ئەبێتە هۆی چوونە ناو سێبەرەی باغەکانی بەهەشت!

## پیتی حێ

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**حُبُّ الدُّنيَا رَأْسُ كُلِّ خَطِيئَةٍ**»[٢] واتە: زۆر خۆش‌ویستنی دونیا زیادە لە ئەندازەی خۆی ئینسان ڕائەکێشێ بۆ ئەنجامدانی تاوان بە ئاشکراو بە نهێنی، بەڵکوو تەواوی ئەو نوێنەرانەی کە لەلایەنی بێباوڕەکانەوە بە درۆ خراونەتەوە و وتویانە ئێوە درۆ ئەکەن لەلایەنی خواوە نەهاتون، هەمووەکەی بەهۆی خۆش‌ویستنی دونیاوە بووە، نەك تەنها ئەوە بەڵکوو تەواوی تاوانەکان لە دونیادا ڕیشەکەی لە ئەسڵدا خۆش‌ویستنی دونیایە و ئەگەڕێتەوە بۆ خۆش‌ویستنی ئەو!

---

١. صحیح بخاري (٣٩٨/٩).

٢. جامع الاصول للاحادیث الرسول (٢٠٦/٤).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْحُبُّ فِي اللّهِ وَالْبُغْضُ فِي اللّهِ مِنْ أَفْضَلِ الْأَعْمَالِ»[١] واتە: خۆش‌ویستنی ئینسان بۆ هاو نەوعەکانی خۆی یا ڕقی ئینسان هەروا لە هاو نەوعەکانی خۆی هەردوولا ئەبێ لەبەر زاتی خوا بێت و ڕەزامەندی خوای تیا مەنزور بێت نەك شتی‌تر کە ئەمەیش لە گەورەترین کردەوەکانی ئینسان ئەژمێررێت و حیساب ئەکرێت!

هەر وەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حُبُّكَ الشَّيْئَ يُعْمِي وَيَصُمُّ»[٢] واتە: خۆشەویستنی تۆ بۆ شتێك ئەبێتە هۆی ئەوە کە عەیب و ناتەواوی خۆشەویستەکەت بە چاو نەبینیت، بەڵکوو هەڵەکانیشی بەڕاست نەزانی، کەواتە خۆش‌ویستنی هەرشتێ کاتێ کە زاڵ بوو بەسەر دڵ و دەروونا ئەو دڵە وەسفەکانی خۆی لەدەس ئەدات!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْحَرْبُ خِدْعَةٌ»[٣] واتە: شەڕکردن لەگەڵ دوژمندا بریتی نییە تەنها لە مواجەهە و ڕووبەڕوو بوون لەگەڵ دوژمندا، بەڵکوو زاڵ بوون لە شەردا بریتییە لە تاکتیك و لێزانین لە نەقشەکانی شەڕ، بۆ بە دەس‌هێنانی سەرکەوتن بە سەر دوژمندا!

---

١. سنن ابی داود (١٢/٢٠٠).

٢. سنن ابی داود (١٣/٢٣٨).

٣. صحیح بخاری (١٠/٢٢٧) .

وه هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْحَسَبُ اَلْمَالُ وَالْكَرَمُ اَلتَّقوَىٰ»[١] واتە: تەنها شتێ کە ئینسان لەلای خەڵکان بەرز ئەکاتەوە سەروەت و کەلەپووری دونیایە، وە تەنها شتێ کە ئینسان لای خوا، بەرز ئەکاتەوە، وە ڕێزی بۆ دیاری ئەکات تەقوا و خۆ پاراستنە، کەواتە سەخاوەتدار، بە کەسێك ئەڵێن کە تەقواو خۆپاراستنی زۆر بێت نەك تەنها بەخشینی ماڵی زۆربێت!

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حَسْبُكَ بِالصِّحَةِ وَالسَّلٰامَةُ دَاءٌ» واتە: بەسن بۆ تۆ و کیفایەتت ئەکەن ساغی و بێوەیی و دوور بوونت لە نارەحەتی و نەخۆشین، کە ئەمە خۆی دەردو نەخۆشین بن، کەوابوو ساغی و سەلامەتی بە دەوام کە ئینسان ببێ هەر ئەمە خۆی دەردو نەخۆشینە بۆخاوەن بڕوا!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمەیەتی: «حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكٰارِهِ وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَواتِ»[٢] واتە: بەهەشتەکەی خوا داپۆشراوە و دەورە دراوە بەو شتانەی کە سەخت و قورسن لەسەر ئینسان، وەکوو خۆگری لە بەرابەر موشکیلاتەوە، هەروەها وەکوو خۆگری لەسەر ئەنجامدانی تاعەت و عیبادەتی خوای گەورە وە... کەواتە ئینسان ناچێتە ناو ئەو

١. سنن ترمذی (٧٤/١١). و سنن ابن ماجه (٣٦٤/١٢).
٢. صحیح مسلم (١٣/ ٤٤٨٥).

بەهەشتەی خوا، مەگەر بە بڕین و تێپەڕکردن لەو موشکیلاتەی کە بەرنگاری ئینسان ئەبن، وە بەخۆگری لە بەرابەر ناڕەحەتییەکانەوە لەم جێهانەدا. هەر بەو جۆرە جەهەننەمیش داپۆشراوە بەئارەزواتی نەفسی واتە: ئەو شتانەی کە سازگارو موافقی نەفسی ئینسانن هەروەکوو چوونە ناو بەهەشتەکەی خوا، بەلابردنی پەردەی موشکیلاتە، بە خۆگری چوونە ناو جەهەننەمەکیش بە لابردن و دڕینی پەردەی شەهەوات و ئارەزواتە ئەگەر کەسێ پەردەی ئارەزواتی هەواو نەفسی دڕی وە خۆی نەگرت ئەچێتە ناو جەهەننەمەکەی خوا!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ**»[1] واتە: پەیداکردنی ئەو زانستەی کە ببێتە هۆ و یاوەری ئینسان بۆ ناسینی خوای گەورە و بۆ پاك کردنەوەی نەفس لە ژەنگی تاوان و بۆ دیاری کردنی ئەخلاقی جوان و شیرین و بۆ بەرڕەسی کردنی حەق و عەمەڵکردن بە حەق و بۆ بەرگری کردن لە شوێن کەوتنی هەوای نەفس و شتی بەتاڵ، ئەوە گوم بووی هەر فەردێکی موسوڵمانە پێویستە بگەڕێ بە شوێنیا و هەوڵیشی بۆ بدات!

---

١. سنن ترمذی (٣٠١/٩). و سنن ابن ماجه (٢٠٥/١٢ ).

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«اَلْحَلاٰلُ بَيِّنٌ وَالْحَرٰامُ بَيِّنٌ»**[1] واتە: ئەو شتەی کە حەلاڵەو ڕەوایە، وازیح و ڕونە ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەری خواﷺ یا جەماوەری زانایان لە موسوڵمانان مۆری حەلاڵیان لەسەر دانابێ، هەروەها شتی حەرام و ناپەسەند ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەری خواﷺ و جەماوەری زانایانی موسوڵمان مۆری حەرامیان لەسەر دانابێ، وە بەیانیان کردبێ کە ئەمە حەرامە و ناپەسەندە!

## پیتی خێ

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«خُذِ الْحِكْمَةَ وَلاٰيَضُرُّكَ مِنْ أَيِّ وِعٰاءٍ خُرِجَتْ»** واتە: حیکمەت و زانیاری وەربگرە زەرەر نادات بەتۆ لە دڵی هەرکەسێکەوە بێتەدەرەوە!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«خَصْلَتٰانِ لاٰيَجْتَمِعٰانِ إِلّٰا فِي مُؤْمِنٍ اَلسَّخٰاءُ وَحُسْنُ الْخُلُقِ»**[2] واتە: دوو وەسف هەن هیچ کات کۆ نابنەوە مەگەر لە دڵی ئینسانی موسوڵماندا نەبێت، وە ئەم دووەسفە بەس لەدڵی ئینسانی خاوەن بڕوادا، کۆ دەبنەوە و لە دڵی کەستردا کۆنابنەوە.

١. صحيح بخاري (٩٠/١).

٢. وسائل الوصول الى شمائل الرسول للنبهاني (٢٠٤/١) .

یەکەم، وەسفی سەخاوەت و بەخشینە لە ڕێگەی خوادا، دووهەم وەسفی ئەخلاق شیرینی و ڕەفتاری جوانە لەگەڵ موسوڵماناندا!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«خَصْلَتَانِ لاٰيَجتَمِعٰانِ فِي مُؤْمِنٍ اَلْبُخْلُ وَ سُوءُ الْخُلُقِ»**[1] واتە: دوو خەسڵەت و وەسف هەن لە دڵی خاوەن بڕوادا کۆ نابنەوە، یەکەم بەخاڵەت و حەسودی واتە ڕژدی. دووهەم ئەخلاق و ڕەوشتی ناپەسەندو نابار!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«اَلْخَلْقُ كُلُّهُمْ عِيٰالُ اللّٰهِ، وَأَحَبُّهُمْ إِلَى اللّٰهِ أَنْفَعُهُمْ لِعِيٰالِهِ»**[2] واتە: هەموو بەندەکانی خوا نیازمەندن بۆلای خوای گەورە، وە خوا خۆی سەرپەرەشتییان ئەکات و ڕزقیان ئەدات، کەواتە گشت گیان لەبەرەکان بەتایبەت ئادەمیزاد مووچەخۆری زاتی پەروەردگارن، وە خۆشەویسترینی ئەو بەندانە لای خوای گەورە کەسێکە کە نەفع و قازانجی زۆرتربێت بۆ خێزان و ژێردەستەکانی و مووچەخۆرەکانی خۆی

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«خَيْرُ الْأُمُورِ أَوْسَطُهَا»**[3] واتە: باشترین کار لە ناو کارەکاندا کارێکە کە ناوەندی بێت، وە

---

١. سنن ترمذی (٢٢٤/٧) .

٢. المعجم الكبير للطبراني (٤١٣/٨).

٣. شعب الايمان للبيهقي (١١٣/١٤).

لە ئیفرات و زیادەڕەوی دوور بێت، ئاشکرایە هەر کارێك زیادەڕەوی تێکەڵ بێت سەرئەنجام بە شکست ڕووبەڕوو ئەبێت، وە بێفائێدە ئەبێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«خَيرُ الرِّزْقِ مٰا لٰا يُطْغِيكَ وَلٰا يُلْهِيكَ»** واتە: باشترین ڕزق و ڕۆزی ئەوەیە کە نەبێتە هۆی سەرکەشی و مەشغوڵ بوونی ئینسان و لەبیرچوونی زیکرو یادی خوای گەورە، کەواتە وەك لە حەدیسی تردا هاتووە ئینسان ئەگەر بەشی ڕۆژانەی خۆی ببێت ئەوە باشترین ڕزق و ڕۆزییە لای خوا، بەلاّم ئەو ماڵ و کەلەپوورەی، کە سەر لە ئینسان بشێوێنێ و ئینسان لە وەزیفە دینییەکانی خۆی دوور بکاتەوە و مەشغوڵی بکات ئەوە بە ڕزق و ڕۆزی باش ناژمێررێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«خَيْرُ العَمَلِ أَنْ تُفٰارِقَ الدُّنْيا وَ لِسٰانُكَ رَطَبٌ مِنْ ذِكْرَ اللّٰهِ»**[1] واتە: چاکترین کردەوە بۆ تۆی خاوەن بڕوا ئەوەیە کاتێك لە دونیادا ئەڕۆیت و خواحافیزی ئەکەیت لەم دونیایەدا، زمانت مەشغوڵی زیکرو یادی خوا بێت، کەواتە پێویستە بۆ ئینسان هیچ کاتێ لە زیکری خوا غافڵ نەبێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«خَيْرُكُمْ خَيْرٌ لِأَهْلِهِ وَ أَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي مِنْ بَعْدِي»**[2] واتە: باشترین و چاکترینی ئێوە کەسێکە کە

---

١. جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ١٢٢٧٧).

٢. سنن ترمذى (٣٩٩/١٢).

بۆ خێزان و کەس و کاری باش بێــت، وە لەگەڵیان سیلەی ڕەحم بەجێ بێنێ، وە من لە هەمووتان باشترم بۆ ئەهل و خێزانی خۆم چون خێرو قازانجی دونیاو ئاخیرەتم بۆ دیاری کردوون!

وە هــەروەها پــێغەمبەری خــوا ﷺ فــەرموویەتی: «**خَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ**»[1] واتــە: چــاکترین ئــینسانەکان لە دونــیادا، کـەسێکە کـە ســوودو قازانجی بۆ ئینسانەکانیتر ببێت، وە نەفع و سوودی زیاتر بە خەڵك بگەیێنێ، وە گـرفتاری و زەحـمەتەکانیان لە کـۆڵ بـکاتەوە، وە بـاری مـوشکیلاتیان سووك بکات!

## پیتی دال

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلدَّالُ عَلَى الْخَيْرِ كَفَاعِلِهِ وَ الدَّالُ عَلَى الشَّرِ كَفَاعِلِهِ**»[2] واتـە: کـەسێ کـە تۆ شـارەزا بـکات بـۆ سـەر ڕێـگەی چاکە و خێر، وە تۆیش ئەو کارە چاکەیە ئەنجام بدەیت، وەکوو ئەوە وایە کە ئەو کەسە خۆی کارەکەی ئەنجام دابێت، وە ئەگەر ئەنجامت نەدا ئەوە ئەو خێری شارەزاکردنەکەی هەرهەیە. وە هەروا کاری خرابیش

١. مسند شهاب القضاعي (٣٦٥/٤).

٢. سنن ترمذی (٢٧٩/٩).

بەو شێوەیە، ئەگەر کەسێ ئینسانێك شارەزا بکات بۆ سەر ڕێگەی خراب و تاوان ئەو کەسە کە شارەزای کردووە شەریکە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلدُّعاءُ مُخُّ العِبادَةِ»[1] واتە: نزاو پاڕانەوە لەزاتی پەروەردگار کاکڵەی عیبادەت و پەرەستشە، چون ئینسان لە پاڕانەوەکەیدا ئارەزوو و ئومێدی لە هەموو شتێ ئەپچڕێنێ وە بە زەلیل خۆی نیشان ئەدات لای خوای گەورە، وە خوای خۆی بە حازرو نازر ئەزانێ، وە لە هەموو شتێ پشت هەڵ ئەکات، وە ترس و خەوفی بەس لە خوایە، کە ئەم حاڵەتەیش ئەبێتە عەینی یەکتاپەرەستی و کاکڵەی عیبادەت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دَعْ ما يُريبُكَ إِلىٰ ما لا يُريبُكَ، فَإِنَّ الصِّدْقَ طَمَأْنِينَةٌ وَالْكِذْبُ رِيْبَةٌ»[2] واتە: تەرك بکە و لێدوور کەوەرەوە لە شتێك کە ئەتخاتە ناو گومان و دوودڵی کە نازانی خرابە یا باشە، یا نازانی ناپەسەندەو خیلافە، یا نازانی حەڵاڵە یا حەرامە، وە... وە بچۆ بۆلای شتێك، کە ناتخاتە ناو گومان دوودڵییەوە و یەقینە لات کە باشەو حەڵاڵە، وە ڕاستی و دروستی دڵی ئینسان لەسەری ئارام و دامەزراو ئەبێت و دڵهوڕەی نامێنێ، بەڵام درۆ و ناڕاستی دڵی ئینسان لەسەری ئارام نابێت و قەرارناگرێ و دانامەزرێ!

---

١. سنن ترمذی (٢٢٠/١١).

٢. صحیح بخاری (٢٠٣/٧) . و سنن ترمذی (٥٨/٩).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلدُّنيا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الْكَافِرِ**»[١] واتە: ژیواری دونیایی بۆ ئینسانی خاوەن بڕوا، وەکوو زیندان وایە، بەو مانا ژیواری ئەم دونیایە، بۆ ئینسانی خاوەن بڕوا بە نیسبەت ژیواری ئاخیرەتی ئەوەی لەوێ بۆی دیاری کراوە، وەکوو زندان وایە سەختی لێ ئەگوزەرێت، بەڵام ژیواری ئینسانی بێ بڕوا لەم دونیادا نیسبەت بەوەی بۆی ئامادە کراوە لە قیامەتدا لە عەزاب و سزای سەخت، ئەم ژیانی دونیایە وەکوو بەهەشت وایە بۆی!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلدُّنيا عِرْضٌ حَاضِرٌ يَأْكُلُ مِنهَا الْبِرُّ وَالْفَاجِرُ وَالْآخِرَةُ وَعْدٌ صَادِقٌ يَحْكُمُ فِيهَا مَلِكٌ عَادِلٌ يُحِقُّ الْحَقَّ وَيُبْطِلُ الْبَاطِلَ فَكُونُوا أَبْنَاءَ الْآخِرَةِ وَلَاتَكُونُوا أَبْنَاءَ الدُّنْيَا فَإِنَّ كُلَّ أُمٍّ يَتْبَعُهَا وَلَدُهَا**» واتە: ئەم دونیایە مەتاو کاڵایەکی حازرو ئامادەیە هەموو چینێك لە گیانلەبەرەکان کەڵك و سوودی لێ وەرئەگرن و لێی ئەخۆن، وە لە گرۆی ئینسانەکانیش چ ئینسانی چاك و چ ئینسانی خراب کەڵك و سوودی لێ وەرئەگرن، و لێی ئەخۆن، وە رۆژی قیامەتیش ئەو شتانەی کە لەوێدا ئەگوزەرێن هەرهەمووەکەی ڕاستن و لەو ڕۆژەدا حوکم بە دادگەری ئەکرێ، وە خوای گەورە خۆی حوکم ئەکات، ئەو خوایەی کە هەموو کارەکانی لە ڕووی دادگەریەوە ئەنجام ئەدات و حەققەکان جێ

---

١. صحیح مسلم (٢٠٥/١٤).

بەجێ ئەکات، وە شتی بەتاڵ لە بەین ئەبات و بەتاڵ بە بەتاڵ دیاری ئەکات. کەواتە ئەی ئینسانەکان کوڕان و پیاوانی ئاخیرەت بن کوڕان و پیاوانی دونیا مەبن، چون هەر دایکێك منداڵەکەی شوێن کەوتووی ئەبێت واتە: ئەگەر شوێنی دونیا کەون ئەوە پیاوی دونیا و کوڕی دونیان، وە ئەگەر شوێنی ئاخێرەت کەون، و کردەوەکانتان بۆ ئاخیرەت بێت لە پیاوانی ئاخیرەت ئەژمێررێن.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلدُّنْيَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا اَلْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ»[1] واتە: ئەم دونیا مەتاو کالایەکە کە ئینسان سوود و کەڵکی موەقەتی لێ وەرئەگرێ و چاکترین مەتاو کالاّی ئەم دونیایە، بۆ ئینسان ژنێکیساڵحە و باشە، کەواتە ژنێك، کە ساڵح و پاك بێت بەرتەری هەیە، بەسەر هەموو نێعمەتەکان و کەلەپووری ئەم جیهانەدا، وە ئەرزشی هەرهەمووەکەی هەیە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلدُّنْيَا مَزْرَعَةُ الْآخِرَةِ»[2] واتە: ئەم دونیایە کشتزارو کێڵگەی ئاخیرەتە، ئینسان هەرچێك لەم دونیایەدا ئەنجام بدات لە ئاخیرەت دا لەو کردەوانەی دونیایە سوودو قازانجی دەس ئەکەوێ و وەری ئەگرێ، وە دەسکەوتی بەس لەوە ئەبێت!

١. سنن الكبرى للبيهقي (٢١٦/٣). و معجم الكبرى للطبراني (٤٤٤/٦).

٢. صحيح مسلم (٣٩٧/٧).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دُورُوا مَعَ كِتَابِ اللّٰهِ حَيْثُ دَارَ»[1] واتە: ئێوە پابەندی فەرمان و دەستوراتەکانی قورئان بن، بەو مانا شتە حەڵاڵەکانی ئەوانەی قورئان بە حەڵاڵی داناون بەحەڵاڵ دابنێن، وە شتە حەرامەکانی ئەوانەی قورئان بە حەرامی داناون بە حەرام بزانن و نزیکیان مەکەون!

وەهەروها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویتی: «اَلدِّينُ اَلنَّصِيحَةُ»[2] واتە: پایەداری دین و مانەوەی بە نەسیحەت و ڕاهنماییە لەبەر خوا و پێغەمبەری خوا، وە لە بەر عاممەو گشتی موسوڵمانان، وە لەبەر کتێبی خوا، کە قورئانی پیرۆزە، واتە هەر یەکە لەمانە حەقی تایبەتی خۆیان هەیە لە وەختی خۆیدا ئەشێ جێ بەجێ بکرێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دِينُ الْمَرْءِ عَقْلُهُ وَ مَنْ لاْدِينَ لَهُ لاْعَقْلَ لَهُ»[3] واتە: دینی ئینسان و باوەڕی ئینسان بە گوێرەی ئاوەزو عەقڵی ئەناسرێت، چون ئینسان بە هۆی عەقڵی ئەتوانێ شتە باشەکان لە شتەخرابەکان لێك بداتەوەو بیانناسێت، کەواتە کەسێ ئاوەزی ئەوەیە نەبێت کە چاك و خراب لەیەك جیابکاتەوە ئەوە ئەو

1. فتح الباري (٢١٩/١٨).
2. صحيح بخاري (٩٨/١) .
3. جامع الكبير للطبراني (١/ رقم الحديث: ١٢٥٢).

کەسە خاوەن دینیکی تەواو نییە، واتە دینێ کە بەدەرد بخوا نیەتی، بۆیە ئەگەر تەعریفی دینی کەسێکیان بۆ ڕەسولی خوا بکرادایەت عەقڵ و ئاوەزی ئەو ئینسانەی تاقی ئەکردەوە، کەوابوو مەحکەمی و دامەزراوی دینی ئینسان بەسراوە بە عەقڵ و ئاوەزی ئەو ئینسانەوە!

## پیتی «ذال»

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«ذِكْرُ اللّٰهِ شِفَاءُ الْقُلُوبِ»**[1] واتە: زیکرو یادی خوای گەورە هۆی لابردن و داماڵینی ژەنگ و تاوانی دڵی ئیمانداره، کەواتە هیچ کات ئینسانی خاوەن بڕوا حەقی دوور کەوتنەوەی لە زیکرو یادی خوای گەورە نییە هەروەکوو دەوای دوکتۆرێك ئەبێتەهۆی لابردنی نەخۆشینە جیسمییەکان زیکرو یادی خوای گەورەیش بەو جۆرە ئەبێتەهۆی لابردنی نەخۆشینی دڵ و ڕەوانی ئینسانەکان!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«اَلذَّنْبُ لاٰ يُنْسَىٰ وَالبِرُّ لاٰ يُبْلَىٰ وَالدَّيّٰانُ لاٰ يَمُوتُ فَكُنْ كَمٰاشِئْتَ»**[2] واتە: تاوان و کردەوەی ناشیرینی ئینسان لە بیر ناچێتەوە لە دەفتەری کردەوەکانیا سەبت ئەبێت و کردەوەی

---

١. الفتح الكبير للسيوطي (١١٥/٢). و فيض القدير (٧٥٥/٣).

٢. جامع الكبير (١/ رقم الحديث: ١٠١٦).

باش و جوانی ئینسان بزر نابێت و لەبەین ناچێت، وە خاوەنی ئەم بوونەوەرەیش، کە خوایە ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکی ئەم کەونەدا مردنی بۆ نییە، کەواتە ئەی ئینسان بە ئارەزووی خۆت بکە ئەختیارت هەیە هەرچێ ئەنجامِ ئەدەیت بە مەیلی خۆتکە، پاڵفتەی مانای ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیە، ئینسان هەرنەوعە کردەوەیەکی ببێت ون نابێت و بزر نابێت لە ڕۆژی قیامەتدا، وە سۆزی لە ڕۆژی پەسلاَندا بە گوێرەی کردەوەکانی خۆی جەزاو پاداش وەر ئەگرێ هەر کام لەو دوو بەشەی هەڵبژاردبێ ئەوە لەو بەشەدا تۆڵەو پاداشی بۆ دیاری ئەکرێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«ذَهَبَ حُسْنُ الْخُلْقِ بِخَيْرِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ»**[1] واتە: هەر کەسێ ئەخلاق و خوو و ڕەوشتی جوان و بەرزی ببێت ئەوە قازانجی دوو دونیای دەس کەوتوە!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«ذُوالْوَجْهَيْنِ لَايَكُونُ عِنْدَاللّٰهِ وَجِيهاً»**[2] واتە: کەسێ کە دوو ڕوو بێت لای کۆمەڵێك بە جۆرێك قسە بکات و لای کۆڕ و کۆمەڵێکیتر بە جۆرێکیتر قسەبکات ئەوە ئەو کەسە لای خوای گەورە هیچ پلەو پایەکی نییەو بێ ڕێزو قیمەت سەیر ئەکرێت!

---

١. المعجم الكبير للطبراني (١٧/٥٥).

٢. شرح ابن بطال (١٧/٣٠٨).

# پیتی ڕێ

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «رَأْسُ الْحِكْمَةِ مَخَافَةُ اللّٰهِ»[١] واتە: ترس لە خوای گەورەو خەوفی خوا لە دڵدا سەرەی هەموو کارێکە، کەواتە هەرکەسێ ترسی خوا لەدڵیا بوو ئەو ترسە بەرگری لێ ئەکات لە هەموو شتێکی ناپەسەند، وە ئەیگێڕیتەوە لە هەر شتێ کە لە ئینسان مەنع کراوە، وە تاعەت و فەرمانەکانی خوای گەورە بەجێ ئەهێنێ و سەرپێچییان لێ ناکات!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «رَأْسُ الدِّينِ اَلْوَرْعُ»[٢] واتە: سەرەی دین و خواپە ڕەستی ترسان لە خوای گەورەو خۆپارێزییە، وە موازیب بوونە لەو شتانەی کە جێگای گومان و دوودڵین، چون کەسێ گوێ بە خۆپاراستن نەدات نزیکە لەوەی بکەوێتە ناو تاوان و هەڵەی ناشیرین، بۆیە یەحیای کوڕی مەعاز ﷺ فەرموویەتی کەسێ زوهدو تەقوای نەبێت ئەوە ئەو کەسە وەرعی نییە!

---

١. شعب الايمان للبيهقي (٣٠٦/٢) . و جامع الكبير (١/ حرف الراء).

٢. جامع الكبير (١/ حرف الراء).

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**رَأْسُ الْعَقْلِ بَعْدَ الْإِيمَانِ اَلتَّوَدُّدُ إِلَى النَّاسِ**»[١] واتە: سەرەی ئاوەزو عەقل لە دوای باوەڕ بەخوای گەورە و باقی شتە ئوسوولییەکان لە دیندا مەحەببەت کردنە لەگەڵ خەڵکدا بەڕوو خۆشی و بەخشین و چاکەکردن لە گەڵیاندا!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**رَحِمَ اللّٰهُ عَبْداً قَالَ:خَيْراً فَغَنِمَ اَوْ سَكَتَ فَسَلِمَ**»[٢] واتە: خوای گەورە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی ئەڕژێنێ بەسەر بەندەکانیدا ئەوانەی هەر وەختێ قسە ئەکەن قسەی چاك ئەکەن و لە پاشەڕۆژدا تووشی پاداش و سەوابێکی گەورە ئەبن، یا بێدەنگ ئەبن و هیچ ناڵێن ئەو کاتە لە سزای سەخت و تۆڵەی پاشەڕۆژ پارێزراو بێوەی ئەبن!

وە هەروەهاپێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**رَضِيتُ لِأُمَّتِي مَا رَضِيَ اللّٰهُ لَهَا**»[٣] واتە: من ڕازی بووم بۆ ئوممەتەکەم بەو شتەی کە خوا لێیان ڕازییە، ئاشکرایە ڕازی بوونی خوای گەورە بە بەجێ هێنانی عیبادەت و فەرمانەکانی خوای گەورەیە لە لایەن بەندەکانیەوە بە ڕێك و پێکی.

---

١. سنن الكبرى للبيهقي (١٠٩/١٠).

٢. جامع الكبير (٦٧٩/١).

٣. المستدرك على الصحيحين للحاكم (٣١٣/١٢) .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**رِيَاضُ الْجَنَّةِ الْمَسَاجِدُ**»[١] واتە: باغچەکانی بەهەشت مزگەوتەکانی سەر ئەرزن. کەواتە: تەرکی هاتوچۆی مزگەوتەکان مەکەن، وە تیایا دانیشن و خەریکی عیبادەت بن، وە بە عیبادەتی خوای گەورە ئاوەدانیان بکەنەوە.

## پیتی زێ

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**زُرْ غِبّاً تَزْدَدْ حُبّاً**»[٢] واتە: بڕێ جار سەردان لە دۆس و ڕەفیق بکە، نەك بە دەوام تا مەحەببەت و خۆشەویستیت زۆر ببێت، چون بەو شێوە ئولفەت و میهرەبانی لەبەینی ئینسانەکاندا زیاتر ئەبێت.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**زُورُوا الْقُبُورَ فَإِنَّهَا تُذَكِّرُكُمُ الْآخِرَةَ**»[٣] واتە: ئێوە بچنە سەرقەبران چون زیارەتی سەرقەبران یەکێکە لە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە بەڕاستی زیارەتی سەرقەبران ئەبێتە هۆی ئەوە کە ئینسان لە بیری قیامەتدا بێت و ئەو مەوقیفەی لە بیر نەچێت!

---

١. جامع الكبير (١/ حرف الراء).

٢. معجم الكبير للطبراني(١١/٤) .

٣. سنن ابن ماجه (٤٣/٥).

وەهەر وەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زَيِّنُوا مَجَالِسَكُمْ بِالصَّلاةِ عَلَيَّ فَإِنَّ صَلاتَكُمْ عَلَيَّ نُورٌ لَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١] واتە: ئێوە جێگا دانیشتنەکانتان بە سلاواتدان لەسەر من برازێننەوە، چون سلاواتدانی ئێوە لە سەر من لە ڕۆژی قیامەتدا ئەبێتە نوورێك و ڕۆشناییەك کە بەهۆی ئەو نوورو ڕۆشناییەوە لەسەر پردی سیرات ڕائەبورن و گوزەر ئەکەن و نەجاتتان ئەبێت[٢]!

## پیتی سین

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلسَّعِيدُ مَنْ وُعِظَ بِغَيرِهِ»[٣] واتە: سەعادەتمەندو خۆشبەخت لەم جیهانەدا کەسێکە کە بە نەسیحەت و ئامۆژگاری غەیری خۆی پەندو نەسێحەت وەرگرێ و دەوام بکات لەسەر بەجێهێنانی یاساو عیبادەتەکانی خوای گەورە.

وە هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلسَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذابِ»[٤] واتە: سەفەرکردن بۆ ئەم لاو ئەولا بەشێکە لە سەختی و سزاکێشان، چون

١. جامع الكبير (١/ حرف الزاء) .

٢. [ئەم دوو حەدیسەی دواییەی پیتی زێ لە نوخسەکەدا نەبوون، بەلام لەبەر ئەوەی ئەم بەشە تەنیا یەك حەدیسی تێدا بوو بە جوانم زانی ئەم دوو حەدیسەی پێ‌زیاد بکەم ـ وەرگێڕ ـ].

٣. الابانة الكبرى لابن بطة (٣/٤٤٨) .

٤. صحيح بخاري (٦/٣١٩) . و موطأ امام مالك (٦/٩٩).

سەفەرکردن جێگای ئەوەیە کە تیایا ماندو وببێت، وە لەگەڵ برسییەتی و توونیەتیدا ڕووبەڕوو ببێت، وە چەنها سەختیتریشی تووش ببێت، جا بەم بۆنەوە بە بەشێك لەعەزاب دانراوە هەرچەن کەڵك و سوودیشی لە پاڵدا ببێت، ئەمما لەکوللا جێگای سەختی و نارەحەتییە بۆ ئینسانی موسافر وە..!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«سَيِّدُ الْقَوْمِ خَادِمُهُمْ»**[1] واتە: گەورەو دڵسۆزی خەڵك کەسێکە کە خزمەت بەو خەڵکە بکات و ئەرکی کارە گرنگەکان بخاتە ئەستۆی خۆی بەتایبەت لە کاتی سەفەر کردنا بۆ ئەملاو ئەولا!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«اَلسُّيُوفُ مَفَاتِيحُ الْجَنَّةِ»**[2] واتە: شمشێرەکانی جیهادگەران لە ڕێگەی خوادا هەڵگرو کلیلی دەرگاکانی بەهەشتی خوان، چون بەهەشتی خوا دەرگاکانی داخراوە لەسەر خەڵکان بۆیان هەڵ ناگیرێن مەگەر بە تاعەت و جیهاد کردن نەبێت لە ڕێگەی خوادا، کەواتە مەگەر بەتاعەت و تێکۆشان لە ڕێگەی خوادا ئەو دەرکانە باز بکرێن، کەوابوو کەسێ تاعەت و تێکۆشانی نەبێت کەی شیاوی ئەوەیە بچێتە ناو نازو نیعمەتەکانی خوای گەورە!

---

١. جامع الکبير (١/ حرف السين).

٢. المستدرك على الصحيحين للحاكم (١٤٩/١٤).

## پیتی شین

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلشَّاهِدُ يَرَىٰ مَا لَا يَرَى الْغَائِبُ»[١] واتە: کەسێك حازری قەزیەیەك و مەسئەلەیەك بێت و ئاگاداربێت بەسەریا و بەجوانی بزانێ ئەو مەسئەلەیە چییە و بەلایەوە ڕوون بێت و کەسێکیش حازری ئەو مەسئەلەیە نەبێت و شتەکەی بەچاو نەدیبێت، لەگەڵ ئەوشەخسەدا فەرق و جیاوازیان زۆرە!

## پیتی «صاد»

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «اَلصَّبْرُ خَيْرُ مَرْكَبٍ»[٢] واتە: خۆگرتن لەسەر بەڵاو موسیبەت یا خۆگرتن لەسەر ئەنجامدانی تاعەت، وە یا لەسەر تەرکی گوناه چاکترین و باشترین وەسیلەو هۆیە، کە ئینسان بەبێوەی بە مەتڵەبی خۆی بگەیەنێ و بیپارێزێ!

---

١. مسند امام احمد (١٠٠/٢) .

٢. وسائل الوصول الى شمائل الرسول للنبهاني (٢٠١/١).

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**اَلصَّبْرُ مِفْتَاحُ الْفَرَجِ وَالزُّهْدُ غِنَى الْأَبَدِ**»[١] واتـە: خـۆگری و تـەحەممول لەسـەر بـەڵاو موسیبەت وە.. هەڵگری هەموو خۆشبەختییەك و ئاسایشێکە بۆ بەندەی موسوڵمان، وە زوهـــدو تـــەقوای خـــوای گـــەورەیش بـــۆ ئـــینسانی مـــوسوڵمان دەوڵەمەندییەکی هەمیشەیی و نەبڕاوەیە!

هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**اَلصَّلاٰةُ عِمَادُ الدِّینِ**»[٢] واتـە: نـوێژ کـۆڵەکەی دینە، وە وەستانی دینی هـەر ئینسانێك بـە نـوێژە، هـەروەکوو کـــۆڵەکـە ئـەبێتە هـۆی ڕاوەسـتانی مـاڵ و نـایەڵێ ئـەو مـاڵە بکەوێ، نوێژیش بۆ ئینسانی خاوەن بڕوا ئاوایە، بەو چەشنە دینی ئینسان ڕاگیر ئەکات و ئەیپارێزێ!

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**اَلصَّلاٰةُ مِفْتَاحُ كُلِّ خَیْرٍ وَالنَّبِیذُ مِفْتَاحُ كُلِّ شَرٍّ**»[٣] واتە: نوێژکردن کلیل و هەڵگری هەموو خێرو قازانجێکە بۆ ئینسانی موسوڵمان، کەواتە ئەوەی خێرو بەرەکەتە لە ناو نوێژدا هەیە، وە خواردنی نەبیز کە نەوعێکە لە مەشروبات هەڵگرو کلیلی هەموو شەڕێك و نەگبەتییەکە بۆ ئەو ئینسانەی پێوە تلاوەو مەسرەفی ئەکات.

١. كشف الخفا للعجلوني (٢١/٢).
٢. جامع الكبير (١/ حرف الصاد).
٣. جامع الكبير (١/ باب حرف الواو).

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «صُومُوا تَصِحُّوا»[١]
واتـە: ڕۆژوو بگرن تا سیحەت و سەلامەتی جیسمی و ڕۆحیتان دەس کـەوێت، چـون ڕۆژوو گـرتن هـەروەکوو ئـەبێتە هـۆی پـاڵفتە بـوونی ئەندامەکانی بەشەر لە ڕواڵەت و باتیندا، هەروا تەئسیریش ئـەکاتە سەر ڕەوان و رۆحی بەشەر و نزیکی ئەکاتەوە لەخوای گەورە!

## پیتی «ضاد»

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ اَلْعِلْمُ»[٢]
واتە: گوم بووی ئینسانی خاوەن بڕوا زانستە، چون ئینسان ئەگەر شتێکی ون کـرد هـەوڵ ئـەبێت و ئـەگەڕێ بـەشوێن ئـەو شـتەدا، هـەروا لەسـەر خاوەن بڕوایش پێویستە بگەڕێ بەشوێن زانستا تا بەهوێ ئەو زانستەوە ژیواری دونیاو ئاخیرەتی دابین کات!

١. فيض القدير (٢٨٠/٤) .
٢. جامع الكبير (١/ باب حرف الضاد).

## پیتی «ط»ێ

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «طَاعَةُ الْمَرْأَةِ نَدَامَةٌ»[١] واتە: فەرمانبەرداری لە ئافرەت کە حوکمفەرما بێت و گەورەی وڵات بێت، یا خەیر لەماڵدا بێت، هۆی پەشیمانییە و نەگبەتییە، ئەمەیش مانای ئەوە نییە کە ئینسان لە ماڵدا هاوکارو کۆمەکی عەیالەکەی نەبێت بەڵکوو مەنزوور ئەوەیە ئینسان لە هەرچی شتە کە ئەرکی سەرشانی پیاوە گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئافرەت نەبێت، چون پەشیمانی و نەگبەتی لە دوایە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «طُوبَىٰ لِمَنْ شَغَلَهُ عَيْبُهُ»[٢] واتە: سەر بەرزی و خۆشبەختی بۆ کەسێك کە عەیب و ئیرادی خۆی مەشغوولّی کردووە، بەو مانا بیر لە ئیرادو عەیبەکانی خۆی ئەکاتەوە ئیتر بیر لە عەیب و ئیرادی ئینسانەکانیتر ناکاتەوە، وە ئەوەیشە بزانین مەقسوود لە عەیب و ئیرادیکی وەهایە کە ئینسان خۆی بەدییان ئەهێنێ و کەسبیان ئەکات، وەگەرنە عەیبی سورشتی و خیلقەتی هەرکەس ئیرادیان لێ بگرێ ئەوە ئیراد و ئیشکاڵی لە خالیق و

١. مسند شهاب القضاعي (٣٦٥/١) . و جامع الكبير (١/ باب حرف الحاء).

٢. شعب الايمان للبيهقي (٤٨٨/٢١).

دروستکەری ئەو شتانە ئەگرێ کە خوای گەورەیە کە ئەمەیش دیارە ناپەسەندەو نابارە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**طُوبَىٰ لِمَنْ طَالَ عُمُرُهُ وَ حَسُنَ عَمَلُهُ**»[1] واتە: خۆشبەختی دونیاو ئاخیرەت بۆ کەسێکە کە تەمەنی درێژو زۆر بێت لەگەڵ ئەوەیشدا کردەوەکانی باش و موافق و بەرابەر بۆ یاساو قانونی خواو پێغەمبەرخوا ﷺ بن.

## پیتی «ظ»ی

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**ظَهْرُ الْمُؤْمِنِ حُمىً إِلّا بِحَقِّهِ**»[2] واتە: شەخسی خاوەن بڕواو خاوەن متمانە پارێزراوە نابێ ئەزیەت و ئازاری بدرێ، وە زەلیل و خوار بکرێ مەگەر حەقێکی شەرعی یا حەددێکی شەرعی ڕووی تێبکات، ئەو کاتە چارە نییە ئەبێ حوکمەکەی خوای بەسەردا جاری بکرێ، ئیتر چاو لەوە ناکرێ کە خاوەن بڕوایە، ئەبێ لەحەق مەعاف بێت و چاوپۆشی لێبکرێ خەیر.

١. سنن الكبرى للبيهقي (٣/٣٧١).

٢. صحيح بخاري (٢/٤٢).

## پیتی عەین

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْعِدَّةُ دَيْنٌ، وَيْلٌ لِمَنْ وَعَدَ ثُمَّ أَخْلَفَ»[١] واتە: قەوڵدان و قەراردان بۆ هەر کارێکی پەسەندو شیاو وەکوو قەرزی ساحیب قەرزێك، کە لە ئەستۆی ئینسانە ئەبێ جێبەجێ بکرێ و ئەدا بکرێ، چون خیلاف وەعدەیی نیشانەی نیفاقە، وەیل، کە سەخترین جێگایە لە جەهەننەمدا، یا سەخترین سزاو تۆڵەیە، بۆ کەسێکە کە قەرارو قەوڵ ئەدات پاشان خیلافی ئەوە بەشوێن وەعدەو پەیمانەکەیا ناچێت، وە هەر لە وەختی وەعدەکەدا قەسدو نییەتی موخالەفەی هەیە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْعُزْلَةُ سَلاٰمَةٌ»[٢] واتە: گۆشەنشینی و کەنارەگیری لە کاری نەشیاو و نابار و دوورکەوتنەوە لە برێکار هۆی بێوەیی و دوور بوونە لە ئاژاوەو بێ بەندو باری!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْعِرْقُ دَسَّاسٌ»[٣] واتە: رەگەزپەرەستی شتێکی نهێنی و شارراوەیە، بەو مانا رەگەزپەرەستی شتێکە وا لە ناو دەروون و دڵی خاوەنەکەیدا دەرناکەوێ!

---

١. جامع الكبير للسيوطى (١/ باب حرف العين).

٢. جامع الكبير للسيوطى (١/ باب حرف العين).

٣. مسند شهاب القضاعي (٢/٤٩٨). و جامع الكبير للسيوطى (١/ باب حرف التاء).

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «عَفوُ الْمُلُوكِ أَبْقَىٰ»[١] واتە: چاوپۆشی کردنی حاکمی وەخت و گوزەشتی لە زۆرێ لە شتەکان ئەبێتە هۆی مانەوەی حاکمییەتی ئەوان، کەواتە چاوپۆشی کردن لەحەددی زاتی خۆیدا وەسفێکی بەرزو چاکە بۆ هەرخاوەن بڕوایەکی ڕاستەقینە، بە تایبەت بۆ گەورە پیاوان جوانترو شیرینترە!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «عَلَى الْيَدِ مَا أَخَذَتْ حَتَّىٰ تُؤَدِّيهِ»[٢] واتە: هەر ئینسانێك شتێکی لە کەسێك بەسوورەتی ئەمانەت، یا بە هەر شکڵێکیتر وەرگرتبێ پێویستە لەسەری ئەو شتە چۆنی وەرگرتووە بەو جۆرە بگەیەنێتەوە بە دس ساحێبەکەی، وە خەیانەتی تیانەکات، چون لەم بارەوە ئایەت هەیە کە ئەفەرمێ: خەیانەت لە ئەمانەتا مەکەن!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْعَيْنُ حَقٌّ»[٣] واتە: چاو پیسی، کە لەناو کورداندا مەشهورە بەچاودان شتێکی حەققە، بەو مانا ئەسڵ و ڕیشەیەکی ئەساسی هەیە، چون خوای گەورە یاساو قانوونی وایە لە نێوان شتە مەوجوودەکاندا بڕێکیان لەسەر بڕێکیتریان تەئسیر دائەنێن و ئەسەریان تیا ئەکەن، مەسەلەن زانایان وتویانە: و تەحقیقیان

---

١. جامع الکبیر للسیوطی (١/ باب حرف العین).

٢. سنن ابی داود (٤٤٧/٩). و سنن ترمذي (٦٠/٥).

٣. متفق علیه.

کردووە لە بڕێك لە ولاّتە ئەفریقییەکاندا نەوعێك مار هەیە کە پێ ئەوترێ (ئەفعی) ئەم گیانلەبەرە خوای گەورە جۆرێ خەلقی‌کردووە بە مەحزی ئەوە چاوی بەئینسانێك یا هەرگیان لەبەرێکی‌تر کەوت ئەو ئینسانە یا ئەو گیانلەبەرە مەسموم ئەکات بەبێ ئەوەی بیگەزێت، یا نزیکی کەوێت، یا ئەسڵەن نەخۆش ئەکەوێت و لەبەین ئەچێت، وە تەئسیری ئەو چاو پیسیە کە لە نێوان خەڵکداهەیە، وەکوو ئەوە وایە بڕێك لەئینسانەکان وەسفی حەسوودی و بەخاڵەت لە وجوودیانا هەیە بە مەحزی ئەوە خستیانەکار ئەو تەئسیرە لەو شتە موقابیلەدا دائەنێ، وەخوا بۆی خەلق ئەکات، کە ئەمە شتێکە جێگای گومان نییە چون هەم حەدیس و هەم ئایەت بەم مەوزووعە و باسە ئاماژەیان کردووە!

## پیتی غەین

هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «اَلْغِنَیٰ غِنَی النَّفْسِ وَالْفَقْرُ فَقْرُ النَّفْسِ»[1] واتە: دەوڵەمەندی و بێ‌نیازی ئینسان ئەوە نییە کەلەپووری دونیای زۆر بێت و نیازی بە کەس نەبێت بەڵکوو دەوڵەمەندی ئەوەیە کە ئینسان نەفسی دەوڵەمەند بێت، واتە چاونەبڕێتە ئەوەی کە لە دەستی

١. متفق علیه.

خەڵکی تردایە، ئەوە پێی ئەوترێ دەوڵمەندی، وە هەروەها فەقیریش بەوە ناڵێین کە ئینسان هیچی نەبێت و هەژاربێت، بەڵکوو فەقیرو نەبوو بەکەسێك ئەڵێین کە چاوی لە دەستی خەڵکانە لەگەڵ ئەوەیشدا خۆی سەروەت و کەلەپووری زۆرە!

## پیتی فێ

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**اَلْفِتْنَةُ نَائِمَةٌ لَعَنَ اللّٰهُ مَنْ أَيْقَضَهَا**»[1] واتە: مێحنەت و موشەققەت لەنێوان ئینسانەکاندا خەوتووەو خۆی حەشارداوە و بێدەنگە، نەفرینی خوا لەو کەسەی کە بێداری ئەکاتەوە و هەڵی ئەگیرسێنێ لەناو کۆمەڵگادا، وە ئەوەیشە بزانین دوو جۆر فیتنەمان هەیە: یەکەم فیتنەی شوبهەیە، کە بریتییە لە تێکدانی نێوان خەڵك لە سەر ڕێگەو بەرنامەی خۆیان، کە ئەم بەشەیە زۆر خەتەرناکە، دووهەم فیتنەی ئارەزواتە، کە بڕێکات هەردوکیان لەئینساندا کۆ ئەبنەوە و بڕێکاتیش بەتەنهان!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**فِعْلُ الْمَعْرُوفِ يَقِي مَصَارِعَ السُّوءِ**»[2] واتە: کردەوەی چاك و ئەخلاقی شیرین لەگەڵ خەڵکدا،

---

١. جامع الكبير للسيوطي (١/ باب حرف الفاء).

٢. صحيح كنوز السنة (٣٨/١). و مسند شهاب القضاعي (٦٣/١).

وەکوو چاکەکردن لەگەڵیان یا مولاحەزە کردنیان بەماڵ یا چارەسەر کردنی موشکلاتیان یاچون بە دەمیانەوە لەکاتی تەنگیا و کاتی ناڕەحەتیا وە... وایە، ئەم جۆرە کردەوانە ئەبنە هۆی ئەوە خاوەنەکەیان ئەپارێزن لەو جێگانەی کە جێگای خەیانەت و خرابین و ناو جەرگەی بەدبەختین، یا لەکاتی مردندا خاوەنەکەی ئەپارێزن لەحالات و سەختییەکانی گیاندەرچون!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فِي كُلِّ ذاتِ كَبِدٍ حِراءٍ أَجْرٌ»[1] واتە: لە تێرکردن و ئاودان بەهەر گیانلەبەرێکی خاوەن دڵ جەزاو پاداشێکی دیاری‌کراو هەیەلای خوای گەورە، کەواتە: ئاودان یا شکاندنی تینوەتی هەر شتێك لە گیانلەبەرکان بەتایبەت ئادەمیزا دی خاوەن بڕوا ئەجرو پاداشێکی یەگجار زۆری هەیە لای خوای گەورە!

## پیتی قاف

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْقَرِيبُ مَنْ قَرَّبَتْهُ الْمَوَدَّةُ وَإِنْ بَعُدَتْ»[2] واتە: کەسێ نزیکە لەتۆ، کە مەحەببەتی زۆرتر بێت و مەحەببەت و خۆشویستنی لەبەر خوا نزیکی کردبێتەوە هەرچەن

١. صحيح بخاری (٣٥٣/٨) .

٢. جامع الكبير للسيوطی (١/ باب حرف القاف).

ئەوکەسەیش نەسەبی دورە و پەیوەندی خزمایەتیش لەبەیندا نییە، کەواتە: خــزمی نــزیکی ئــینسان کــەسێکە مــەحەبەتی زۆرتــر بــێت و ڕەبت و عەلاقەی لەبەر خوابێ!

وە هـەروەها پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «قُلْ آمَنْتُ بِاللّٰهِ ثُمَّ اسْتَقِمْ»[1] واتـە: ئیمان و بڕوای خۆت تازە بکەرەوە و بە زمان بڵێ باوەڕم هەیە بە خواو بەرنامەکەی زاتـی پەروەردگار، پاشان لە سـەر ئـەو باوەڕە پایەدارو دامەزراو بە، وە بە موخالەفەی یاسای خوا مەجوڵێرەوە!

هــــەروەها پــێغەمبەری خــوا ﷺ فـــەرموویەتی: «قِلَّةُ الْعِيَالِ أَحَدُ الْيَسَارَيْنِ»[2] واتـە: کـەم خێزانی بەشێکە لە بەشەکانی دەوڵەمەندی هەردوو دونـیا، کـەواتـە: ئـەو کـەسانەی خاوەنی خێزانێکی کەمن و موسوڵمانن، وە بـەجوانـی خـێزانـەکەی لە پـێناوی دیـندا بـارهێناوە لە هـەردوو دونـیادا دەوڵەمـەندە، لە دونیادا ئاشکرایە، وە لە قیامەتیشدا موحاسەبەیان سوك و کەمترە!

وە هـەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فـەرموویەتی: «قُلِ الْحَقَّ وَ إِنْ كَانَ مُرّاً»[3] واتـە: حـەق ویژبە و حـەق بـڵێ هـەرچەن بەلاتەوە سـەخت بێت و

---

١. صحيح مسلم (١٤٥/١). و مسند امام احمد (٤٣٧/٣٠).

٢. جامع الكبير للسيوطي (١/ باب حرف التاء) .

٣. صحيح ابن حبان (٢١٣/٢). و شعب الايمان للبيهقي (٤٤٣/١٠).

سەختیش بۆت تەواو بێت، کەوابوو ئەگەر حەقێك هاتە بەرەوە و ئینسان نیازی بەوەبوو کە بەیانی بکات نابێ کەتمی کات و بیشارێتەوە هەرچەن لەو بەیانکردنەدا پێی سەخت و نارەحەت بێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«قَلِيلٌ تُؤَدِّي شُكْرَهُ خَيْرٌ مِن كَثِيرٍ لَاتُطِيقُهُ»**[1] واتە: سەروەت و کەلەپوورێکی کەم، کە بتوانی شوکرانەی خوای گەورەی لەسەر بکەیت چاکترەو باشترە بۆتۆی خاوەن بڕوا، تا ئەو سەروەت و سامانەی، کە زۆرەو ناتوانی شوکرانەی خوای پێ بکەی، وە بەجێی خۆی بگەینی!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«اَلْقَنَاعَةُ كَنْزٌ لايُفْنىٰ»**[2] واتە: قەناعەت و ڕازی بوون بەکەم و تەحەمول و خۆگرتن لەبەرابەریەوە، وەکوو خەزانەیەکی زێرو گەنجینەیەك وایە کۆتای نایت و تەواو نابێت، بەو مانا ئەوکەسەی، کە بەکەم ڕازییە لەکاتی تەنگانەو نەبوونیدا، ئەو شتە کەمە ئەیگەیەنێ بە مەقسەد، هەروەکوو خەزانەیەك کە دوایی نایەت ئەویش وایە بەو کەمە ڕازییە ئیتر نیازی بە خەڵك نییە!

---

١. دلائل النبوة للبيهقي (٣٧٥/٥) .

٢. الزهد الكبير للبيهقي (١١٦/١).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «قَيِّدْ وَتَوَكَّلْ»[1] واتە: تۆ لە کارەکانتا مەحکەم کاری بکە جا تەوەککول ببەستە لەسەر خوا، چون لە مەحکەم کردن و مەحکەم کاری چ بۆ کاری دونیا یا بۆکاری دینی دژایەتی لەگەڵ پشت بەستن و تەوەککولدا نییە، کەواتە: بەستنەوەی حەیوانێك یا هەرچی وا لە ئەختیارو ژێر سەیتەرەی ئینساندا پاشان پشت ببەستی بەخوا، هیچ دژایەتیکیان لە بەیندا نییە!

## پیتی کاف

وە هەروەها پەغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «كَفَىٰ بِالْمَرْءِ إِثْماً أَنْ يُحَدِّث بِكُلِّ مَايَسْمَعُ»[2] واتە: بە سە بۆ ئینسان ئەگەر هیچ تاوانێك و خەیانەتێکی نەبێت ئەوەی کە ئەیبیسێ بیگێڕێتەوە، چون مەعلوم و ئاشکرایە ئینسان هەم درۆ ئەبیسێ لەخەڵك، وەهەم ڕاستیش ئەبیسێ جا کەوابوو هەرچێ، کە بەگومانی خۆی وا ئەزانێ ڕاستە بیگێڕێتەوە، وەگەرنە کۆتابێت، دەس لە وەیە کە ئەزانێ درۆیە بکێشێ ئەمەیش کاتێ وایە، کە بەو گێڕانەوە تووشی زەرەرو زیانێك نەبێت وەگەرنە حەرامە

---

١. جامع الكبير للسيوطى (١/ باب حرف القاف).

٢. سنن ابى داود (١٧٤/١٣). و المستدرك على الصحيحين للحاكم (٣٧١/١).

گێڕانەوەی و باس کردنی!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«كَفَىٰ بِالمَرْءِ إِثْماً أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ»**[1] واتە: بەسە بۆ تاوان و خرابەی ئینسانێك ئەگەر هیچ تاوانێکی‌تری نەبێت ئەوە کە لەبەین ببات و بفەوتێنی تەعام و خۆراکی کەسێ کە لەسەریەتی بیدا بەو کەسانەی کە نەفەقەیان لەسەریەتی، واتە: ئەگەر ئینسانێك موازەبەت نەکات لەسەر خەرج و مەخاریجی ئەو کەسانەی کە مووچە خۆری ئەون و وان لە ژێر ڕکێفی ئەودا، ئەوە بۆ تاوانی ئەو کەسە بەسە، ئەگەر تاوانی تریشی نەبێت!

وە هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«كَفَىٰ بِكَ إِثْماً أَنْ لاتَزالَ مُخاصِماً»**[2] واتە: بەسە بۆ تۆ ئەی ئادەمیزاد، کە تاوانت هەرئەوە بێت، کە هەمیشە خەریکی کێشەو نیزاع بێت، وە هیچ کات لێبوردنت نییە و خاوەن گوزەشت نیت، کەواتە: کێشەو جیدالی بێ‌جێگە تاوانە و ئەشێ ئینسان دووری لێبگرێ و تەرکی کات!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە تی: **«كَفَىٰ بِالدَّهْرِ واعِظاً وَ بِالْمَوْتِ مُفْرِقاً»**[3] واتە: زەمان و ڕۆژگار بەسن کە مامۆستاو فێرکەری

---

١. مسند احمد (٢٤٥/١٣). و سنن الكبرى للبيهقي (٤٦٧/٧).

٢. سنن الترمذي (٢٧٢/٧).

٣. بغية الحارث (٢٧٧/١).

ئینسان بن کە دەرس و عیبرەتیان لێ بگرێت، کەواتە ئەگەر ئینسان لەلایەنی کەسێکەوە وەعزو نەسیحەت وەرنەگرێت زەمانە فێری ئەکات و ئەدەبی دا ئەدات، وەهەروا، هۆ بۆ جیایی لە دۆست و ئەحباب و خۆشەویستان مردن بەسە، واتەهیچ شتێ وەکوو مردن جیایی ناخاتە نێوان دوستان و خۆشەویستان لە دونیادا!

وە هەروەهاپێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:«**كُلُّ ما هُوَ آتٍ قَرِيبٌ**»[1] واتە: هەرشتێ لە مەودوا بێت نزیکە، هەرچەن لەلای ئێمە بە دووری دابنێن بەڵام لای خوای گەورە هاتنەکەی نزیکە. مەسەلەن وەکوو هاتنی ڕۆژی قیامەت و هەرچێ لەو ڕۆژەدا ڕوو ئەدات، هەرچەن بەلامانەوە وا بزانین دێردێت بەڵام لای خوای گەورە زۆر نزیکە!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرمو یەتی: «**كُلُّ الصَّيْدِ فِي جَوْفِ الفَرْءِ**»[2] ئەم فەرموودەیە پێغەمبەری خواﷺ بە ئەبووسوفیانی فەرمووە و حاڵەتی زەربولمەسەلی هەیە، ئەمەیش لەکاتێکدابوو کە نوێنەری خوا ئیزن و ئیجازەی بە تەواوی قورەیشییەکان فەرموو بەڵام ئیزنی بۆ ئەبوو سوفیان خستەدواوە، وەئەبووسوفیانیش بێتاقەتی نیشان دا فەرمووی: نزیك نەبوو کە تۆ ئیزن بەمن بدەی، حەتتا نزیك بوو، کە ئیزن بەدوو

١. سنن الكبرى للبيهقي (٣/ ٢٢٥).

٢. جامع الكبير (١/ حرف الياء).

لێوارەی ئەو دوو شیوەیە بدەیت، ئەمەیش کینایەبوو لە دوا کەوتنی ئیزنی پێغەمبەری خوا بۆ ئەبووسوفیان، واتە: تۆ ئەی ئەبووسەفیان وەکوو گیانلەبەرێکی هەردی وایتە، کە مەشهوورە بە گوێدرێژی هەردی، کە تەواوی شکارەکان لەدوای ئەون، ئەمەیش کنایەیەکە ئەم فەرموودەیە، ئەوەیە تۆ ئەگەر موسوڵمان بیت تەواوی قەبیلە لەدوای تۆ موسوڵمان ئەبن!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«كُلُّكُمْ راعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَّعِيَّتِهِ»**[1] واتە: هەر یەکە لە ئێوە بۆ بارهێنان و پاراستنی دین و باوەڕی ئەوانەی، کەوان لە ژێردەستی ئێوەدا، وەکوو شوان وانە، چۆن شوان ئەمیندارو پارێزەری ڕانەکەیەتی ئێوەیش ئاوا ئەمیندارو پارێزەری ئەو کەسانەن کە وان لەژێر ڕکێفی ئێوەدا، کەواتە چۆن شوان ئەبێ ئیحساس مەسئوولییەت و لێپرسینەوە بکات ئێوەیش ئاوانە، جا هەر کەسێ لە دونیادا لەگەڵ ژێر دەستەکانی خۆیدا بە دادگەری جولاّیەوە ئەوە لەو دونیادا خاوەنی جەزاو پاداشێکی زۆر گەورەیە، وە گەرنە هەریەکە لەژێردەستەکانی داخوازی ئەوە ئەکەن بۆ ستەمیان لێکراوە.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ»**[2] واتە: هەرچێ پێداویستی ئینسانی موسوڵمان

---

١. صحيح بخاری (٤١٤/٣) .

٢. صحيح مسلم (٤٢٦/١٢).

هەیە لە ماڵی، لە خوێنی، لە نامووس و کەلەپووری، ناڕەوایەو ناپەسەندە لەسەر موسوڵمانێکی‌تر بەناحەق دەس‌درێژی بۆ بکات، کەواتە ئینسانی موسوڵمان ئـەو سێ شتەی و باقی شتەکانی‌تری پارێزراون هیچ کەسێ حەققی نییە دەسیان بۆ درێژکات و داگیریان کات!

وهەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ»**[1] واتە: هـەرچی شتە لە وتارو کرداری ئینسان، کە ئەیلێ و ئەنجامی ئەدات لە دەفتەری تـۆمارگای کردەوەکانی دا بـە خێرو چاکە بۆی ئەنووسرێت و حیساب ئەکرێت کەوابێ سەدەقـە تەنها شت بەخشین نییە لە ڕێگەی خوادا، بەڵکوو هەرکردارێکی چاك بـۆ ئینسان، کە ئەنجامی ئەدات سەدەقە و خێرە بۆ خاوەنەکەی، وە بەشتێکی چاکی بۆ ئەژمێررێت و حیساب ئەکرێت!

وە هـەروەها پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: **«كُلُّ مُؤْذٍ فِي النَّارِ»**[2] واتـە: هـەر کـەسێ ئەزیەت و ئازاری بێت لە دونـیادا لە ڕۆژی قـیامەتدا جێگای ئاوری جەهننەمە و سزایەکی سەخت چاوەڕوانی ئەکات.

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: **«كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَاخُلِقَ لَهُ»**[3] واتـە: هـەرچی کـەسە، لە ئـەزەلدا، واتـە: لە ڕۆژی ئـەووەڵدا لەلایـەنی

---

١. صحیح بخاری (٤٤٢/١٨) .

٢. جامع الکبیر (١/ حرف الکاف).

٣. صحیح بخاری (٨٧/٢٣) .

خـوای گـەورەوە بـۆی ئامادەکراوە ئـەوەی بـۆی خـەلق‌کراوە، وە قـەتعەن لەگەڵی ڕووبەڕوو نەبێت و لەو شتە لانادات!

وە هــەروەها پــێغەمبەری خــوا ﷺ فــەرموویەتی: «**كَلِّمُوا النَّاسَ بِمَا يَعْرِفُونَ وَ دَعُوا مَايُنْكِرُونَ**»[١] واتە: قسەو گفتوگۆ بکەن لەگەڵ خەڵکدا، بە گوێرەی ئەو شتەی کە ئەیزانن، وە ئاگاداریان هەیە بەسەریا، وە شتێ کە ئاگاداریيان نییە بەسەریا لەگەڵیان مەدوێن، کەوابوو ئینسانی خەتیب وە... ئەشێ بەگوێرەی ڕوشدو دەرکی ئەو خەڵکەیە قسەیان بۆ بکات، شتێ کە لە ئاوەز و دەرکی ئەوان بەدوورە و بۆیان هەزم نابێت باس نەکات، یا لە قاڵبێکی جوان و ڕێك و پێکا باسی بکات!

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**كَمَا تُدِينُ تُدَانُ**»[٢] واتـە: بە هـەر شـێوەیێ تۆ ڕەفتار بکەی لەگەڵ خەڵکدا، بە گـوێرەی ئەو ڕەفتارو حەرەکەتەت جەزاو پاداشت وەرئەگری، یا بەم مانایە تۆ بە چ شـێوەیی پاداشـی خـەڵك ئـەدەیتەوە لەسـەر کارو پیشەیان، خـەڵکیش وا ڕەفتار ئەکەن لەگەڵ تۆدا و جەزاو پاداشت ئەدەنەوە لەسەرکارو پیشەت!

هــــەروەهاپێغەمبەری خــــوا ﷺ فــــەرموویەتی: «**كَمَا تَكُونُوا يُوَلَّىٰ عَلَيْكُمْ**»[٣] واتـە: ئـێوە لە تـەقواو خـۆپارێزی و عـیبادەتدا چـۆن بـن لەگـەڵ

---

١. صحيح بخاری (١٣٣/۶).

٢. صحيح بخاری (٣٨٥/١٣) .

٣. جامع الكبير (باب حرف الكاف).

خوادا و ئەندازەی ئەو وەسفانە چەن دەرسەد بۆ خوایە، بەو ئەندازەیە خوا کەسێك ئەكا بە سەرپەرەست و حاكمی بەسەرتانا، كەواتە ئەگەر ئێوە خواترسیتان باش بێت، خوای گەورەیش یەكێكی باش و دادگەر ئەكا بەسەر پەرەست و حاكمی ئێوە، وە ئەگەر ئێوە ستەمگەر بن و نا عادلانە بجولێنەوە، خوایش هەر لە نەوعی خۆتان ئادەمیزادێكی ستەمگەر ئەكا بەسەرپەرەست و گەورەتان!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ وَ عُدْ نَفْسَكَ فِي أَهْلِ الْقُبُورِ**»[1] واتە: لە دونیادا بژیی بە وێنەی ژیانێكی ئینسانی غەریب و دوور لە ولاتی خۆی، چۆن هەر لەحزەو كات چاوەڕوانی ئەوەیە بگەڕێتەوە بۆ ولاتی خۆی، تۆیش لەم دونیایەدا ئاوابە، یا چۆن گەورەیەك نۆكەرەكەی خۆی ئەنێرێ بۆ جێگایەك كە ڕاسپاردەیەك بگەینێ و دوای گەیاندنی ڕاسپاردەكە ئەبێ بگەڕێتەوە، تۆیش ئا لەم دونیایەدا ئاوابە، كەوابوو ئینسانی هۆشیار ئالەم دونیایەدا، ئەبێ بە وێنەی موسافرێك یا ڕێبوارێك خۆی حیساب كات و خۆی دانێ، چون دونیای نەبڕاوە كە دونیای قیامەتە، وەتەن و ماوای ئینسانە، نەك ئەم دونیایە، كەواتە ئەی ئینسانی خاوەن ئاوەزا! خۆت وەكوو ئەهلی قەبران حیساب بكە واتە خاك تەبێعەت بە!

---

۱. صحیح بخاری (۳۸/۲۰). و سنن ترمذي (۳۳۳/۸).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَابَعْدَ الْمَوْتِ، وَ الْعَاجِزُ مَنِ اتَّبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا وَ تَمَنَّىٰ عَلَى اللّٰهِ الْأَمَانِيَّ**»[١] واتە: عاقڵ و خاوەن ئاوەز کەسێکە، کە هەمیشە موحاسەبەی نەفسی خۆی ئەکات، وە نەفسی خۆی ڕام ئەکات بۆ فەرمانبەردای و نایەڵی لە بەرنامەی خوا دوور کەوێتەوە، وە تاوانبار و خەتاکار کەسێکە، کە نەفسی خۆی شوێنکەوتوی ئارەزواتی خۆی ئەکات و بەرگری ناکات لە شتی حەرام، و لە شتە لەزیزەکانی ئەم دونیایە، وە لەخوایش داخوازی و تەمەنناى بەهەشتی خوا ئەکات بەبێ ئەوەی گەڕانەوەیەکی ببێت بۆلای خوا، یا تەوبە و ئیستیغفارێکی هەبێت، وە بڕێکیش لە زانایان مانای وشەی عاجزیان واداوەتەوە، کە ئینسان نەفسی غاڵب و زاڵکات، وە هەرچی بڵێت بە ویستی ئەو بجوڵێتەوە و بێئەمری نەکات!

---

١. سنن ترمذی (٨/ ٤٩٩).

# پیتی لام

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرمـوویەتی: «لِدُوا لِلْمَوْتِ وَابْنُوا لِلْخَرَابِ»[١] واتە: ئێوە لەم دونیایەدا لە دایك ببن بۆ مردن و ماڵیش دروست بکەن بۆ وێران بوون، کەواتـە: ئینسان بە مـەحزی ئەوە هاتە دونیاوە و خـاوەنی ژیـان بـوو، قـەتعەن مردنیشی بـــۆ قـەرار ئەدرێ، وە مادام بژی قــەتعەن نــیازی بــەماڵ و جــێگای ســکوونەت و حــەسانەوە هــەیە، وە حـەتمی هـەر وەکـوو خـۆی ئەمرێ ڕۆژێ لە ڕۆژان مـاڵەکەیشی وێـران ئەبێت و لەبەین ئەچێت.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لَسْتُ مِنَ الْبَاطِلِ وَ لا الْبَاطِلُ مِنِّي»[٢] واتـە: مـن لەگـەڵ شتی بـەتاڵ و خـرابدا سـەروکارم نـییە، وە شـتی بـەتاڵیش لەکـارو ڕەفـتارو وتـاری ئـێمە نـییە، کـەواتـە: پـێغەمبەری خـوا ﷺ هـیچ کـات شـتی بـەتاڵ و نـاموناسبی ئـەنجام نـەداوە و شـتی ناموناسب و بەتاڵ بەشێ لەیاسای ئەونەبووە!

---

١. جامع الكبير (١/ باب حرف الميم).

٢. سنن الكبرى للبيهقي (٢١٧/١٠).

وه هــــەروەها پــێغەمبەری خـــوا ﷺ فـــەرموويەتی: «لَيْسَ الْخَبَرُ كَالْمُعَايَنَةِ»[١] واتە: هەواڵدان لەلایەنی کەسێکەوە وەکوو چاو پێکەوتن نییە، واتە: ئەم دوو شتە بەرابەر نین بەڵی هەردوکیان جێگای بڕوان بەڵام دیتن بەچاو، وەکوو بیستن بە گوێچکە نییە، چون ئەوەی ئەبیسرێ ئیمکانی ئەوەی هەیە هەواڵدەرەکە هەڵەی تیابکات و بە دەقی خۆی شتەکە نەگێڕێتەوە و باسی نەکات، بەڵام ئەمەیش لەو خەبەرانەی کەگومانی ئەوەی تێئەچێ کە هەڵەی تیابکرێ، ئەمما خەبرێك کە گومانی هەڵەی تیا نەکرێت، وەکوو کەلامی خوا، یا کەلامی پێغەمبەران بەتایبەت پێغەمبەری خۆمان ﷺ ئەوە لە چاوپێکەوتن قەویترە و زۆرتر جێگای بڕواو متمانەیە!

## پیتی میم

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی: «مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ»[٢] واتە: ئاوی زەمزەم کە گەورەترین ئاوە، وە با ئەرزشترین ئاوەکانی سەرئەرزە، بۆ هەرنیازمەندییەك بخورێتەوە جێی خۆی ئەگرێت، ئەگەر

١. مسند امام احمد (٢٧٧/۴) .

٢. سنن ابن ماجه (١٨٢/٩) .

بۆ نەخۆشینە ئەبێتە شیفای ئەو نەخۆشە، وە ئەگەر لەجێ تەعامە ئینسان تێرئەکات، یا ئەگەر بۆ تینوەتییە خوا تینوەتییەکەی پێ ئەشکێنێ وە... هەزاران سودو قازانجیتریش لە ئاوی ئەو چاوگە پاکەیە ئەبینرێت، وە ئاوێکە چەنجار سینەی پڕ لەئەوینی حەزرەت ﷺ و دڵی موبارەکی بە ئاوی ئەو چاوگە پاکەیە، کەزەمزەمە شۆرراوەتەوە وە...!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَا آمَنَ بِالْقُرْآنِ مَنِ اسْتَحَلَّ مَحَارِمَهُ»**[1] واتە: باوەڕو عەقیدەی بەقورئانی خوا نییە کەسێك کە ئەو شتانەی قورئان بە حەرامی داناون بە حەلاڵیان بزانێت، ئەڵبەتە نەك تەنها ئەوانەی کە لە قورئاندا هەن، بەڵکوو هەرشتێ، کە خوا یان پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەرامیان داناون بەحەلاڵیان بزانێ ئەوە بەقەتعی پێی کافر ئەبێت، وە لەدائیرەی دین خارج ئەبێت و دەرئەچێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَا أُعْطِيَ عَبْدٌ شَيْئاً شَرّاً مِنْ طَلَاقَةٍ فِي لِسَانِهِ»**[2] واتە: نەبخشراوەو عەتا نەکراوە بەهیچ بەندەیەك لە بەندەکانی خوای گەورە شتێ کە خراپتر بێت لەوە کە ئەو بەندەیە بە مەیلی خۆی زمانی هەڵچەرخێنێ و بەرەڵای بکات لە هەر شتێکدا کە بێمەعنایە، وە لە هەر شتێکدا، کە مەتڵەب و پێویستی ئینسان نییە!

---

١. سنن ترمذي (١٦٠/١٠) .

٢. جامع الكبير ( ١/ باب حرف الميم).

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**مٰا تَشٰاوَرَ قَوْمٌ إِلّٰا هُدُوا**»[١] واتـە: هـیچ گـەلێك نییە كاروبارەكانی ئەو گـەلە بـە مـەشوەرەت و ڕاوێژ بێت، ئیللا ئەو گەلە سەربەرزو مووەففەق و هیدایەت دراو ئەبن، كەواتە كارێ كە بێمەشوەرت بكرێ بە دەگمەن ڕێك ئەكەوێت ئینسان لەو كارەدا ناجح و سەركەوتوو بێت!

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتـی: «**مٰا جَمَعَ شَيْءٌ إِلیٰ شيْءٍ أَحْسَنَ مِنَ الْعِلْمِ إِلَى الْحِلْمِ**» واتـە: هـیچ دوو شـتێك نـییە كـۆببنەوە لەگەڵ یەكتردا جوانترو شیرینتربن بەلای منەوە لەوە، كە ئینسانێك لەگەڵ زانستەكەیا ئەو زانستەی خوا پێیداوە خۆگرو بەحەوسەڵە بێت، بەو مانا لەپاڵ زانستەكەیا بە حیلم و سەبر بێت!

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**مٰاخٰابَ مَنِ اسْتَخٰارَ وَلٰانَدِمَ مَنِ اسْتَشٰارَ وَلٰاعٰالٍ مَنِ اقْتَصَدَ**»[٢] واتـە: تـووشی زیان و خـەسارەت نابێت كەسێ بۆ كارە موباحەكانی ئیستیخارە بكات و دوعای ئیستیخارە بخوێنێ، واتە: لە كارەكانیا بگەڕێتەوە بۆلای خوای میهرەبان، وە هەروەها پەشیمان و چاولەدوا نییە كەسێك، بۆ ئەنجامدانی كارەكانی مـەشوەرەت و ڕاوێژ بكات بەكەسانێ كە لەو كارەدا سەریان دەرئەچێ و ئاوەزیان پێ

١. الأدب لابن أبي شيبة (٥٤/١). والجامع لابن وهب (٢٩١/١).
٢. المعجم الوسيط للطبراني (٣٩٣/١٢٤).

ئەشكێ، وە فەقیرو بێدەسەڵات نییە كەسێك، كە لەخەرج و مەخاریجا دەس پێوەگربێت و هەڵەخەرج نەبێ، وە لە زیادەڕەوی خۆی پارێزێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مٰارَآهُ الْمُسْلِمُونَ حَسَناً فَهُوَ عِنْدَاللّٰهِ حَسَنٌ**»[1] واتە: ئەو شتەی كە كۆمەڵ و جەمعی موسوڵمانان بەگوێرەی زانستی خۆیان و تێكۆشانیان بەچا كی دابنێن و بەچاكی بزانن ئەوە لای خوایش چاكەو باشە، چون هیچ كات موسوڵمانی لێزان و تێگەیشتوو شتێ كەخراب بێت و خاوەن زیان بێت بۆ كۆمەڵگای موسوڵمانان ڕەوا نابینێت و بۆیان دیاری ناكات!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مٰاضٰاقَ مَجْلِسٌ بِمُتَحٰابَّیْنِ**»[2] واتە: هیچ كات مەجلیسێك و جێگا دانیشتنێك لەسەر ئینسانی خاوەن بڕوا كە مەحەببەتیان بۆ خوابێت تەنگ نابێت بەڵام ئەم دونیا وەسیعەو بەرینە لە سەر دودانە ئینسانی بەخیل و بەرچاو تەنگ بچووك و تەنگەلان ئەبێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مٰاقَلَّ وَكَفیٰ خَیْرٌ مِمّٰاكَثُرَ وَ أَلْهیٰ**»[3] واتە: ئەوەی كەلەپوور و سەروەتی دونیایە بۆ ئینسان

---

١ موطأ امام مالك (٣/٨٠).

٢. جامع الكبير ( ١/ باب حرف المیم).

٣. مسند امام احمد (٤/١٩٧).

ئەگەر کەم بێت و بەئەندازەی پێداویستی ئەو بێت زیاتر نەبێت، باشترەو بەسوودترە بۆ خاوەن بڕوا، تا سەروەتێك کە زۆر بێت و ئینسان مەشغوڵ بکات لە تاعەت و فەرمانبەرداری خوای گەورە، هەروەها لە ئایەتی بەقیمەتی قورئاندا هاتووە ئەگەر ئینسان دیی کە سەروەت و کەلەپووری زۆر بووە سەرپێچی ئەکات، وە دوور ئەکەوێتەوە لە زیکرو فیکری خوای گەورە!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**مَاكَانَ الرِّفْقُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ وَ مَاكَانَ الْفَحْشُ فِي شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ**»[١] واتە: نەرمی و ئارامی بەکاربردن لە کارەکانی ئینساندا نییە لە هیچ شتێکدا ئیللا ئەو کارە پەیوەند ئەدات و جێبەجێ ئەبێت و سەر ئەگرێ، کەواتە نەرمش و ئارامی لە هەرکارێکدا هۆی سەربەرزی و مووەففەقییەتە لەو کارەدا، وە پێچەوانەکەیشی ئەبێتە هۆی تێکدان و ئاڵۆزی کارەکە، وە لەجێ خۆیدا نامێنێ!

وە لە ڕیوایەتێکیتردا بەم جۆرە فەرموودەکەی باس کردووە: «**مَاكَانَ الرِّفْقُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ وَلَا نُزِعَ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ**»[٢] واتە: نەرمی و ئارامی لە هەرکارێکدا ئەبێتە هۆی پەیوەندی و دروست بوونی کارەکە، وە

١ مسند امام احمد (١٨٤/٥).

٢. شعب الایمان للبیهقي (٤١٨/١٤). المعجم الاوسط للطبراني (٢٢٤/٥).

لابردنی نەرمش و ئارامی لە هەرکارێکدا ئەبێتە هۆی زایع کردنی و لەبەین بردنی کارەکە!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**ماهَلَكَ اِمْرِئٌ عُرِفَ قَدْرُهُ**»[1] واتە: هیچ شەخسێك و ئینسانێك بەر لەمردن و تیاچوونی بەو جۆرە کە شیاوە بناسرێ و ڕێزی لێ بگیرێ نەناسراوە، کەواتە تا نەمرێ قەدری نازانرێ و ئەرزشی دەرناکەوێ لەلای خەڵك. یان ئەکرێ بەم جۆرە مانای لێبدرێتەوە: نافەوتێ شەخسێك کە قەدری بزانرێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**ماهُوَ بِمُؤْمِنٍ مَنْ لایَأْمَنُ جارُهُ بَوائِقَهُ**»[2] واتە: بەخاوەن بڕوای تەواو ناناسرێ کەسێك، کە هاوسێ ماڵەکەی و جیرانەکەی لەشەڕو ئاژاوەی ئەمین و موتمەئین نەبێت!

وە هەروەهاپێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**مُحَرِّمُ الْحَلالِ كَمُحَلِّلِ الْحَرامِ**»[3] واتە: کەسێك کە شتێك لە ئیسلامدا، بەحەلاڵ و پاك ناسراوە بڵێ حەرامەو بەحەرامی دابنێ، ئەو کەسە وەکوو ئەوکەسە وایە کە شتێ لەیاسای ئیسلامدا بە حەرام دانراوەو بەحەرام ناسراوە بڵێ حەلاڵە، ئاوایە.

---

١. معرفة الصحابة لابي نعيم (٣/٢٨٥) .

٢. مسند ابى يعلى موصلي (٩/٢٨٨).

٣. سنن الكبرى للبيهقي (٩/٣٢٦).

کەواتە لە کولدا حەلاڵ بە حەرام دانان یا حەرام بەحەلاڵ دانان دەسکاری کردنی قانوون و یاسای خواو پێغەمبەری خوایە!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «مُتْ مُسْلِماً وَلاٰتُبٰالِ»[١]

واتە: تۆ لەسەر یاساو بەرنامەی موسوڵمانان بمرە باکێکت لەکەس نەبێت و لە هیچ شتێك مەترسیت نەبێت!

وەهەروە ها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «اَلْمَجٰالِسُ بِالْأَمٰانَةِ»[٢]

واتە: هەرکردارو وتارێك لە هەرجێگایەکدا ئەنجام بدرێت و بوترێ ئینسانی خاوەن بڕوا ئەشێ لەکاتی گێڕانەوەکەی ئەو شتەدا زیادو کەمی پێوە نەنێت، وەك ئەمینداریك کە ئەشێ خەیانەت لە ئەمانەتا نەکات، ئەمەیش وایە، نابێ خەیانەت لە وتارو کردارا بکات بە زیاد یا کەم یا بە پێچەوانە بازگۆی بکات بۆ خەڵك بەزیاد یا کەم!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «اَلْمَرْءُ كَثِيرٌ بِأَخِيهِ»[٣]

واتە: ئینسان بەتەنها لە کارو باری دینی و دونیادا زۆر پێش نابات و سەرکەوتوو نابێت، بەڵام ئەگەر لەگەڵ برایەکی موسوڵمانی خۆیدابوو لە هەردوو بواری دینی و دونیاییدا مەحکەم و دامەزراو ئەبێت، وە لەکارەکانیا ناجح و سەرکەوتوو ئەبێت!

---

١. دلائل النبوة لابي نعيم (٢٤/٢) .

٢. سنن ابي داود (١٠/١٣).

٣. دلائل النبوة للبيهقي (٤٨٥/٤) .

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مُدَارَاةُ النَّاسِ صَدَقَةٌ»[1] واتە: نەرمش نیشان دان لەگەڵ خەڵکدا و هەڵسوکەوتی میهربانانە لە نێوان ئینسانەکاندا بە سەدەقەو چاکە دائەنرێ بۆ ئینسانی موسوڵمان، بەو مەرجەی کە بەهۆی تاوان و خرابکاری لە بەینی نەبات، وه لەشەرحی بوخاری شەریفدا هەیە کە مانای مودارای بەم شێوه لێکداوەتەوە، واتە: نەرمش نیشان دان لەگەڵ نەزان و جاهیل دا بۆ فێرکردنی یاسای خوایی و بەرگری کردنیان لەشتی خراپ و ناڕەوا، بەتایبەت لەگەڵ ئینسانە فاسقەکاندا، وه بە توندی لەگەڵیان نەجوڵێتەوه و فشاریان بۆ نەهێنی!

وه هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ»[2] واتە: ئینسان ئەشێ لە گەڵ کەسێکدا هەڵسوکەوت کات کە خۆشی ئەوێت وه بەڵگەی خۆش‌ویستنیش فەرمانبەرداری و ڕیعایەتی ئەدەبی شەرعییە لە دونیادا، وه بە چاودێری و نزیکییە لە ئاخیرەتدا، کەواتە ئینسان لە دونیادا لەگەڵ هەرگروپ و تاقمێکدا بێت بە فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی لە ئاخیرەتیشدا لەگەڵ ئەواندا حەشر ئەکرێت!

---

١. المعجم الوسيط للطبراني (١/٤٦٩).

٢. صحيح بخاری (١٩/١٤٥) .

وه هـەروەها پـێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْمُسْتَشارُ مُؤْتَمِنٌ»[1] واتـە: کـەسێك کـە مـەشوەرەت و پـرس‌ورای پـێ بـکرێ بـۆ ئـیش و فەرمانێك ئەوە ئەو کەسە وەکوو ئەمیندار وایـە ئەبێ بە گوێرەی حاڵ و زەمان و مەکان ڕەعایەتی حەققی خەڵك بکات، کەواتە لازم و زەروورە لە وەڵامدانەوەکەیدا لە یاساو سنووری شەریعەت نەترازێ و نەبێتە هۆی ئاژاوە لەنێوان ئینسانەکاندا وە...!

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: (اَلْمُسْلِمُ أَخُ الْمُسْلِمِ لا يَظْلِمُهُ وَ لا يُثْلِمُهُ»[2] واتــە: مـوسوڵمان و خـاوەن بـڕوای تـەواو، بـرای موسوڵمانە، کـەواتـە نـابێ ستەمی لێ بـکات و نـابێ عـەیبدارو لەکەداری کات لە ناو کۆمەڵگا و جەماوەردا!

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «اَلْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ النّاسُ مِنْ لِسانِهِ وَيَدِهِ ،وَالْمُهاجِرُ مَنْ هاجَرَ ماحَرَّمَ اللّهُ»[3] واتــە: مـوسوڵمانی تەواو موسوڵمان کەسێکە خەڵکان لە دەست و زمانی پارێزراو بن، واتە: بـە زمـان ئـەزیەتیان نـەدات و بـە دەستیش موزاحـەمەتیان بـۆ فـەراهـەم نەکات، وە دەس‌درێژییان بۆ نەکات نە بـۆ خۆیان و نە بۆ سەروەت و

---

١. سنن ابي داود (٣٣٤/١٣) .

٢. صحيح بخاری (٣٠٩/٨) .

٣. مسند امام احمد (٣٢٧/١٤) .

سامان و کەلەپووریان، وە کۆچەری و موهاجیر کەسێکە دوری بگرێ لەو شتانەی کە خوای گەورە حەرامی کردون و مەنعی کردون لەسەر ئینسانە بڕوا دارەکان!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَعَ كُلِّ فَرْحَةٍ تَرْحَةٌ»**[1] واتە: لەگەڵ هەموو خۆشییەکدا بۆ ئینسان ناخۆشیەك هەیە، کەواتە با ئینسانی خاوەن بڕوا حەز بەوە نەکات، کەهەمووکاتێ لە خۆشیدا بێت، بەو مانا هەمیشە تەلاشی ئەوە بێت لەناو فەرەح و خۆشیدا بەسەر بەرێت، چون ئەمە شتێکی قەتعی و مۆرکراو نییە بۆ ئینسانی خاوەن بڕوا!

وە هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مِفْتَاحُ الْجَنَّةِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»**[2] واتە: کلیل و هەڵگرەکانی دەرگاکانی بەهەشت بۆ ئەوەی، کە خاوەن بڕوا بەو دەرکانەدا بچێتە ژوورەوە بۆ ناو بەهەشتەکەی خوای گەورە، وتنی ڕستەی «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»یە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مِلَاكُ الدِّينِ الْوَرَعُ»**[3] واتە: شتێك کە دین و باوەڕی ئینسانی پێ بەراوەردە بکری و هەڵیسەنگێنێ خۆپاراستنەو دووری گرتنە لەو شتانەی کە جێگای گومانن بۆ حەلاڵی یا بۆ حەرامی ئەو شتە!

---

١. جامع الكبير للسيوطي (١/ باب الميم).

٢. تهذيب سنن ابي داود (٤/١) .

٣. جامع الكبير للسيوطي (١/ باب الميم).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْمَكْرُ وَالْخَدِيعَةُ فِي النَّارِ**»[١] واتە: هەرکەسێ کە ویست و ئارەزوی ئەوەبێت حیلەو خڵتاندن، کە هەردوکیان دوو شتی خیلاف و خراپن، لەگەڵ کەسێکدا یا لەگەڵ کۆمەڵگایەکدا بەکار بێنێ، کە ئەو شەخسە یا ئەو کۆمەڵگایە بێئازارو بێوەی بن، ئەوە ئەو کەسە لە ئاخیرەتدا جێگای جەهەننەمەکەی خوایە، بەڵام حیلە و خڵەتانێك کە بۆ جامیعەو ئەفرادی جامیعە بەسوود بن و قازانجیان هەبێت، مەسەلەن وەکوو لەکاتی شەڕدا، ئەوە مەنع نەکراون بەڵکوو لازم و پێویستن!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يَسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ**»[٢] واتە: کەسێ لە کردەوە و عیبادەتا تەنبەڵ و دواکەوتوو بێت، و هیچ پێشکەوتنێکی نەبێت ئەوە ئەو کەسە بنەماڵەی ناتوانن ببنە هۆی پێشکەوتنی و بیخەنە بەرەوە و ڕزگاری کەن لە سزای پاشەڕۆژ، کەواتە: ئەبێ ئینسان خۆی تەلاش و کۆشش بکات بۆ بەرژەوەندی دونیاو ئاخیرەتی خۆی و لەدائیرەی سوستی و تەنبەڵی بێتەدەرەوە و خۆی ڕزگارو سەربەرز کات!

١. شعب الایمان للبیهقي (٢٥٤/١١).

٢ . المستدرك علی الصحیحین (١٦٥/١). و مسند شهاب القضاعي (١٤٧/٢).

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنِ اِتَّقَى اللّهَ كَلَّ لِسٰانُهُ»[١] واتە: هەرکەسێك فەرمانبەرداری خوای گەورە بەجێ بێنێ بە جوانی و ڕێك و پێکی و خۆی پارێزی لەو شتانەی کە لێی مەنع کراون بەگوێرەی تواناو دەسەڵاتی خۆی، ئەوە ئەو کەسە زمانی کۆڵە و ناتوانێ شتی خرابی پێ بڵێت، واتە هەرکەسێ ئەهلی تەقوا بێت ئەوە ئەو ئینسانە زمانی وا لە کونترۆڵی خۆیدا قەت شتی ناشیرین و نالەباری پێ بەیاناکات و دژ بەکەس نادوێت! وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووەیەتی: «مَنْ أَحَبَّ اَنْ يَعْلَمَ مَنْزِلَتَهُ عِنْدَاللّهِ فَلْيَنْظُرْ مَنْزِلَةَ اللّهِ عِنْدَهُ»[٢] واتە: هەرکەسێ لە ئیمانداران ئەگەر بیەوێ و پێخۆشە بزانێ پلەو پایەی بە چ ئەندازە لای خوا بەرزو گەورەیە با سەیری ئەوە بکات کە تا چ ئەندازە خوای خۆی خۆش ئەوێت و فەرمانبەرداری خوای میهرەبانە، وە تا چ ئەندازە دەستوراتەکانی و فەرمانەکانی بەجێ ئەهێنێ، کەواتە: ئینسان بە چ میزان و ئەندازە وا لە بەجێهێنانی ئەمرو دەستوراتی خوای گەورەدا، بەو ئەندازەیە لای خوا بەرزو بەڕێزەو خۆشەویستە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَحَبَّ دُنْيٰاهُ أَضَرَّ بِآخِرَتِهِ وَمَنْ أَحَبَّ آخِرَتَهُ أَضَرَّ بِدُنْيٰاهُ فَآثِرُوا مٰايَبْقَىٰ عَلَىٰ مٰايَفْنَىٰ»[٣]

---

١. الفتح الكبير الى ضمّ الزيادة الى جامع الصغير (١٣٨/٣) .

٢. المعجم الاوسط للطبراني (٥٧/٦).

٣. مسند امام احمد (١٨٣/٤٠).

واتە: کەسێ دونیای خۆش بوێت وە بەشوێن ئارەزواتی دونیادا بگەڕێت، وە بەشوێن ڕەوڵی گوناهدا بخولێتەوە و کردەوەی ئاخیرەتی تیا ئەنجام نەدات ئەوە زیانی بەنەفسی خۆی گەیاندووە لە ئاخیرەتدا، وە هەرکەسێ ئاخیرەتی خۆشبوێت و لە دونیادا زەحمەتی بۆ بکێشێ بە چ ئەندازە زەحمەت بکێشێ بۆ ئاخیرەتی بەو ئەندازەیە زیان بە دونیای وارد ئەکات، کەواتە ئەم دونیایە، وەکوو دوولای شایەن وایە، ئەشێ ڕیعایەت بکرێن وەئینسان هەر کام لەم دوو کەفەی ترازوانە قورس بکات لەویانە حیسابی بۆ ئەکرێت کەوابوو ئێوە ئەی کۆمەڵی ئادەمیزادەکان هەڵبژێرن مەڵبەندێك، کە مانەوەی کۆتایی پێنایەت، بە سەر مەڵبەندێکدا کە تیائەچێت و کاتییە و مانەوەی دەوامی نییە!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «**مَنْ أَحَبَّ شَيْئاً أَكْثَرَ مِنْ ذِكْرِهِ**»[1] واتە: نیشانەو بەڵگە بۆخۆشویستنی هەر شتێك ئەوەیە کە ئینسان هەرشتێکی زۆر خۆش بوێت زۆرتر باسی ئەکات و ڕووی لێهەڵناجەرخێنێ، چون ئەمە شتێکی سورشتییەو ئینکار ناکرێت ئینسان هەرشتێکی زۆرخۆش بوێت زۆرتر باسی ئەکات و ناوی ئەبات، وە هەر کات لە خەیاڵیدایە و قەت لێی بزر نابێت.

---

۱. شعب الایمان للبیهقي (۷۲/۲).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَحَبَّ قَوْماً حَشَرَهُ اللَّهُ فِي زُمْرَتِهِمْ»[١] واتە: هەر کەسێ خۆشی لە هەر گروپ و تاقمێك بێت لە دونیادا و هەڵسوکەوتی لەگەڵیانا بە مەیل و مەحەببەتی بێت خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ ئەو گروپ و تا قمەدا حەشری ئەکات و موحاسەبەی ئەکات!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَائَهُ»[٢] واتە: هەرکەسێ پێ‌خۆش‌بێ بگات بە خوای گەورە، وە لە کاتی غەرغەرەو گیان دەرچوونا پێ‌خۆشەو حەز ئەکات بەو ڕۆیشتنە، خوای گەورەیش مولاقات و چاوپێکەوتنی ئەو کەسەی زۆرپێ‌خۆشە و حەز ئەکات بەو کەسەیە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هٰذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ»[٣] واتە: هەرکەسێ شتێك بێنێتە ناو ئەم بەرنامەی دینی ئێمە و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت و شتی وامان نەوتبێت ئەوە ئەو شتە ڕەددە و نامۆیە بە بەرنامەی دینی ئێمە، وە لە دائیرەی دینا چووەتە دەرەوە، وە خاریجەو ئەدرێتەوە بەسەر ساحیبەکەیدا، چون

---

١. المعجم الكبير للطبراني (٣٤/٣).

٢. صحيح بخارى (١٦٤/٢٠)

٣. صحيح بخارى (٢٠١/٩)

بەرنامەی دینی خوا بە تەکمیڵی دراوەتە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ وە هیچ زیادو کەمی پێ ناکرێ لەلایەن کەسێکەوە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ اِرْضَى النَّاسَ بِسُخَطِ اللّٰهِ وَكَّلَهُ اللّٰهُ إِلَى النَّاسِ»**[١] واتە: کەسێك بیەوێ بە تووڕە کردنی خوای گەورە ڕەزامەندی خەڵك بەدەس بێنێ، و خوای گەورە لە خۆی عاجز کات بۆ ئەوە خەڵکی لێ رازی بن و بیانکات بەسەرپەرشتی خۆی، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسە بۆ وەرگرتنی پاداش و تۆڵەی کردەوەکانی ئەنێرێ بۆلای ئەو خەڵکانە کە هیچیان بەدەس نییە، کە لای ئەوان جەزای کردەوەکانی وەرگرێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ أَطَاعَ اللّٰهَ فَازَ»**[٢] واتە: هەر کەسێك فەرمانبەرداری خوای گەورە بەجێ بێنێ ئەوە ڕستگارە و سەربەرزە، هەم لەدونیادا، و هەم لە ئاخیرەتدا، کەواتە: سەعادەت و سەرکەوتنی ئینسان لەم دونیادا و لەو دونیایشدا بەهۆی گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری زاتی خوای گەورە دەس ئەکەوێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ أَعَانَ ظَالِماً سَلَطَهُ اللّٰهُ عَلَيْهِ»**[٣] واتە: هەرکەسێ کۆمەك و پشتیوانی ئینسانێکی ستەمگەر

---

١. صحيح ابن حبان (٤١/٢).

٢. وسائل الوصول الى شمائل الرسول للامام النبهاني (٢١٠/١).

٣. جامع الكبير للسيوطي (١/ باب حرف الميم).

بکات بە هەر شێوەیەك، خوای گەورە ئەو ستەمگەرە زاڵ ئەکات بەسەریا، وە ستەمیش لەو ئەکات، چون مادام ئەم ئینسانە، بە ستەمی ستەمگەر ڕازییە، وەکوو ئەوە خۆی ستەمەکەی کردبێ ئاوایە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ بَثَّ لَمْ يَصْبِرْ»[١] واتە: هەرکەسێ شەکوای گرفتارییەکانی بکات لای خەڵك و موشکیلاتی خۆی باس بکات لەلایان، ئەو موشکیلاتەی کە خوا داویەتی بەسەریا بۆ تاقیکردنەوەی، ئەوە ئەو ئینسانە لە ڕیزی ئەهلی سەبر ناژمێررێت و حیساب ناکرێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ بُورِكَ لَهُ فِي شَيْءٍ فَلْيَلْزِمْهُ»[٢] واتە: هەرکەسێ خوای گەورە، یەکێ لە نیعمەتەکانی خۆی پێبەخشی، چ نێعمەتی زاهیری، و چ نیعمەتی باتینی و نهێنی، و چ نیعمەتی ماڵی، و چ غەیری ماڵی، با موازب بێت شوکرانەی خوای گەورەی لەسەر بکات، وە لەبەرابەریەوە ناسوپاس نەبێت، چون هەر نیعمەتێ ئەگەر شوکرانەی لەسەر نەکرێت خوای گەورە بەرەکەتی خۆی لەو نێعمەتەدا هەڵ ئەگرێ و لەبەینی ئەبات!

---

١. فتح الكبير للسيوطي (٢/ باب حرف التاء).

٢. الأدب للبيهقي (٨٢/٣).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَنْ تَأَنَّىٰ أَصَابَ أَوْ كَادَ، وَ مَن عَجَّلَ أَخْطَأَ أَوْ كَادَ**»[1] واتە: هەرکەسێ لە کارو فەرمانەکانیا لەسەرخۆ و هێمن بوو ئەوە ئەو کەسە ئەگا بە مەتڵەب یا نزیك ئەکەوێتەوە لەمەتڵەب و نەتیجەی کارەکەی، بەڵام هەرکەسێ لەکارو باریا عەجەلە بکات و بێ مەشوەرەت کارەکانی ئەنجام بدات، ئەوە ناگات بە مەتڵەب و نەتیجەی کارەکەی یاخەیر نزیکە کە نەگات، چون عەجەلەکردن ئاسەواری تەبعی ئینسانە، وە دانەری پاکی بێ وێنە، کە خوایە، بەپێچەوانەی سورشتی ئینسان شتەکانی داناوە و دیاری کردووە کەوابوو ئینسان ئەشێ شوێنکەوتوی فەرمان و دەسوری دانەری پاك کەوێت (واتەشاریعی موقەددەس) نەك شوێنکەوتووی تەبع و سورشتی خۆی!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ**»[2] واتە: هەرکەسێ خۆی بشوبهێنێ، و دەمەلاسکێ هەرگرووپ و تاقمێك بکاتەوە، با بەسوورەتی زاهیریش بێت، لە کردەوەدا یا لە سوروشت و تەبێعەت دا، وە لەسەر ڕەواڵی ئەوان حەرەکەت کات، وە لەم شوێنکەوتن و شوبهاندنەدا سوورەتی ڕواڵەتی زاهیری بەرابەر بێ بۆ

١. المعجم الكبير للطبراني (٢٧٦/١٢).
٢. سنن ابي داود (٤٨/١١).

باتینی، ئەوە ئەو کەسە، لەو گرووپ و تاقمە ئەژمێرریت، وە حیسابی بۆ ئەکرێت، وە لە قیامەتیشدا لەگەڵ ئەوانەدا حەشر ئەکرێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ تَعَلَّقَ بِشَيْءٍ وُكِلَ إِلَيْهِ»**[1] واتە: کەسێك لە کارەکانیا بۆ هەر مەتڵەبێك تەشەببوس بکا بە شتێك، وە وا بزانێ ئەو شتە ئەو کارەی بۆ بەراوردە ئەکات، خوای گەورە بۆ بەراوەردەی ئەو فەرمانە، حەواڵەی لای ئەو شتەی ئەکات، کە ئەو شتە تا چ ئەندازە لەبەراوەردە کردنیا دەس رۆیشتووە، وە ئەتوانێ بۆی جێ بەجێ کات؟ کەواتە: ئەشێ ئینسان لە هەموو فەرمان و ئیشێکدا کارەکانی حەواڵەی لای خوابکات، وە بە هۆی کارەکانی ئەشێ بەس لەسەر ڕواڵەتی زاهیری پشت بە ئەو هۆکاریانە ببستێ، چون پشت بەستنی ڕاستەقینە بەس لەسەر خوا ئەبێت، وە ئینسان لە تەواوی نیازمەندییەکانیا ئەشێ لەڕاستیدا لەسەر خوا پشت ببەستێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مِن حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ»**[2] واتە: لە جوانی و شیرین کاری ئیسلامەتی ئینسان ئەژمێرریت تەرك کردن و دووری گرتن لەشتێ، کە مەقسوود و مەتڵەبی ئینسان نییە، کەوابوو ئینسانی موسوڵمان ئەشێ خۆی بەشتی

---

١. سنن ترمذي (٤٠٧/٧) و في بعض النسخ «من تعلق شيئاً بشيئ ...»

٢. سنن ترمذي (٢٩٤/٨) .

ئەساسی و مایەدارەوە مەشغوولّ بکات، وە شتە گرنگ و بنەڕەتییەکان بەهۆی شتی بێ کەڵك و پووچەڵەوە لەدەستی خۆی دەرنەکات!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَنْ رَتَعَ حَوْلَ الْحِمَىٰ يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ**»[1] واتە: هەرکەسێ لە دەورو بەری حەسارو پەرژینی شتە ناشەرعییەکاندا بخولێتەوە نزیکە کە ئەو ئینسانە بکەوێتە ناو ئەو شتە ناشەرعییەوە، وە تووشی حەرام ببێت یا ڕۆژێ لە ڕۆژان لەگەڵ ئەو شتە حەرامەدا ڕووبەڕوو ئەبێت، کەواتە ئینسان ئەشێ خۆی بپارێزی و بەحەددو مەرزی شتە حەرامەکان نزێك نەبێتەوە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَنْ رَضِيَ بِقِسْمَةِ اللّٰهِ اِسْتَغْنَىٰ**» واتە: هەر کەسێ ڕازی بێ بەو شتەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردووە و بۆی بەش کردووە، ئەوە ئەو کەسە دەوڵەمەندە، وە لە ڕیزی دەوڵەمەندەکاندا ئەژمێررێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَنْ رَضِيَ عَنِ اللّٰهِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُ**»[2] واتە: هەر کەسێ بە قەزا و قەدەری خوای گەورە ڕازی بێت و سەری بەندەیی لەبەرابەری فەرمانەکانی خواوە دانەوێنێ، خوای گەورەیش لەو ڕازی ئەبێت و بە بەهەشتەکەی جەزاو پاداشی ئەداتەوە!

---

١. شرح ابن بقال (١/٤٥٣) .

٢. جامع الكبير (١ / باب حرف الميم)

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَنْ سَرَّتْهُ حَسَنَتُهُ وَ سَائَتْهُ سَيِّئَتُهُ فَهُوَ مُؤْمِنٌ**»[1] واتە: هەرکەسێ ئومێدو ئارەزووی بێت کە بە جەزاو پاداشی خۆی بگات لەبەرابەر کردەوە چاکەکانیەوە و باوەڕی وابێت کە بە یەقینی ئەگات بەوە، وە ئاڵۆزی و نارەحەتی نیشان بدات بەکردەوە ناشیرینەکانی، ئەوە ئەو کەسە باوەڕێکی تەواوی هەیەو ئیمانێکی کامڵ و دامەزراوی بە دەس هێناوە، بەڵام هەرکەسێ بێدەنگ بێت، وە وابزانێ، کە چاکەکانی سوودو قازانجیان نییە، وە تاوانەکانی تۆڵەیان نییە، ئەوە ئەوکەسە بە ڕاستی دڵێکی غافڵ و بێئاگای هەیە!

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَنْ صَمِتَ نَجَىٰ**»[2] واتە: هەرکەسێ بێدەنگ بێت و شتی خراب نەڵێت ئەوە لە تۆڵەو عیقابی خوای گەورە رزگار ئەبێت، هەروەك لە فەرمودەیتردا هەیە ئەفەرمێ: بێدەنگی گەورەترین ئەخلاقە بۆ ئینسان بەڵام کەسێ ئەهلی مەزاح بێت و زیاد لە حەددی خۆی هەنگاو بنێت پێی سووك ئەبێت.

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**مَن ضَمِنَ لي مابَيْنَ لِحْيَيْهِ وَ مابَيْنَ رِجْلَيْهِ ضَمِنْتُ لَهُ عَلَى اللّٰهِ**»[3] واتە: هەرکەسێ زمانی کونترۆڵ

---

١. سنن ترمذي (٦٩/٦).

٢. سنن ترمذي (٤١/٩).

٣. معجم الأوسط للطبراني (٢١٤/١١) .

بکات و شتی خراپی پێ نەڵێت ئەو شتەی کە خواو پێغەمبەری خوا پێی نارازین، وە هەروا موازبی خۆی بێت بە عەورەتی گوناه نەکات من لای خوای گەورە ئەبمە زامنی کە داخلّی بەهەشتی بکات، کەواتە هەر گرفتارییەکی دونیاو ئاخیرەت، وە هەر ئابڕوو چوونێك کە ڕوو لە ئینسان ئەکات، بە هۆی زمان و عەورەتی ئینسان تووشی ئینسان ئەبێت، کەواتە هەرکەسێ خۆی پارێزی، وە بەزمان و ئەندامەکانیتری خیلافی شەرع ئەنجام نەدات خوای گەورەیش بە بەهەشتی خۆی پاداش و جەزای ئەداتەوە، وە حەزرەتیش عەهدی بۆ کردووە، ئەگەر بەم دوو ئەندامە شتی خراپ نەکات و خۆی پارێزی لای خوای گەورە زەمانەتی ئەو ئینسانە ئەکات!

وە هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ عَمِلَ بِمَاعَلِمَ وَرَّثَهُ اللّٰهُ عِلْمَ مَا لَمْ يَعْلَمْ»**[1] واتە: هەرکەسێك عەمەڵ بکات بەو زانستەی کە خوا پێیداوە و فێری کردووە و بە ڕەواڵی ئەو زانستەیە بجوڵێتەوە و ڕەفتار بکات خوای گەورە ئەیکا بە خاوەن و ساحێبی زانیارییەك کە بە کەستر نەدراوە، واتە: زانیارییێکی پێ ئەبەخشێ تایبەتییە کە تەنها مەخسووسی دۆستانی خویەتی!

---

١. مشاكات المصابيح (٥٦٠/٨).

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ غَشَّنا فَلَيْسَ مِنّا»**[١] واتە: کەسێ کە خەیانەت بکات واتە: بە پێچەوانەی یاسای ئێمە بجولێتەوە، ئەوە ئەوکەسە لە شوێنکەوتوانی ئێمە نییە، واتە: ئەخلاقی وەکوو ئەخلاقی موسوڵمانان نییە!

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ فارَقَ الْجَماعَةَ شِبراً فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الإِسْلامِ»**[٢] واتە: کەسێ لە گرووپ و کۆمەڵی موسوڵمانان جیابێتەوە، وه بە خیلافی یاسای ئەوان بڕوات با کەمیش بێت، ئەوە زنجیرەی ئیسلامی لە ئەستۆی خوی داڕنیوەو دەری‌هێناوە، وه لای داوە لە ڕێگەو ڕێچکەی موسوڵمانان!

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ كَثُرَ سَوادَ قَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ»**[٣] واتە: هەرکەسێ لەگەڵ کۆمەڵی موسوڵماناندا بێت، وه پشتیوانی ئەوان بکات و ببێتە هۆی یەکگرتنی موسوڵمانان ئەوە ئەو کەسە لە ئەوان ئەژمێررێت، و لەوان حیساب ئەکرێت!

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلاهُ»**[٤] واتە: هەرکەسێ لە موسوڵمانان من گەورە و پشتیوانی بم

---

١. صحيح مسلم (١/٢٦٥).

٢. صحيح بخاري (٢١/٤٤٣).

٣. جامع الكبير (١/ باب حرف الميم).

٤. سنن ترمذي (١٢/١٧٥).

لەئیسلامدا، حەزرەت عەلی ﷺ ئامۆزای من گەورەو پشتیوانیەتی، ئەمەیش هۆکەی ئەوەبوو، کە ئوسامەی سەحابی ﷺ بەحەزرەت عەلی فەرموو: تۆمەولای من نیت بەڵکوو مەولای من حەزرەت موحەممەد ﷺ، وە ئەم فەرموودەیشە ئەوە ناگەیەنی کەحەزرەت عەلی ﷺ خەلیفەو جێگەنشینی ئەووەڵی حەزرەتە ﷺ وەکوو جەماعەتێك وا ئەڵێن، ئەم قەوڵە و نەزەرییە هەڵەیەکی ڕووتە!

وەهەروها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ لَا يَرْحَمْ لَا يُرْحَمْ»**[1] واتە: کەسێك بەزەیی نەیەتەوە بەو کەسانەدا کە نیازیان بەوە هەیە و بێموبالات بێت نیسبەت بەکەسانێ کە مەحەللی بەزەیین، ئەوە ئەو کەسە لەلایەنی خوای گەورەوە بە مەحەللی ڕەحم و بەزەیی قەرار ناگرێت و موبالاتی پێ ناکرێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«مَنْ لَمْ يَكُنْ ذِئْباً أَكَلَتْهُ الذِّءابُ»**[2] واتە: کەسێ غیرەتی نەبێت پارێزگاری لە حەققی خۆی بکات، وە لەبەرابەر گورگ سیفەتانەوە بوەستێ، ئەوانەی کە لە خووڕەوشتا وەکوو گورگ وانە، حەققی پایەماڵ ئەکەن و ئەیخۆن!

---

١. صحيح بخاري (٤٠٣/١٨) .

٢. المعجم الوسيط للطبراني (٢٤٤/٢).

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویـەتی: «**مَنْ مَزَحَ اُسْتُخِفَّ بِـهِ**»[١] واتـە: بـێدەنگی چـاکترین سـیفەت و خـوو ڕەوشـتە بـۆ ئـادەمیزاد، بەڵام کەسێ ئەهلی شۆخی و مەزاح بێت، بەو مانا کاری هەر ئەوە بێت مەزاحی بێ‌جێگەبکات تاخەڵکان سەرگەرم بن و پێکەنینی بێ‌جێگەیان بێت، ئەوە ئەو کەسە بەوە سووك ئەبێت، واتە پلەی ئینسانییەتی دێتەخوارەوە بەرزەوە نابێت، وە بە سووك سەیری ئەکرێت لەناو کۆمەڵگادا!

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فـەرموویەتی: «**مَنْ نُوقِشَ الْحِسابَ عُذِبَ**»[٢] واتـە: هـەرکەسێ لەڕۆژی قیامەت دا تـەواوی ئـەو شتانەی کە لە دونـیادا ئـەنجامی داون لە گـەڵیا بـکرێ، وه یـەکە یـەکە لە دیـوانـی خـوادا هـەڵژمێررێن، عـەزاب و ئـازاری خـوای گـەورەی لایـقە و شـیاوی سـزای خوایە، بەڵام ڕەحمی خوای گـەورە لەوە زۆرترە لەگەڵ بەندەکانی!

وه هـەروەها پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**مَنْهُومانِ لا یَشْبَعانِ طالِبُ عِلْمٍ وَطالِبُ دُنْیاً**»[٣] واتــە: دوو کـۆمەڵ لە دونـیادا زۆر حــەریس و جـەسوورن، هـیچکات تـێر نـابن و تـێرناخۆن، یـەکەم: کـەسێکە کـە شـوێنکەوتووی زانـیارییە و بە شـوێن زانـستا ئـەگەڕێ، دووهـەم: کەسێکە

---

١. المعجم الوسیط للطبراني (٣٠٤/٥) .

٢. صحیح بخاري (٢٠١/٢٠) .

٣. سنن دارمي (٣٧٣/١). و مصنف عبدالرزاق (٢٥٦/١١) .

بەشوێن کەلەپووری دونیادا ئەخولێتەوە و هەوڵی بەس بۆ کەلەپوورو سەروەتە، کەوابوو کەسێ ویستی ئەوەبێت بگا بەهەموو زانستەکانی دونیادا و ئاگاداری پەیدا بکات بەسەر هەموویاندا، وە ئیددیعای ئەوە بێت و هەروا ئیددیعای هەموو حەقایق بکات، ئەم ئینسانە هیچ کات تێر نابێت و بە ئاواتی خۆی ناگات، وە هەروا بۆ دونیاکەیشی وایە قەت تێر نابێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ**»[1] واتە: ئینسانی خاوەن بڕوا، وەکوو ئاوێنە وایە لە بەرابەر بڕوادارەکانی ترەوە ، هەروەکوو ئاوێنەیێ کە ئینسان سەیری ئەکات ئەگەر ناتەواوییەکی ببێت یا نەقس و عەیبێکی بوو ئەکەوێتە هەوڵ بۆچارە سەرکردن و لابردنی، بڕواداران لەنێوان خۆیاندا ئاوانە، ئەگەر یەکێکیان عەیبێ یا ناتەواوییەکی بوو ئەشێ بکەونە هەوڵ بۆ چارە سەرکردنی. عامیری فەرموویەتی: مانای ئەم فەرموودەیە بەم جۆرە یە، واتە: وەکوو ئاوێنە وابە بۆبرای موسوڵمان و خاوەن بڕوات ئەگەر لە حەرەکات و سەکەناتیا هیچ ئیرادو نەقسێك لە کارەکانیا نەبوو هەڵێنێ کە شوکرانەی خوای گەورە بکات، وە بەرگری بکە لەوەی کە خۆی بە مەغرور و بە زل بزانێ، وە ئەگەر نەقس و ناتەواوییەکی هەبوو لە کارەکانیا، بە نەرمی و ئارامی نەسیحەتی بکەو لە ناو خەڵکدا چەپڵەی لێ مەکوتە و سووکی مەکە.

---

١. سنن ابي داود (٧۶/١٣) .

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**اَلْمُؤْمِنُ مَنْ أَمَنَهُ النَّاسُ عَلَىٰ أَنْفُسِهِمْ**»[١] واتە: ئینسانی خاوەن بڕوا کەسێکە کە خاوەنی ئەم وەسفانە بێت، یەکەم خەڵکان بە ئەمینداری بزانن لە سەر ماڵیان و لەسەر نەفسیان، کەوابوو ئەگەر زیانێك ڕووی کردە ماڵیان و گیانیان ئەشێ پـارێزگاری و بـەرگری لێـوە بـکات، هـەروەکوو لە مـاڵ و گـیانی خـۆی پارێـزگاری ئەکات و ئەی پارێزێ!

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْمُؤْمِنُ يَسِيرُ الْمُؤْنَةِ**» واتە: ئینسانی خاوەن بڕوا کەم خەرجە، بەو مانا بەکەم قەناعەت ئەکات لەم دونیایەدا، وە بەو بەشەی کە خوا پێی بەخشیوە ڕازییە، وە لە حیساب و دادگـای خـوای گـەورە مـەترسی هـەیە، جا بـەم بۆنەوە زۆر بـە شـوێن کەلەپووری دونیاوە نییە، وە زۆر تامەزرۆی ماڵی دونیا نییە!

وه هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**اَلْمُؤْمِنُونَ كَرَجُلٍ وَاحِدٍ**»[٢] واتە: خاوەن بڕواکان هەر هەمووەکەیان وەکوو یەك بەدەنی تاك وانە، هەروەك چۆن ئەگەر یەکێ لە ئەندامەکانی بەدەنی ئینسان نەخۆش بێت یا زەخمارو ناسازبێت، باقی ئەندامەکانیتری ئێش و ئازاری ئەو ئەچێژن و ئەشێ تەحەممولی کەن، خاوەن بڕواکان لە نێوان خۆیاندا

١. سنن ابن ماجه (٤٢٠/١١) .

٢. صحيح مسلم (٤٦٩/١٢) .

ئاوانە، ئەشێ حەققی یەکتر دەرك كەن و پشتیوانی یەکتربن، وە لە غەیری تاوان و خیلاف شەرعدا ئەشێ قۆڵگری یەکتربن!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ كَانَ آخِرُ كَلَامِهِ لَا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ»[1] واتە: هەرکەسێك لە دونیادا ئاخرین وشەی رستەی «لَاإِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ» بێت لە قیامەتدا داخڵی بەهەشت ئەبێت، وە لە نیعمەتەکانی خوای گەورە بەرخوردار ئەبێت، چون لە ئاخر لەحزەی ژیانیا دەرئەکەوێ کە هەموو ئارەزواتێکی دونیای لابردووە و ناوەیەتە ئەولاوە و دەستی لە هەموو شتە دونیاییەکان داشۆریوەو ڕووی کردووەتە خوای گەورە و حیرس و ئارەزووی لە هەموو شتە دونیاییەکان چراندووە، جا بەم بۆنەوە خوای گەورە سەرفەنەزەری لێ ئەکات و داخڵی بەهەشتی ئەکات!

## پیتی نون

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلنَّاسُ بِزَمَانِهِمْ أَشْبَهُ مِنْهُمْ بِآبَائِهِمْ»[2] واتە: ئینسانەکان زیاتر بە کات و ساتی خۆیانەوە

١. سنن ابي داود (٣٧٦/٨).

٢. اکمال المعلم في شرح صحيح مسلم (١٢٧/١).

شەباهەتیان زۆرترە تا شەباهەتیان بە باوکان و دایکانیانەوە، بەو مانا ئینسانەکان لە نێوان خۆیاندا زۆرتر لەگەڵ عادات و ڕسووماتی زەمانەدا هەڵسوکەوتیان زیاترە تا لەگەڵ ئەخلاق و ئادابێك کە باپیرانیان بۆیان بەجێ هێشتون، کورتەی مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە هەر چینێك لەم خەڵکە، کە دێن و ئەڕۆن ئاداب و ڕەسمی پێشووەکانی خۆیان فەرامۆش ئەکەن و ڕۆژبەڕۆژ کەمترو لاوازتر ئەبێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«اَلنَّاسُ كَأَسْنَانِ الْمِشْطِ»**[1] واتە: ئینسانەکان لە نێوان خۆیاندا وەکوو ددانی شانەی سەر وانە، بەو مانا چۆن ئەو دەنکە شانانە بە هەموویانەوە شت ڕێك و پێك ئەکەن ئینسانەکانیش لە ئەنجامدانی کارەکانی یەکتردا ئەشێ ئاوابن، وە قۆڵگری یەکتربن تا بتوانن کۆمەڵگایەکی بێوەی و سالم بۆ خۆیان دروست کەن!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«اَلنَّاسُ مَعَادِنٌ فِي الْخَيْرِ وَالشَّرِ»**[2] واتە: ئینسانەکان وەکوو کانی تەلاّو زیو وانە، چۆن ئەو کان و مەعدەنانە لە زاتا و لە وەسفا لەیەکتر جیان، ئینسانەکانیش لە وەسفەکانیانا ئاوانە بڕێکیان سەرچاوەو کۆگای خێرن و بڕێکتریان

١. مسند شهاب القضاعي (١/٣١٠).

٢. مسند امام احمد (٢٠/٤٥٠). صحيح ابن حبان (١/١٧٦).

سەرچاوە و کۆگای شەڕن، کەواتە چۆن ئەو کان و مەعدەنانە زات و وەسفیان لە یەکتر جیایە، ئینسانەکانیش ئاوانە، کورتەی مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە بڕێك لە ئینسانەکان ئەرزشی زاتیان هەیە، وەکووکانی تەلاّو زیو وانە، وە بڕێکی تریشیان وانین هەروەکوو لە تەلاّو زیو شتی جوان و بائەرزش دروست ئەکرێت هەروا بڕێك لە ئینسانەکان گوێڕایەڵی فەرموودەی خواو پێغەمبەری خوان ﷺ بۆ خۆیان ئەبنە باشترین ئینسان لە کۆمەڵگادا وە ئەرزشیان هەیە بۆ کۆمەڵگای ئینسانەکان، بەلاّم بڕێکیتریان گوێڕایەڵی فەرموودەی خواو پێغەمبەری خوا نین، وە خۆیان بۆ خۆیان ناشیرین ئەکەن، وە ئەچنە ڕیزی حەیوانەکان و سوودو کەڵکی باشیان لێ وەرناگیرێ !

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**نَحْنُ أَهْلَ بَيْتٍ لاٰيُقٰاسُ بِنٰا أَحَدٌ، بَنُوعَبْدُ الْمُطَّلِبِ سٰادٰاتُ أَهْلِ الْجَنَّةِ**»[١] واتە: ئێمە بنەماڵەی نوێنەری خوا ﷺ کەستر لەسەر ئێمە قیاس ناکرێت، واتە: زۆر تایبەتمەندی هەیە فەقەت لە بنەماڵەی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووە بۆ کەستر نەبووەو نابێ، وە نایشتوانین بێژێن ئێمەیش وەکوو ئەوان چۆن ئەوانە تایبەتمەندیان بووە با ئێمەیش بمانبێت، شتی وا نابێت، مەسەلەن بنەماڵەی نۆێنەری خوا ﷺ میرات و کەلەپووریان لەحەزرەت

١. جامع الكبير للسيوطي (١/ باب حرف النون).

نەگرتووە. وە زۆرێتر مەسائل هەیە لەم بابەتەدا، مەسەلەن بنەماڵەی عەبدولموتەلیب گەورانی ئەهلی بە هەشتن، کەئەم ئاخەری حەدیسە خۆی ئەتوانێ میسال و نموونە بێت بۆ بەشی ئەووەڵی حەدیسەکە!

وە هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلنَّدَمُ تَوْبَةٌ»[1] واتە: پاش گەزبوونەوە لەگوناه و تاوان و هەڵگەڕانەوە لەو شتانەی کە ناپەسەندن خۆی بۆخۆی تەوبەیە لەتاوان!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلنِّساءُ حَبائِلُ الشَّيْطانِ»[2] واتە: ئافرەتان داو و تەڵەی شەیتانن بۆ شکارکردنی ئینسانەکانی‌تر، هەروەکوو چۆن داو ڕاوی پێ ئەکرێت و گیانلەبەرکان و باڵندەکان لە گلوگوێز ئەخات، هەر بەو جۆرە ئافرەتیش ئینسانەکان دەس بەستە ئەکات و چاوی عەقڵ و ئاوەزیان کوێر ئەکات و تووشی تاوان ئەبن وە شەیتان ئەیانکا بە نەچیری خۆی!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نِعْمَ الصِّهْرُ اَلْقَبْرُ»[3] واتە: باشترین شتێك کە هەرچی شتە بتوێنێتەوە گۆرە، کەوابوو ژێرخاك باشترین پەناگایە بۆ قاڵب و لەشی گیانلەبەرکان بۆ تیابردنیان، وە بۆ

١. سنن ابن ماجه (٣٠٣/١٢) .
٢. دلائل النبوة للبيهقي (٣١٩/٥ ).
٣. فتح الباري لابن الحجر (٤٢/١٥).

بوونەوە بە ئەجزاو ئەسڵی و ڕیشەی خۆیان بەتایبەت بۆ ئینسان!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**نِيَّةُ الْمُؤْمِنِ خَيْرٌ مِنْ عَمَلِهِ**»[1] واتە: خەیاڵ و قەسدی ئینسان بۆ کارەکانی باشترە لە کردەوەکانی، کەواتە نییەتی خێر خێرە، بەڵام نییەت و قەسدی ناپەسەند تا نەبێتە کردەوە بەخراب ناژمێررێت بۆ خاوەنەکەی!

## پیتی هێ

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْهَدِيَّةُ تُعَوِّرُ عَيْنَ الْحَكِيمِ**»[2] واتە: پێشکەشی بردن بۆ حاکم و فەرمانڕەوا چاوانی ئەو حاکمە ئەبڵەق ئەکات و شتەکە نابینێت مەگەر چاوی ڕەزامەندی نەبێت، یا مانای ئەم فەرموودەیە بریتییە لەوە ئەگەر حاکمی وەخت هەدیەو پێشکەشی وەرگرێت دوایی زەمم و لۆمەی ئەکرێت و لەککەدار ئەبێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**هُمَا جَنَّتُكَ وَ نَارُكَ**»[3] واتە: دایك و باوکی ئینسان بەهەشت و جەهەننەمی ئینسانن، بەو مانا

١. المعجم الكبير للطبراني (٤٧٤/٨).

٢. فتح الكبير (٢٨٢/٣). معجم ابن المقرء (٤٦٣/١).

٣. سنن ابن ماجه (٥٣/١١) .

ئـەگەر ڕەزایـەتیان بـە دەس بـێنی و ڕازی بـن لێت ئـەچیتە بـەهەشت و لەنـاویا ئیسراحـەت ئـەکەیت، بـەڵام ئـەگەر بـەپێچەوانـەی یـاسای خـوا لەگـەڵیان بـجوڵێتەوە بـەو مـانا ئـەزیـەت و ئـازاری دڵ و ڕۆحـیان، یـا ئەزیەت و ئازاری جیسمیان بدەیت و قسەی نـاشیرین و نـاپەسەندیان پێی بڵێیت، ئەوە جێگات جەهننەمەکەی خوای گەورەیە (پـــەنابـەخوا).

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «اَلْهَمُّ نِصْفُ الْهَرَمِ»[1] واتـە: هـۆی پـیربوونی ئـینسان نـیوەی غـەم و پـەژارەو نـاڕەحەتییە، وە نیوەکەی‌تریشی سپەری بوونی تەمەنە، کەواتە غەم و پەژارەی ئەم دونیایە ئینسان پیرو پەككەوتوو ئەكات، وەكوو بەڕابردنی تەمەنیش ئینسان پیرو بێ هێز ئەبێت!

## پیتی واو

وە هـەروەها پـیغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «وَجَدْتَ النَّاسَ أُخْبُرْ تَقْلَهُ»[2] واتە: هەركاتێك ئینسانێكت دەس كەوت، كە ئیدعای بەرتەری و دین داری ئەكرد، تۆ ئاوەزو عەقڵی هەڵسەنگێنە بزانە خاوەن عەقڵە یانە!

---

١. جامع الكبير (١/ باب حرف الهاء).

٢. فیض القدیر (٢٦٧/١) .

وه هــەروەها پــێغەمبەری خــوا ﷺ فــەرموویەتی: « **اَلْوَحْدَةُ خَيْرٌ مِنْ جَلِيسِ السُّوءِ**»[1] واتـە: ژیـان بە تـەنهایی بـردنە سـەر باشترە و بێوەیترە تا دانیشتن و ڕەفیقی کردن لەگەڵ هاوەڵی خراب و بەدخۆدا!

وه هــەروەها پــێغەمبەری خــوا ﷺ فــەرموویەتی: «**اَلْوُدُّ وَالْعَدَاوَةُ يَتَوارَثانِ**»[2] واتـە: مـەحەببەت کـردن لەگـەڵ ئینسانەکاندا یـا دوژمـەنایەتی کردن لەگەڵ بەندەکانی خوادا شتێکی ئیرسی و بەجێماوە لە دایکان و باوکانەوە ئەگات بە نەوەو نەتیجەکانیان، کەواتە: زۆرێ لە کارەسەختەکان بە مەحەببەت جۆر ئەبن و حەل ئەبن، وە زۆرێ لە کارە نابارەکان، کە لە ئـەسەری دوژمـەنایەتییەوە پـەیدا ئـەبن، کـەوابوو پێویستەو لازمـە لەسـەر ئینسان، کە ئەم دوو وەسفە ڕەعایەت بکات!

وه هـەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْوَرْعُ سَيِّدُ الْعَمَلِ**»[3] واتــە: خــۆپاراســتن لەشــتی خــراب، وەکــوو حــەرام و گــومان لێ‌کــراو گـەورەترین کردەوەیە بۆ ئینسان جا ئـەگەر ئینسان لە شتێ کە لە نێوان حـەڵاڵ و حـەرامـدا قـەراری گـرتووە، وە وەزعـییەتی ڕوون نـییە خـۆی پارێزی ئەوە بۆی لە هەموو کردەوەیەك و عەمەلێك باشترەو عەزیزترە!

---

١. المستدرك على الصحيحين (٤٠٣/١٢).

٢. المستدرك على الصحيحين (١٩٠/١٧). جامع الكبير (١/ باب حرف الواو)

٣. جامع الكبير (١/ باب حرف الواو).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْوَلَدُ ثَمَرَةُ الْقَلْبِ**»[١] واتە: منداڵ بەرهەم و حاسڵی دڵی هەر ئینسانێکە، کەوابوو خۆشویستنی ئەولاد ڕەبت و عەلاقەی بە دڵەوەیە و ڕیشەی ئەو مەحەببەت و خۆشویستنە وا لە دڵدا، بۆیە ئەگەر ئەو منداڵە سەربەرز بوو لەدین و دونیادا ئەو باوك و دایکە بە دڵ پێیان خۆشە و خۆشحاڵن، وە ئەگەر کارێکی نەشیاو ناپەسەندیان ئەنجامدا بازهەم دایك و باوك بە دڵ نیگەرانن و پێیان ناخۆشە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْوَلَدُ مَبْخَلَةٌ مَجْنَبَةٌ مَحْزَنَةٌ**»[٢] واتە: ئەولاد هۆ و جێگای حەسوودین، وە هەروەها جێگای مەترسی و غەم و پەژارەن بۆئینسان، کەوابوو بەهۆی ئەولادەوە باوك و دایك لەم دونیایەدا لەگەڵ بەخاڵەت و مەترسی و غەم و پەژارەدا ڕووبەڕوو ئەبن!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**اَلْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ**»[٣] واتە: منداڵ پاڵ ئەدرێتە لای نەسەب و بنەماڵە، وە حوکم ئەکرێ بەسەریا بە ئیسبات و چەسپاندنی نەسەب بە هۆی نیکاح کردن یا بە هۆی ئەوە کە ئینسان ئەبێتە مالك و خاوەن جارییەك کەوا لەژێر

---

١. جامع الكبير (١/ باب حرف الواو).

٢. جامع الكبير (١/ باب حرف الواو).

٣. صحيح بخاري (٢٠٥/٧) .

دەسەڵات و سەیتەرەیا، بەڵام ئینسانی خەتاکار و زیناکەر ئەگەر منداڵیان بێت پاڵ نادرێتە لایان، وە لەم پاڵدانە مەحرووم و مەئیۆسە، وە هەر داوایێ بکات جێگای باوەڕ نییە، کەواتە نەسەب و بنەمای خانەوادە، بە هۆی عەقدی نیکاح و مالکییەت بەسەر جارییەو کۆیلەدا سابتە نەك بەشتی‌تر!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**وَيْلٌ لِلشَّاكِينَ فِي اللَّهِ**»[1] واتە: سەخترین جێگا لە دۆزەخدا یا سەخترین سزای خوای گەورە لە پاشەڕۆژدا بۆ کەسانێکە کە گومان و دوو دڵییان هەیە نیسبەت بە بوونی زاتی خوای گەورە!

## پیتی لام و ئەلف (لا)

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لاإِلٰهَ إِلّا اللّٰهُ كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ**»[2] واتە: وتنی ڕستەی «لااله...» خەزانەییێکە لە خەزانەکانی بەهەشت، کەوابوو هەرکەسێ بیەوێ دەس ڕەسی بەخەزێنەکانی بەهەشت پەیدا بکات با ئەو ڕەستەیە بە زۆری دوپات بکاتەوەو بەدڵ و زمان پێکەوە بەو زیکرەیە مەشغووڵ بێت!

---

١ . الابانة الکبری لابن بطه (١٧٧/٥).

٢ . صحیح بخاری (٣٨٥/٢٢). لعل «لا حول و لا قوة الا بالله کنز....».

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لا إيمانَ لِمَنْ لا أَمانَةَ لَهُ**»[1] واتە: ئیمان و باوەڕی تەواو تەکمیڵی نیە کەسێك کە پارێزگاری لە ئەمانەتەکانەوە نەکات، چون ئەمانەتداری کاکڵەی باوەڕو عەقیدەیە، وەکوو قەلب وایە بۆ بەدەنی ئینسانی خاوەن بڕوا، وە لازم و پێوستە خاوەن عەقیدە لە خەیانەت و دەغەڵبازی خۆی پارێزێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لاتَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفُ قُلُوبُكُمْ**»[2] واتە: باجیاوازی و دووبەرەکایەتی لە نێوانتانا نەبێت، چون ئەم وەسفە ئەبێتە هۆی گۆڕانکاری لەدڵەکانتانا، وەختێکیش گۆڕانکاری لە دڵەکانتانا پەیدابوو سیقەو باوەڕ لە ناو کۆمەڵگادا کەم ڕەنگ ئەبێت، وە ئعتیبارو جوامێری لە بەین ئەچێت و ئەفەوتێ.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لاتَجْتَمِعُ أُمَّتِي عَلَى الضَّلالَةِ**»[3] واتە: ئوممەتی من لەسەر گومڕایی کۆ نابنەوە، کەواتە شتێ کە گومڕاییە و خیلافی یاساو بەرنامەی دینی پیرۆزی ئیسلامە ئەشێ ئوممەت و گەلی خاوەن بڕوا دووری لێ بگرن!

---

١. مسند امام احمد (٤٨١/٢٤) .

٢. صحيح مسلم (٤٢٥/٢).

٣. جامع الكبير (١/ باب حرف اللام).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لاتَسُبُّوا الدُّنیا فَإِنَّها مَطِیَّةُ الْمُؤْمِنِ**»[1] واتە: قسەی ناشیرین و نالایق بەدونیا و پێداویستەکانی دونیا مەڵێن، چون دونیا جێگای بەراوردکردنی نیازمەندییەکانی ئینسانی خاوەن بڕوایە، کەواتە چون هۆی کەسب و بەدەس هێنانی ئەو شتانەیە، کە لازم و پێویستی خاوەن بڕوان حەق نییە شتی خرابی پێ بوترێ!

وەهەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لاتَصْحَبْ إِلَّا مُؤْمِناً وَلایَأْکُلْ طَعامَكَ إِلَّا تَقِیٌّ**»[2] واتە ڕەفیقی مەکەو یار مەبە مەگەر لەگەڵ بڕوادارا نەبێت، چون تەبیعەتەکان و سوروشتەکان لە ئینساندا شت لە یەکتر ئەدزن و وەرئەگرن، کەوابوو ئەگەر ڕەفیقی لەگەڵ پیاوچاکاندا بکەی تەبع و سوروشتی تۆ ئەخلاقی ئەوان وەرئەگرێت و باش ئەبێت، وە ئەگەر لەگەڵ پیاوخراپ و بێ باوەڕدا ڕەفیقی بکەیت و هەڵس‌وکەوتت بێت، دوبارە تەبێعەتی تۆ تۆشی بێ‌باوەڕی و بێ‌عەقیدەیی ئەبێت، کەوابوو پێویستەو لازمە بۆ ئینسان ئەگەر بووبە ڕەفیقی هەرکەسێ تاقی کردنەوەی لەسەر بکات و ئیمتیحانی بکات تاتووشی داماوی و بەدبەختی دونیاو ئاخیرەت نەبیت، هەر بەم بۆنەوە حەزرەتی عەلی ﷺ فەرموویەتی: دوو تاقم پشتی منیان شکاندووە: یەکەم زانایەك ئابڕووبەر و مرووەت شکێنە، دووهەم عابیدی نەزانکار،

---

١. صحیح بخاری (١٢/۶)

٢. مسند امام احمد (۴۵۴/٢٢).

چون زاناکە بەو ئابڕووبردنە و حورمەت شکاندنە خەڵکان مەغرور ئەکات، وە عابیدەنەزانەکەیش ئەیانخاتە ناو فیتنەو سەر لێ شێواوی، وە هەروا با تەعام و خۆراکت نەخۆن مەگەر کەسانێ نەبن کە ئەهلی تەقوان و خۆپارێزن، چون تەعامدان بە هەرکەسێ ئەبێتە هۆی ئولفەت و تێکەڵی، وە گەورەترین جێگادەسی تێکەڵییە، کەواتە: تەعامدان بە ئینسانی غەیرە موتتەقی زیان بەدینی ئینسان ئەگەیەنێ وە ئەیخاتە ناو دوودڵی و گومانەوە. پاڵفتەی ئەم فەرموودەیە، ئەوەیە ئینسانی خاوەن بڕوا نابێ تێکەڵی ئینسانی خرابکار بکات وە نابێ نێعمەتی خۆی دەرخۆری هەرناپیاوێك بدات!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«لاٰخَيْرَ فِي مَحَبَّةِ مَنْ لاٰيَرىٰ لَكَ مٰاتَرىٰ لَهُ»** واتە: قازانج و سوود نییە لە خۆشویستنی کەسێکدا، کە قازانج و سوودی تۆی ناوێت بەو شێوەیە، کە تۆ قازانج و سوودی ئەوت گەرەکە، کەوابوو هەرکەسێ قازانج و سوودی تۆی ناوێ ئەگەر وایش نیشان بدات کە تۆی خۆش ئەوێت، باوەڕی پێ ناکرێت، وە خۆشویستنی وایش بێ بایەخ سەیر ئەکرێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«لاٰضَرَرَ وَ لاٰضِرارَ فِي الْإِسْلاٰمِ»**[1] واتە: با زیان نەدات ئینسانی موسوڵمان لە برای موسوڵمانی خۆی، وە بەشێ لە حەققی بفەوتێنێ، وە با تۆڵە نەسێنی لەکەسێ کە

---

١. سنن ابن ماجه (١٤٣/٧).

زیانی لێداوی بەڵکوو چاوپۆشی لێ بکەی باشترە تا ئـەوەی حەققی لێ بـستێنی، کـەوابـوو زیـان گـەیاندن و تـۆڵەی حـەق سـەندن هـەردوو چاوپۆشیان لێ بکرێ باشترەو قازانجی زیاترە تا موقابەلە بە میسلی پێ بکرێ، وە یا دەس پێش مەخە بۆ زیان لێدان لە تۆڵە سەندنا، وە ئەگەر زیانیان لێدایت چاوپۆشی بکەی باشترەبۆت!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«لاطاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْخالِقِ»**[1] واتـە: پێویست نییە و جێ دەس نییە بۆ ئینسان، کە لە فەرمانبەرداری ئینسانەکاندا خۆی تووشی گوناه و تاوان ببێت، کەوابوو، بە بەجێ هێنانی فەرمانی گەورە، یا هەر کەسێکیتر نابێ ئینسان تووشی هـەڵەو تـاوان ببێت، وە ڕەزایەتی مەخلووقی خوای بەلاوە موهیم بێت تا گوناه و بێ ئەمری کردنی خوای گەورە!

وە هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **«لاعَقْلَ كَالتَّدْبِيرِ وَلاحَسَبَ كَحُسْنِ الْخُلُقِ»**[2] واتـە: هـیچ ئـاوەزو عـەقڵێك وەکـوو ڕاوێـژو پـرسیارکردن نـییە، کـە ئینسان بـە یـاسای شـەرعی حـەرەکـەت کـات لە ئـەنجامدانـی کارەکانیا، وە هـەڵسوکەوتی بە یاسای شـەرع بێت، وە هـیچ ڕەوشتێك و دەسکەوتێ ئەخلاقی ناگات بە ڕەوشت و ئەخلاقی شیرین و پەسەند!

---

١. سنن ترمذي (٢٩٩/٦).

٢. سنن ابن ماجه (٢٦٣/١٢).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لاَفَقْرَ أَشَدُّ مِنَ الْجَهْلِ وَلاَمَالَ أَعَزُّ مِنَ الْعَقْلِ وَلاَ وَحْشَةَ أَشَدُّ مِنَ الْغَضَبِ**»[١] واتـە: هـیچ نـەبوونییەك نـییە سـەختتر بـێت لە نـەزانـی، وە هـیچ سـەروەت و کـەلەپوورێك نـییە بەقیمەتتر بێت لە ئاوەز و عەقڵ، وە هیچ شتێك نییە وەحشەتناکتر بێت لە بە خۆ زلزانین و تەکەببور کردن!

وە هـەروەها پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**لاَيَجْنِي عَلَى الْمَرْءِ إِلّا يَدُهُ**»[٢] واتـە: ئـینسان بە دەس خۆی شت کۆ ئەکاتەوە لەسەر خۆی، کـەوابـوو هـەرچێ دێت بـە سـەر ئـینسانداا، بـە هـۆی کـەسب و کـاری خۆیەتی!

وە هــەروەها پــێغەمبەری خــوا ﷺ فــەرموویەتی: «**لاَيَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِماً**»[٣] واتــە: حــەڵاڵ و ڕەوا نــییە بـۆ ئـینسانی مـوسوڵمان بـرای موسوڵمانی خـۆی بـترسێنێ، بـا بـە گـاڵتـەیشەوە بێت، کەوابوو بە هیچ وەسیلەیەك کـە ترسناك بێت، وەکوو چـەقۆ یا شمشێر وە... دروست نییە ئینسان برای موسوڵمانی خۆی پێ بترسێنێ!

---

١. معجم الكبير للطبراني (١١٢/٣) .

٢. جامع الكبير (١/ باب حرف الهمزة).

٣. سنن ابي داود (١٩/١٣) .

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمو یەتی: «**لایَزالُ الرِّجالُ بِخَيْرٍ مالَمْ يُطيعُوا النِّساءَ**»[1] واتە: پیاوان بە دەوام لەسەر خێرو قازانجن وە لەم خێرو قازانجە دوور ناکەونەوە، تا کاتێ فەرمانبەرداری لە ئافرەتان نەکەن، کەوابوو هەرکاتێ فەرمانبەردار ژنان بوون، وە پیاوان لە ژێر فەرمان و دەستووری ئەواندا بوون، وە لەهەرچی شتایە لەسەر مەیل و ئارەزووی ئەوان ئەجوولاّنەوە، تازە خێرو قازانج بۆ پیاوان چاوەڕوان ناکرێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لایَشْكُرُ اللّهَ مَنْ لا يَشْكُرِ النَّاسَ**»[2] واتە: سوپاسی خوا بە تەواوی ناکات کەسێ کە سوپاسی کارە چاکەکانی خەڵك نەکات، وە شتە باشەکانیان بێ موبالاتانە سەیر بکات!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لایُغْنیٰ حَذَرٌ مِنْ قَدَرٍ**»[3] واتە: خۆپاراستن لە شت سوودبەخش نییە لە قەزاو قەدەری قەتعی و موبرەم، بەڵکوو ئەو شتەی کە لە ئەزەلدا لە لایەنی خواوە دیاری‌کراوە دێتەجێ و جێی خۆی ئەگرێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍواحِدٍ مَرَّتَيْنِ**»[4] واتە: خاوەن بڕوای هۆشیار، دووجار لە شتێك

١. جامع الكبير (١/ باب حرف اللام).

٢. سنن ابي داود (٤٣٦/١٢) .

٣. المستدرك على الصحيحين (٣٢٠/٤)

٤. صحيح بخاري (٩٧/١٩) .

غەفڵەت ناکات و بخڵەتێ و تووشی زیان بێت، کەوابوو ئینسانی خاوەن بڕوا ئەشێ زیرەك بێت نەکەوێتە ناو شتی خراب، لە پاشی ئەوەی کە جارێك تووشی بوو، واتە ئەگەر ئینسان لە ڕێگەیەکەوە بەرنگاری زیانی دینی یا دونیایی بوو، حە قی نییە جارێکیتر لەو ڕێگەوە بڕوا، وە بگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو شتەی کە زیان بەخشە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«لَا يَكُونُ الرَّجُلُ مِنَ الْمُتَّقِينَ حَتَّىٰ يَدَعَ مَالَا بَأْسَ فِيهِ حَذْراً عَمَّا بِهِ بَأْسٌ»**[1] واتە: ئینسان لە ڕیزی خۆپاریزان و خواترسان ناژمێررێت تا ئەو کاتەی کە تەرك بکات و دوور بکەوێتەوە لەو شتەی کە خراپەی تێدا نابینرێت لە ترسی شتێك کە خراپەی تێدایە و مەترسی خرابەی لێ ئەکرێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّىٰ يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»**[2] واتە: با وەڕو ئیمانی تەواو نییە هیچکام لە ئێوە تا ئەو کاتەی، کە چی بۆخۆی خۆش ئەوێت، بۆ برای موسوڵمانیشی خۆش بوێ، ئەگەر حاڵی وای لێهات ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئیمانی تەکمیڵ و دامەزراوە!

١. فتح الباري لابن حجر (٩/١).

٢. صحيح بخارى (٢١/١).

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّىٰ يَكُونَ هَوَاهُ تَبَعاً لِمَا جِئْتُ بِهِ**»[١] واتە: ئیمان و باوەڕی تەواو تەکمیل نییە هیچکام لە ئێوە، تا هەواو ئارەزواتی نەفسی بکا بە شوێن کەتوو و پەیڕەوی ئەو یاسایەی کە من هێناومە لەلایەنی پەروەردگارەوە، کەبریتییە لە قورئان و سوننەت!

وه هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّىٰ يَكُونَ قَلْبُهُ وَلِسَانُهُ سَوَاءً**»[٢] واتە: ئیمان و باوەڕی تەواو تەکمیل نابێ هیچکام لە ئێوە، تا ئەو کاتەی کە دڵ و زمانی یەك ئەبن، بەو مانا بە دڵ چی قەسدو ئیرادە ئەکات بە زمانیش هەر ئەوە بێت، نەك بە دڵ شتێك قەسد بکات و بە زمان شتێکی‌تر بڵێت، واتە: یەکڕەنگ و یەك نەواخت بێت لە وتارو کردەوەدا!

---

١. الابانة الكبرى لابن بطة (٢٩٨/١) .

٢. جامع الكبير (١/ باب حرف الهمزة).

## پیتی یێ

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «يَاابْنَ آدَمَ اِرْضَ مِنَ الدُّنْيا بِالْقُوتِ فَإِنَّ الْقُوتَ لِمَنْ يَمُوتُ كَثِيرٌ»[1] واتە: ئەی ئادەمیزاد ڕازی بە بەوەی کە خوای گەورە لە دونیادا پێی بەخشیوی ئەو ئەندازە قووتەی کە جیاکراوەتەوە بۆ تۆ و سەهم و بەشی تۆیە، چون بەڕاستی قووتی بەدەوام و نەبڕاوە بۆ ئینسانەکان کە بەدەوام ببێت لە پاشی مردن پێیان ئەدرێت واتە: بەشی زۆری ڕزق و ڕۆزی بۆ ئینسان لە قیامەتدا پێی ئەدرێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «يَاأَبَابَكر مَاظَنُّكَ بِاِثْنَيْنِ اَللّٰهُ ثَالِثُهُمَا»[2] واتە: ئەی ئەبوبەکر ﷺ تۆ گومانت چۆنە، بە دوو ئینسان کەخوا وا لەگەڵیانا و ئاگایە بە حاڵی ئەوان، ئەمەیش لە کاتێکدا بوو کە حەزرەت ﷺ لەگەڵ حەزرەت ئەبوبەکری سدیقدا ﷺ لە ئەشکەوتی حیڕادا بوون، وە حەزرەت ئەبوبەکر ﷺ مەترسی بوو کە کافرەکان و بێ بڕواکان پێیان بزانن!

١. جامع الكبير (١/ باب حرف الياء).

٢. صحيح بخاری (٤٨٥/١١).

وه هــەروەها پــێغەمبەری خــوا ﷺ فــەرموویەتی: «**يا أَبا زَرٍّ جَدِّدِ السَّفِينَةَ فَإِنَّ الْبَحْرَ عَمِيقٌ**»[١] واتــە: ئەی ئەبازەڕ کەشتی عەهدو کردەوەکانت نوێ بکەرەوە، چون ئەو دەریایە، کە تۆ لەسەری قەرارت گرتووە قوڵەو نیازی بە ئەسبابی چاك و تازەو نوێ هەیە!

وه هـەروەهاپێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «**يا أَنَسُ أَطِبْ كَسْبَكَ تُسْتَجِبْ دَعْوَتُكَ**»[٢] واتــە: ئـەی ئـەنەس وریـابە بـا کـەسب و کـارت پـاك و خـاوێن بـێت، واتــە غـەلل‌و غــەشـشی تـیا نـەبێت و تـێکەڵ بـەحەرام نـەبێت، ئـەگەر بـەیاسای شـەرع بـڕۆیت لەکـەسب و کـارتا، هـەر نـزایـەك بکەیت لەلای خوای گەورە وەرئەگیرێ، چون هەر قاڵب و قەوارەیەك کە لەحـەرام پێك هاتبێ و دروست بووبێت ئاوری دۆزەخ شیاوی ئەوە، وە نزاو پاڕانەویشی لێ وەرناگیرێ!

وه هــەروەها پــێغەمبەری خــوا ﷺ فــەرموویەتی: «**ياحَرْمُلَةُ إِيْتِ الْمَعْرُوفَ وَاجْتَنِبِ الْمُنْكَرَ**»[٣] واتە: ئەی حەرموله (ناوی یەکێکە لە سەحابە بەرزەکانی حەزرەت) شتی باش و بەکەڵك ئەنجام بدە و لەشتی خراب خۆت پارێزەو لێی دوور کەوەرەوە!

---

١. الزواجر عن اقتراف الكبائر لابن حجر (٥١/١) .

٢. عمدة القاري (٢٦٠/١٧) .

٣. شعب الايمان للبيهقي (١٥/١٣).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «يَاحَبَّذا كُلُّ نَاطِقٍ عَالِمٌ وَكُلُّ مُسْتَمِعٍ وَاعٍ»[1] واتە: خۆزگایی هەر کەسێ کە شتێك ئەڵێت لە ڕووی ئاگاداری و زانینەوە شتی بوتایێ، وە خۆزگایە هەرگوێگرێك و بیسەرێك ئەو شتەی کە ئەبیسێ بیپاراستایێ، وە لە گەڕاندنەوەکەیدا زیاد و کەمی پێ نەکردایێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «يَاحُذَيْفَةُ عَلَيْكَ بِكِتَابِ اللّٰهِ»[2] واتە: ئەی حوزەیفە لەسەر تۆ پێویستە عەمەڵ بە کتێبی خوابکەی، کە قورئانی پیرۆزە، واتە لەسەر تۆیە عەمەڵ و موازەبەتکردن بکەی لە کتێبی خوای گەورە، وە بە گوێرەی ماناو حوکمەکانی ئەو پەرتۆکە عاسمانییە بچیت بەڕێوە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «يَاعُبَادَةُ اِسْمَعْ وَأَطِعْ فِي عُسْرِكَ وَ يُسْرِكَ»[3] واتە: ئەی عوببادە گوێڕایەڵ بە بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی سەختی و خۆشی و ناخۆشیا، وە یا لە کاتی تەنگی و ئاسایشا ئیتاعەو فەرمانبەرداری خوا بکە، کەوابوو ئینسانی خاوەن بڕوا عیبادەت و فەرمانبەرداری نابێ کاتی بێت، ئەشێ بە

١. المحدث الفاصل بين الراوي و الواعي (١٢/١).
٢. شعب الايمان للبيهقي (٤٥٤/٤).
٣. جامع الكبير (١/ باب حرف الياء).

دەوام لە هەموو کاتێکدا خۆشی یا ناخۆشی وە... دەس لەفەرمانبەرداری خوا هەڵ نەگرێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**يَاعُقْبَةُ صِلْ مَنْ قَطَعَكَ وَ أَعْطِ مَنْ حَرَّمَكَ**»[1] واتە: ئەی عوقبە، سیلەی ڕەحم بەجێ بێنە لەگەڵ کەسانێکدا کە ئەوان سیلەی ڕەحمیان بچڕاندووە و قەتعیان کردووە لەگەڵ تۆدا، وە بەخشین و عەتایات ببێت لەگەڵ کەسێکدا، کەقەتعی عەلاقەی لەگەڵ تۆدا کردووە، وە هیچ پەیوەندیەکت لەگەڵیان نەماوە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**يَاعَلِيُّ لَاتَرْجُ إِلَّا رَبَّكَ وَلَاتَخَفْ إِلَّا ذَنْبَكَ**» واتە: ئەی عەلی ئومێدەواریت بەغەیری خوا بە کەس نەبێت، وە لە هیچ شتێ غەیری تاوانت مەترسە و وەحشەتت نەبێت، کەواتە ئینسانی خاوەن بڕوا بەس ئەشێ بەخوا ئومیدەوار بێت و لەسزای کردەوە ناشیرینەکانی بترسێ، کە خوای گەورە تۆڵەی لێ ئەستێنێ!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**يَاعَمْرُو نِعْمَ الْمَالُ الصَّالِحُ لِلرَّجُلِ الصَّالِحِ**»[2] واتە: ئەی عەمر باشترین کەلەپووری چاك و بە کەڵك‌هاتووی دونیایی بۆ پیاوی چاك وساڵحە، کەواتە: ماڵی حەلاڵی بەدەرد خۆر، کە تێکەڵ بەحەرام نەبێت بەس شیاوی پیاوی سا ڵح و

١. مسند امام احمد (٢٠٦/٣٥).

٢. مسند امام احمد (١٦٥/٣٦).

باشە و لایقی ئەوە، چون تەنها ئینسانی ساڵح و باش بەشوێن حەڵاڵ و حەرامدا ئەگەڕێ کەسێ بە دین نەبێت لەحەڵاڵ و حەرام ناپرسێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**يَاعَمَّ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ أَكْثِرْ مِنَ الدُّعَاءِ بِالْعَافِيَةِ**»[1] واتە: لە کاتێکدا مامەی نوێنەری خوا پرسیاری لەحەزرەت ڕەسوول ﷺ کرد فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکم فێرکە کە بەو شتە، داخوازی بکەم لەخوای گەورە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە وڵامدا فەرمووی: ئەی عەبباس داخوازی بۆ بێوەیی و چاوپۆشی بکە لە خوای گەورە بە زۆری، واتە: با هەمووکات ئەم داخوازییەت ببێت!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**يَافَاطِمَةُ كُونِي لَهُ أَمَةً يَكُنْ لَكِ عَبْداً**»[2] واتە: ئەی فاتیمە (مەقسوود فاتیمەی کچ ڕەسوولی خوایە رضي الله عنها) تۆ وەکوو خزمەتکار بە بۆ مێردەکەت فەرمانبەرداری بکە، ئەگەر وا بیت مێردەکەیشت وەکوو بەندە لە خزمەتتدا ئەبێت، ئەمە خۆی دەرسێکی گەورەیە بۆ موسوڵمانان کە ئەشێ ژن و پیاو لە خزمەت یەکتردابن، وە چاو لەوە نەکەن، کە باب و باپیریان کێیە!

---

١. جامع الكبير (١/ باب حرف الياء).

٢. شعب الايمان للبيهقي (٢٤٨/١٨) .

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «يَبْصُرُ أَحَدُكُمُ الْقَذىٰ فِي عَيْنِ أَخِيهِ وَيَنْسَى الْجِذْعَ فِي عَيْنِهِ»[1] واتە: یەکێ لە ئێوە پووشێکی بچووك لە چاوی برای خۆیدا ئەبینێ، بەڵام لقە دارخورمایەکی گەورە لە چاوی خۆیدا نابینێ، کەواتە ئینسان لەبەر ناتەواوی، وە مەحەببەتی زۆری خۆی زۆر دیققەت ئەکات پووشێکی بچووك، واتە عەیبێکی کەم لە برای موسوڵمانیا بەدی ئەکات بەڵام عەیبێکی گەورە لە خۆیدا هەیەو مەوجوودە بەدی ناکات و نایبینێ!

وە هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «يَسِّرُوا وَلَاتُعَسِّرُوا وَ بَشِّرُوا وَلَاتُنَفِّرُوا»[2] واتە: هەرکات و سات لەگەڵ خەڵکاندا، بە شتێکی ئاسان بەرخورد کەن کە بتوانن ئەلفەتی پێوەبگرن، وە شتی قورسیان لەسەر دامەنێن، بافیرار نەکەن لەپەندو ئامۆژگاری، وە شت بەسەختی و توندی مەگرن لەسەر خەڵك، وە مزگێنی بدەن بە ڕەحمەتی خواو پاداشی هەرەگەورە بە بەخشش و چاوپۆشی و عەفوی خوا، وە شتێك مەڵێن بە خەڵکان کە لەدین دوور بکەونەوە، وە بێزاری نیشان بدەن و دەربڕی کەن!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اَلْيَمِينُ الْفَاجِرَةُ تَدَعُ الدِّيَارَ بَلَاقِعُ»[3] واتە: سوێندی درۆ و ناحەق کاتێ لەناو خەڵکدا زۆر

---

١. مسند شهاب القضاعي (٢٦١/٢). و جامع الكبير (١/ باب حرف الياء).

٢. صحيح بخاري (١٢٢/١).

٣. جامع الكبير (١/ باب حرف الياء).

و پەرەی سەند ئەبێتە هۆی وێران بوونی وڵات، وە ئاوە دانی ئەکات بەچۆڵگەو وێرانە، واتەخوای گەورە عادەتی وا جاری بووە هەر کۆمەڵگایەك موبالات نەکەن بەسوێندی درۆ و ناحەق ئەوە ئەو کۆمەڵگایە نابود ئەکات و لە بەینیان ئەبات!

وە هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«اَلْيَوْمُ الرِهٰانُ وَ غَداً السِّبٰاقُ وَالْغٰايَةُ اَلْجَنَّةُ وَالْهٰالِكُ مَنْ دَخَلَ النّٰارَ»**[1] واتە: ئەمڕۆ کە دونیایە ڕۆژی ئەوەیە کە تەمەنت بنێیتە گرەوگان بۆ سبەینێ کە قیامەتە، وە قیامەت ڕۆژی کێبەرکێیە، کە چ کەسێ بەرندە ئەبێت و سەر ئەکەوێت جا سەرەنجام هەرکەسێ بەرندە بوو ئەوە ئەچێتە ناو نازو نیعمەتی خوای گەورە کەبەهەشتە، وە زەلیل و تیاچوو کەسێکە کە بچێتە ناو سزای هەرە سەختی خوای گەورە، کە ئاوری جەهەننەمە!

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«يٰاأَيُّهَا النّٰاسُ أَلٰا تَسْتَحْوُنَ تَجْمَعُونَ مٰا لٰاتَأْكُلُونَ وَ تَبْنُونَ مٰا لٰاتَسْكُنُونَ»**[2] واتە: ئەی ئینسانەکان ئاگادار بن، بۆ شەرم ناکەن، خۆتان پارێزن لەم دونیایە! کەچی لەحاڵێکدا کۆئەکەنەوە لەم دونیایەدا ئەو شتەی کە نایخۆن وە بینا ئەکەن و دروست ئەکەن ماڵێك کە بۆ هەمیشە تیایا نابن، کەوابوو ئەشێ ئێوە لەم دوو کارە دەرسی عیبرەت وەرگرن!

---

١. الكعجم الكبير للطبراني (١٠/ ٢٦٥).

٢. شعب الايمان للبيهقي (١٥٤/٢) . و جامع الكبير (١/ باب حرف الياء).

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ وَ أَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَصِلُوا الْأَرْحَامَ وَصَلُّوا وَالنَّاسُ نِيَامٌ»**[1] واتە: ئەی ئینسانەکان سڵاوکردن و مەرحەبایی لە نێوان خۆتانا پەرە پێ بدەن و بڵاوی بکەنەوە، وە تەعام و خۆراك بدەن بەهەژاران و فەقیران، وە سیلەی ڕەحم و سەردان لە خزمان تەرك مەکەن و بەجێی بێنن، ئەگەر ئەم کردەوانەتان ئەنجامدا، بە بێوەی داخڵی بەهەشتی خوا ئەبن، کەوابوو ئەنجامدانی ئەم کردەوانە هۆی چوونە ناو بەهەشتی ئینسانە، وە هۆی ڕەزامەندی خوای گەورەیە!

وە هەروەهاپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«يَامُعَاذُ! قَالَ: لَبَّيْكَ يَارَسُولَ اللّٰهِ وَ سَعْدَيْكَ ثَلَاثاً قَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَشْهَدُ أَنْ لَاإِلٰهَ إِلَّااللّٰهُ وَ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ صِدْقاً مِنْ قَلْبِهِ إِلَّاحَرَّمَهُ اللّٰهُ عَلَى النَّارِ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَفَلَا أُخْبِرُهُمَا النَّاسَ يَسْتَبْشِرُوا؟ قَالَ: إِذًا يَتَّكِلُوا فَأَخْبَرَ بِهَا مُعَاذُ عِنْدَ مَوْتِهِ تَأَثُّماً»**[2]. واتە: ئەی مەعاز(ناوی یەکێکە لە سەحابەکانی ڕەسوولی خوا ﷺ) مەعازیش لە وڵامدا فەرمووی بەڵێ حازرم بۆ فەرمانبەرداریت و وام لەخزمەتدا ئەی نوێنەری خوا، سێ جار فەرمووی حازرم لەخزمەتدا پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی نییە هیچ بەندەیەکی خوا گەواهی

---

۱. المستدرك علی الصحیحین للحاکم (۶۵/۱۰).

۲. صحیح بخاری (۲۱۸/۱).

بـدات بـەوە کـە هـیچ کـەسێ نـییە غـەیری خـوا شـیاوی پـەرەستش و بەندایەتی بێت. وە گەواهی بدات بەوە کە حەزرەت موحەممەد ﷺ بەندەی خوایەو نوێنەری خوایە. وە ئەم گەواهیدانەیشی بە دڵ بێت و ڕاستکات، ئیللا خـوای گـەورە ئـاوری جـەهەننەم لەسـەر ئـەو بـەندەیە حەرام ئەکات و ئەیپارێزی، ئەمجار مەعاز فەرمووی: ئەی نوێنەری خوا خەبەر نەدەم بەخەڵکان مزگێنی بە یەکتر بدەن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە وڵامی مەعازدا فەرمووی: ئەگەر خەبەر بدەی بە خەڵکان بەم مزگێنییە تەرکی کردەوەکان ئەکەن و پشت لەسەر ئـەوە دەبەستن، و بەم شێوەیە پلەی بەرزیان لە قیامەتتدا لەدەس دەر ئەچێ، وە لەڕاستیدا نوێنەری خوا ﷺ زۆر ئیهتیمامی داوە بەوەزعی گەلەکەی وە ئیعتینای کردووە بە وەزعییتیان، بەوە کە پلەیان لە قیامەتتدا زۆر بەرز بێت جا ئاماژەی کرد بۆ مـەعاز کـە ئـەم مـزگێنییە ڕانـەگەیێنێ چـون ڕانـەگەیاندنەکەی نـەتیجەی باشترە تـا ڕاگـەیاندنەکەی ئەوەبوو مەعاز ﷺ لەترسی ئەوەی کە بۆی نـەبێتە کـەتمان لەکـاتی نـزیکی فـەوتیا خـەبەری دا بـەخەڵك و شـتەکەی بەیانکرد لەبەر ئەوەی گوناهبار نەبێت و قەرزدار نەبێت لای خوا.

جـائەم پـەرتۆکەیە تـا ئێرە پـڕ مـاناترین فـەرموودەی نوێنەری خـوایە ـ سڵاوی خوا لەسەر خۆی و یارەبەرزەکانی بێت ـ، ئـەم فـەرموودانە هـەرچەن کـۆتان، بـەڵام شـامیلی هـەمووکارە چـاکەکان دێـن، چ لە بـواری بـاوەڕو عـەقیدەدا، وە چ لە بـواری کـردەوەو سـوروشتی ئـینسانیدا، وە

هەر ئینسانێك بیانزانێ وە نگاداریان لێ بکات، وە بە کردەوەیش ئەنجامیان بدات، ئەوە ئەو کەسە بەقازانج و خێری هەردوو دونیا ئەگات، وە خۆشبەختی هەردوو دونیای تووش ئەبێت!

وەلازم و پێویستە لەسەر ئێمەی موسوڵمان هەروا نەسڵ و خانەدانی پاکی ڕەسوولی ئەکرەممان خۆش گەرەکبن وە ئەو پەڕی مەحەببەتمان بۆیان ببێت، وەجێگای گومان نییە هەر کەسێ پێغەمبەری خوای خۆش گەرك بێت ئال و بەیت و یارەکانیشی خۆش ئەوێت، ئەو ئال و بەیت و یارانەی کە خوای گەورە ئەوانەی بۆ هەڵبژاردبوو وە کردبوونی بە پشتیوانی ئەو وە هەروا نەسڵ و خانەدانی ئەویشی خۆش ئەوێت، چون مەحەببەتی ئەوان تێکەڵ بە مەحەببەتی ئەو خۆشەویستەیە. خوای گەرورە لە سوورەتی ئەحزاب لە ئایەتی ژمارە شەشدا ئەفەرمێ: ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَ أَزْوَاجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ﴾ واتە: نوێنەری خوا ﷺ نیسبەت بەخاوەن بڕوایان زۆر دڵسۆزترە تا خۆیان بۆ خۆیان، وە خێزانە پاکەکانیشی بۆ موسوڵمانان پلەی دایکیان هەیە، وەکوو دایکانی خۆیان وانە، وە ئەمە شتێکی سوروشتی و تەبێعییە، کەسێ مەحەببەتی ڕاستەقینەی بۆ کەسێك بێت خێزان و بنەماڵەکەیشی خۆش ئەوێت، ئاشکرایە کەسێ گوڵی خۆش بوێت بۆنەکەیشی خۆش ئەوێت، وە ئەمە لای خواناسان هەم نەقڵەن، وە هەم عەقڵەن سابتەو ڕوونە!

**«وصلّى الله على سيّدنا محمّدٍ وعلى آله و صحبه وسلّم»**

## خۆش ویستنی یارەبەرزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ

یارانی نوێنەری خوا ﷺ ئەو کەسانەن، کە چاویان بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبێت یا نوێنەری خوا ئەوانی دیتبێت لەگەڵ باوەڕو تەسلیم بووندا، وە لەسەر ئەو حاڵەتە کۆچی دوایی کردبێت لە دونیادا ئیتر تەفاوتی نیە زۆر لە خزمەتیا بووبێت یا کەم، وە فەرموودەی لێ وەرگرتبێ یانە، وە ئەمەیشە لەبەر ئەوەیە ،چون نووری بەیەك گەیشتنی نوێنەری خوا ﷺ بە چاوپێکەوتنی بە یەك چاوتروکان دڵی ئینسانی ڕۆشن ئەکرد، کە غەیری ئەو لە ماوەیەکی درێژو توولانیدا ئەو کارەی بۆ نەدەکرا.

وە هۆ کەیشی ئەوە بووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تایبەتمەندی بووە بە فەزائیل و گەورەیی ڕۆحی و بەنفوس شەخسی، وە بە ڕاکێشانی شتە پاکەکان، وە بۆ ئونس و ئولفەتی جوان بەبێ حەددو ئەژمار. ﴿**وَاللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ**﴾ واتە: خوای گەورە ڕەحمەتی خۆی ئەدا بە هەر کەسێ لە بەندەکانی خۆی کە مەیل و ویستی لەسەری بێت، جا بەم بۆنەوە تۆ ئەبینی کە قورئانی پیرۆز، بە شێوەی گشتی و بە شێوەی

تایبەتی تاریفیانی کردووە تاریفیان ئەکات بە تاریف کردنێکی جوان و ڕێك و بەرز لەبەردەم ئاوەزی هەموو خواناسێك و هەموو پسپۆڕێکدا، وە بەڵگەش لەسەر واجب بوونی مەحەببەت و خۆش‌ویستنیان لەسەر مووسڵمانان و خاوەن بڕوایان ئەوەیە، چون ئەوان بوون بۆ بڵاوکردنەوەی دین، وە تێکۆشان لە ڕێگەی دیندا، ڕچەشکێن بوون وە کۆمەڵ و گرووپی ئەووەڵ بوون بۆ تەواوی خاوەن بڕوایان لەسەر زەویدا، وە هەر لەبەر ئەوەیە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، بە زۆری نیشان ئەدەن و دەلاڵەت ئەکەن، کە ئەمانە لای خوای گەورە ڕێزیان هەیە و پلەیان زۆر بەرزە، جا بەشێ لەو ئایەتانە بە شێوەی گشتی پلەی بەرزی ئەوان باس ئەکەن، وەکوو فەرموودەی خوای گەورە لە سورەتی ئالی‌عیمراندا ئایەتی ژمارە سەدو دە ئەفەرمێ:

﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَ تَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ واتە: ئێوە باشترین گەل و نەتەوەن لە ناو خەڵکدا لەبەر ئەوە، چون فەرمان ئەدەن بە چاکەو کاری پەسەند، وە بەرگری ئەکەن لە خراپەو کاری نەشیاو!

وە هەروا خوای گەورە لە سوورەتی فەتح لە ئایەتی ژمارە بیست و نۆدا ئەفەرمێ:

﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللّٰهِ وَرِضْوَاناً﴾ واتە: موحەممەد ﷺ نوێنەری

خوایە، وە ئەو کەسانەی کەوان لە خزمەتیا و یاوەری ئەون زۆر توندو تیژن لەگەڵ کافران و بێ بڕواکاندا، بەڵام لە نێوان خۆیاندا بۆ یەکتر زۆر میهرەبان و بە ڕەحم و بەزەیین، تۆ ئەوان ئەبینی کرنوش و سوجدە بردنیان بۆ خوایە، و داخوازی فەزڵ و ڕەزامەندی خوا ئەکەن، وە شتی تریان مەتڵەب نییە.

واتە لەگەڵ کەسێکدا کە دوشمنی دینەکەیان بێت، زۆر زۆر توندو سەختگیرن بەڵام کاتێ لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خاون بڕوان ڕووبەڕوو ئەبن زۆر بە بەزەیین و میهرەبانن، وە زۆر نەرم و نیانن!

وە بەشێکی تر لەو ئایەتانە کە بە شێوەی تایبەتی و خسوسی دەلاڵەت لەسەر گەورەیی و ڕێزی ئەو یارە بەرزانەی نوێنەری خوا ئەکەن ئایەتی ژمارە سەدی سوورەتی تەوبەیە کە خوای گەورە ئەفەرمێ:

﴿**وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَ رَضُوا عَنْهُ وَ أَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ**﴾ واتە: ئەو کۆمەڵە پێشووانە لە یارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ چ لە کۆچەریەکان و چ لە وانەی کە پشتیوان و یاریدەدەری دینەکەی خوابوون، واتە ئەنسارییەکانی مەدینەی پیرۆز، چ ئەوانەی کە شوێنکەوتووی ئەوان بوون بەڕێك و پێکی خوای گەورە لە وان ڕازییە، وە ئەوانیش لە خوا ڕازین، وە بۆ ئەوان بەهەشتی ئامادە کردووە ئەو بەهەشتەی کە لە ژێرماڵەکانیا ڕووباری جوان جوان ڕەوان

وجاریە. وە ئەو ئینسانانە کە چوونە ناو بەهەشتەکەی خوای گەورە بۆ هەمیشە تیایا ئەمێننەوە، وە ئەمەیش سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ ئەوان!

وە هەروا خوای گەورە لە سوورەتی فەتحدا لە ئایەتی ژمارە دە دا ئەفەرمێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُاللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی کە لە حودەیبییەدا، کە مەشهوورە بە «بيعة الرّضوان» عەهدو قەراردادی مردنیان لە خزمەت تۆدا مۆرکرد، کە تا ئاخر لەحزەی ژیانیان و ڕژانی ئاخر قەترەی خوێنیان وان لەگەڵ تۆدا ئەوانە هەرچەن بەزاهێر دەستی عەهدو قەرار بەستنیان لە دەستی تۆ ناوە، بەلاّم لە ڕاستیا عەهدو قەراریان لەگەڵ زاتی خواد ابەستووە، چون تۆ نوێنەرو نمایندەی خوایت، وە قودرەتی خوای گەورە وا لە ژوورەوەی قودرەت و توانای ئەوانەوە، وە ئاگایە بەسەر حەرەکات و سەکەنات و ڕەفتاریاندا، وە بەوەی کەوا لە دڵیانداو نهێنییە!

وە هەروا خوای گەورە لە سوورەتی فەتح لە ئایەتی ژمارە هەژدەدا ئەفەرمێ: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَ أَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً﴾ واتە: سوێند بەخوا، بەڕاستی خوای گەورە ڕازییە لە ئیمانداران لە کاتێکدا لە «بيعة الرّضوان» لە حودەیبییەدا عەهدو پەیمانیان بەست لەگەڵ تۆدا، کە تا ئاخر نەفەس و گیاندان لەگەڵ دوشمەنە کافرەکاندا بەشەڕ بێن و بجەنگێن، ئەمەیشە لە کاتێکدا بوو کە پێغەمبەری خواﷺ تەشریفی برد بۆ

مەککەی پیروز بۆ بەجێهێنانی ئادابی عەمرە، کاتێ گەیشتنەحودەیبییە، کەجێگایەکە لەنزیك مەککەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ حەزرەتی عوسمانی نارد بۆ ناو موشریکەکان لە مەککەدا کە پێیان ڕاگەیەنێ ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین بەڵکوو بۆ بەجێهێنانی ئادابی عەمرە هاتووین، کاتێ کە حەزرەتی عوسمان ﷺ گەیشتە ناو شاری مەککە کە ئەم هەواڵیانە پێ ڕاگەیەنێ لەوێ بەرگریان کرد لە حەزرەتی عوسمان ﷺ نەیانهێشت بگەڕێتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە خەبەریان بڵاو کردەوە کە حەزرەتی عوسمان شەهید کراوە، ئەو کاتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە یارەکانی، کە ژمارەیان لەو سەفەرەدا هەزار و چوار سەد کەس بوون هەمویان کۆببنەوە، ئەوەبوو لە ژێر ئەو درەختا لە حودەیبیەدا هەموویان کۆبوونەوە و قەراریان بەست کە بە عینوان شەڕ و گرتنی مەککەی پیرۆز داخڵ بە مەککە ببن، ئەو کاتە هەمووی عەهدی گیان لەدەس دانیان بەست لەگەڵ پێغەمبەری خوا دا ﷺ! بەغەیر باوەگەورەی قەیس نەبێت، کە لە مونافقەکان بوو پاش ئەم قەرارداد و عەهدە هەواڵ گەیشتە موشریکەکان و ترس و وەحشەت دایگرتن و حەزرەتی عوسمانیش ﷺ ئازادکرا وە داخوازی سوڵح و ئاشتیان کرد، کەساڵکیتر بێن و داخڵی مەککە ببن وە سێ ڕۆژ لە مەککەدا بمێننەوە، ئەو کاتە موسوڵمانەکان زۆر پەرۆش و ناڕەحەت بوون، بەم بۆنەوە خوای گەورە دڵخۆشی یارە بەرزەکانی حەزرەتی

موحەممەد ﷺ ئەکات و ئەفەرمێ: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ﴾ واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی خوای گەورە لەو ئینسانانەی کەوان لە خزمەت نوێنەری خوادا ڕازییە، وەسەرە ڕای ئەمەیش ئەزانێ و ئاگایە، کە ئەو یارانەی نوێنەری خوا چی وا لە دڵیاندا ئەو کاتە خوای گەورە ئارامشی نەفسی و خۆگری کرد بە نەسیبیان و پاداشی دانەوە لەسەر ئەو عەهدو قەرارەی کە لە خزمەت نوێنەری خوادا بەستیان بەوە کە خەیبەریان فەتح کرد و دەسکەوتێکی زۆریان بەدەس هێنا! وە هەروەها غەیری ئەمانەیش چەنها ئایەتیتر هەیە لە قورئاندا کە دەلالەت لەسەر گەورەیی و پلەو مەقامی هەرەبەرزی ئەو یارانەی پێغەمبەر ئەکەن، وە ئەوە ئەگەیێنن کە خوای گەورە لەوان ڕازییە و ئەوانیش لە خوا ڕازین، کە ئەمەیشە بۆ فەزڵ و گەورەیی ئەوان بەسەو کافییە.

وە هەروەها لەبارەی فەزڵ و گەورەیی یارانی بەنرخی حەزرەت ﷺ فەرموودەی شەخسی پێغەمبەر ﷺ زۆر هەیە کە دەلالەت لەسەر پلەی بەرزو پایەی ئەوان ئەکەن، وە بەراوردکردنی ئەوان لەگەڵ ئینسانە عادییەکانیتر، وەکوو بەراورد کردنی ئەستێرەی سورەییا وایە لەگەڵ کورەی خاکیا چەندە فاسڵەو تەفاوتیان هەیە ئەوانیش نیسبەت بە غەیری خۆیان ئاوانە و ئەوندە روتبەیان بەرزە، خوای گەورە جەزاو پاداشیان بەخێر بداتەوە لەجێ ئێمە، چون ئێمە ناتوانین جەزای تێکۆشانی بەرزی ئەوان بدەینەوە!

ئەگەر تۆی خاوەن بڕوا بەئاوەزی خۆت تێبینی بکەی و دیققەت بکەی ئەوە ئەسەلمێنی کە ئەو یارە بەرزانەی حەزرەتە ﷺ خوای گەورە هەڵی بژاردوون بۆ بەستنی عەهدو عەقدی بەڵێندان لەگەڵیاندا، چ بەماڵ، و چ بەگیان لە دەس دان لە بەرابەر بەهەشتەکەی خۆیەوە و بۆ بە دەس‌هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە، وە تۆی موسوڵمان باوڕیش دێنی و ئاگاداری پەیدا ئەکەیت کە ئەو یارە بەرزانە بەس ئەوانن ئامادەبوون بۆ ناشتنی نەهاڵی ئیمان لە باغچەی ڕاستەقینەی ئیسلامدا، وە بۆ بەدەس هێنانی ئـــەخلاقی پاك و بێ غەش لە دڵانی پاکـدا.

ئەوانەی خوای گەورە لە ناو تەوای ئینسانەکاندا هەڵی بژاردن و مەداڵی گەورەیی چەسپاند بەسەر شانی موبارەکیاندا، وە ئەوانیش بەحەق وەفایان کرد بەو عەهدو بەڵێنەی کە دابوویان بە خوای خۆیان، وە درەختی ئیمان و عەقیدەیان لەناو دڵانی پاکدا ناشت، وە بە جوانی و ڕێك‌وپێکی ئاودێریان کرد، وە ئەم ئەرکە گەورەیانە لە باقی وڵاتەکانی‌تردا مولاحەزە کرد، تا ئەو جێگایە درەختی باوەڕ سەوز بوو، وە بەرزەوە بوو و پێگەیی و بە جوانی سەمەری خۆی دا، وە دڵانی پاك و ڕۆحی بەشەریان بە دەم و نفووسی بە بەرەکەتاوی خۆیان عەتراوی کرد و بەبۆنی جوانی زیکرو ئەورادێ وێنەی گوڵی بەهاری ئاشکرا لەبەر چاوان و دڵانی ئەهلی خواناسانی هەڵبژێرراودا بۆنخۆش و عەتراوی کردا!

جا ئا لەم جێگادا ئینسانی خواناس و خاوەن ئاوەز، باوەڕ دەهێنێ بەوەی پێویستە و لازمە لەسەر ئیمانداران بەگشتی ڕێزو ئیحتیرامیان بۆ دانێن و مەحەببەتیان ببێ بۆیان لەبەر ئەوەی چون ئەو یارە بەرزانە ئەو هەموو فەزائیلەیان بووە و بە ئەرکی سەرشانی خۆیان عەمەڵیان کردووە، ئەو ئەرکانەی کە زۆرگرنگ و پێویست بوون بۆ ئوممەتی ئیسلامی، چ لە بواری تێکۆشانیاندا بۆ جیهاد، وە چ لە بواری تێکۆشانیاندا لە ڕەهنومایی کردنی ئینسانەکاندا، وە ڕۆشن کردن و داگیرساندنی دڵی ئینسانەکان بە نووری ئیمان و ئیسلام، کەواتە ئینسانی زانا ئەزانێ، وە ئینسانی خواناس دەرك ئەکات، کە ئەوانە دادگەرو بەرزو بەڕێز بوون، وە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا بەرتەرییان بووە بەسەر باقی ئینسانەکان لەم سەر ئەرزەدا.

وە ئەگەر تۆ لە ڕاستیا بتەوێ، کە پلەی ڕێزی یەکێ لەوانە یا کۆمەڵێك لەوانە بناسی، پێویستە لەسەرت کە سەیری زانست و کردارو ئەخلاق و حاڵ و خزمەتیان بکەی، تا بەم تێکۆشانەیان ئینسان بگەیننە کەماڵی ئینسانییەتی خۆی، وە هەرکاتێ ئێمە سەیری ئەوان بکەین کە چۆن بوون بەڕاستی ئەوان ئەبینین کە زۆر پلەیان بەرز بووە لەم بوارەدا!

کەواتە **پلەی یەکەم** باوەڕو تەسدیق کردنە بەخواو پێغەمبەری خوا ﷺ وە بەو شتەی، کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی لەلایەنی زاتی خواوە، وە لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنهابوو و هیچ کەسێ نەبوو یاوەرو کۆمەکی بێت و نیازی بەوە بوو کە ئینسانێکی

ڕاستویژ کۆمەك و پشتیوانی بێت، ئا لەم کاتەدابوو کە ئەسحاب لە مەیدانی کۆمەك و باوەڕهێناندا بوون بە یاوەرو بەردی بنەڕەتی بۆ ئەساسی ئەم دینە پاکەیە.

**وە پلەی دووهەم** قەبوڵ کردنی ئەو هەموو ڕەنج و موشەققەتە بوو کە ڕژایە سەریان لەلایەن بێ بڕواکان و موشریکەکانەوە و دوشمەنایەتی و بەرهەڵستی نابەجێی ئەوان بوو بە ئەزیەت کردن و سووکایەتی پێکردنیان و ئازار دانیان، وە بەرخوردی ناشیرین و نابەجێیان لەگەڵ ئەکردن تا ئەوڕاددەیە کە بڕێکیان لە ژێر ئەشکەنجەو ئازاردا بە دەرەجەی شەهادەت ئەگیشتن، وە لەگەڵ ئەو هەموو دەردی سەریەدا کە ڕژابووە سەریان ئەوان کەشتی و پاپۆڕی نەجاتی خۆیان بەبێ وستان لێخوڕی و هیچ باکیان بە شەپۆلی نابەجێی و تیاچوون نەئەدا، وە تەرکی وڵاتی خۆیان ئەکردو ژن و منداڵیان بەجێئەهێشت و ئەچوون بۆ وڵاتانی دوور و لەناو غوربەت و موشەققەتا ئەمانەوە، جا لەپاش ئەوە بەهۆی هەواڵێکی دڵخۆشکەر گەڕانەوە بۆ مەککەی پیرۆز، وە لەپاش ئەوە دوبارە گەڕانەوە بۆ حەبەشە و لەوێ مانەوە تا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەی منەووەرە.

ئەو کاتە لە حەبەشەوە حەرەکەتیان کرد بەرەو مەدینەی پیرۆز تا بەخزمەت نوێنەری خوا بگەن، وە لە ژێرسایەی گەورەیی و خۆشبەختی ئەو نازدارەدا بحەسێنەوە ئەوەبوو گەیشتنە مەدینەی پڕ لە نوور و بە

نووری حەزرەت خۆیان زیاتر نوورانی کرد و ئەوەی کە ئاواتیان بوو دەسیان کەوت!

**پلەی سێهەم** پەیدابوون و حازربوونیان لەمەیدانی بلاوکردنەوەی پەرتۆك و ڕیسالەتی ئیسلامیدا بوو، وە وارد بوونیان بوو لە مەیدانی جیهاد و شەرکردندا لەگەڵ دوشمەنانی دینا بە هەومو هێزو قەسدو ئیخلاسەوە، وە هەروا وارد بوونیان بۆ چەن شەڕێکی قورس و نابەرابەر بوو بە هەڵگرتنی شمشێری بوڕندەو تیژی خۆیان.

وە هەروا قەبوڵ کردنی کوشتن و شەهادەت بوو لە ڕێگەی خوادا و تەحەممول کردنی زەخمار بوون و بریندار بوونی سەخت بووە لەبەر ڕەزای خواو بەرزبوونەوەی وشەی «لاالەالاَّالله». وە یەکێ لەو شەڕانە شەڕی بەدر بووە و هەروا شەڕی ئوحود و خەیبەرو خەندەق بوون، کە خوای گەورە لەچەن جێگایەکی زۆردا یارمەتی ئەدان و کۆمەکی ئەکردن، وە مەککەی پیرۆزیان لە دەستی کافران ئازاد کردو ڕزگاریان کرد، کەژمارەی جەنگاوەرانی ئیسلام لەو شەڕەدا هەشت هەزارکەس لە چاکترین پیاوانی ئەو زەمانە بوون، پاشان داخڵی شەڕی حونەین بوون، وە فەتح و پیرۆزیان بەدەس هێنا، وە زیاتر لەمانەش چەن شەڕێکیتر و چەن غەزوەیەکیتریان ئەنجام دا، کە ژمارەی ئەم غەزوانە لە شەست و سێ غەزوە زیاتر بووە، وە لە بیست و حەوتیانا خودی پێغەمبەر ﷺ تەشریفی حازر بووە، نێهایەتەن گەیشتوونەتە پلەیەك کە شەهادەت و

مردنیان لە ڕێی خوادا بە گەورەترین پلەی بەختەوەری داناوە و گەیشتن بەو شتەی کە ئاوات و ئارەزوویان بوو پێی بگەن لە پلەی خێرو شەهادەت و گەورەیی و شەرافەت لە ناو عالەمدا!

**پلەی چوارەم** لەگەڵ ئەوەشدا کە نزیك بوون لە وەزعییەتی بادییە نشینی، و دووربوون لە زانست و فێربوونی زانست، وە رگرتنی ئەم قورئانە بەرزە بووە کە بڕێکیان فێری نووسینی بوون و ئەیاننووسییەوە، وە بڕێکی تریان لەبەریان ئەکردو مولاحەزەیان ئەکرد، وە بە جوانی ئایەتە پیرۆزەکانی و کەلیماتەکانی و پیتەکانیان زەبت ئەکرد، وە هاوکات هۆی نازڵبوونی ئایەتەکان و مەواریدی نزوولەکەیان لە دانان و شیکردنەوەدا بە جوانی و ڕێك و پێکی زەبت ئەکرد.

وە هەروا لە ڕەسولی خواوە وەریان ئەگرت و زەبتیان ئەکرد ئەوەی کە فەرمووده و حەدیس بوو، لە سوننەتی قەولی و فعلی و تەقریری لەبارەی شیکردنەوەی ئەم کتێبە گەورەیە کە قورئانە، ئەو قورئانەی کە لە هیچ لایەکەوە شتی بەتاڵ ڕووی تێ ناکات، کە ئەمە کتێبێکە لە لایەنی خوای گەورەوە نازڵ بووە و هاتووەتە خوارەوە بۆ سەر قەلبی پاکی ڕەسولە للا ﷺ جا ئەو ئەسحابە بەرزانە بە هۆی ئەو کردەوە جوان و پەسەندانەوە و بەهۆی ئەو تەلاش و تێکۆشانە مەقبوولانەوە گەیشتنە مەرزێکی زۆر بەرزو بەرفراوان و بەکەڵك، کە بەرهەمەکەی دروست کردن و تەشکیلدانی ئەساس و قەوارەی دەوڵەتی ئیسلامی بوو

لە دوورگەی جەزیرەتو لعەرەب دا، وە لە کۆتایشدا بەرگی ڕەستگارییان لەبەر کرد بە ئەنجامدانی حەججێکی گشتی زۆر زۆر موهیم، کە ژمارەی ئەو بەڕێزانە پێك هاتبوو لە سەدو چوار هەزارکەس لە موسوڵمانانی بەرز و بەڕێز.

وە ئەم کۆنگەرەی حەججە لەو کاتەدا، ناونرا بە حەججی ماڵئاوایی، چون حەزرەت ﷺ لەو سەفەرەیەدا ماڵئاوایی ئاخری لە وەتەن و شوێنی ئەسڵی خۆی، کە مەککەی پیرۆز بوو، کرد ئەمەیشە بە هۆی نگای دەرونیەوە کە لەلایەنی زاتی خواوە بۆی هاتبوو ئیتر وەختی ماڵئاوایی و گەیشتنیەتی بە زاتی پەروەردگارا!

وە ڕەسولی خوایش لەناو ئەو کۆمەڵە بەرزو پرپیتەدا، کە پێك هاتبوون لە گەورانی کۆچەری واتە: موهاجرین وە لە یاریدەدەران واتە ئەنسارەکانی مەدینە، وە لە غەیری ئەوانیش لە موسوڵمانانی بەرزی ئەوچەرخەیە، خوتبەیەکی زۆر بەرزی بۆ دان کە ئەو خوتبەیە زۆر بەلیغ و جامیع و بەکەڵك بوو بۆ زۆرێ لە بەندەکانی قەوارەی ئەم دینە پاکەیە لە ناو جەمعێکی ڕاست و باوەڕ پێکراودا، کە هیچ شتێك لە ڕاستییەکان لەوان بزرنابێت و نایشارنەوە، کە بە تێکڕا دەستیان گرت بەو نەسیحەتە جوانانە، وە خوڵاسەو پاڵفتەی ئیسلامیان وەرگرت و دانا، وە بە تەواوی کەڵکیان لە دانانی بنەڕەتی دینا وەرگرت، چۆن وەری ناگرن؟ کە لە حاڵێکدا خوای گەورە هەر لەو حاڵی کۆنگەرەدا لە خاکی میناداا ئەم ئایەتە پیرۆزەی نارده خوارەوە:

﴿اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَ أَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَ رَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِيناً﴾ واتە: ئەمڕۆ بۆ ئێوەم تەواوکرد بەرنامەی دینتان، وە نێعمەتی خۆمم پێداون، وە بۆم تەواوکردون بەوەی کە دینی ئیسلامم هەڵبژاردووە بۆتان، ڕە کردوومە بە یاساو بەرنامەتان، ڕازیم. واتە: شەریعەتم بۆ تەواوکردوون بە حەلاڵ و حەرام، وە بۆم تەواوکردوون دینی ئیسلام بە هیدایەت و تەوفیقدانتان بۆ لای باشترین ڕێگە، وە دینی ئیسلامم لەناو باقی دینەکانیتردا بۆ هەڵبژاردن، کە دینی ئیسلام دینێکە خوای گەورە پێی ڕازییە، وە غەیری دینی ئیسلام دینێکیترتان لێ وەرناگیرێ و قەبوڵ ناکرێ!

جا هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە مزگێنی دا بە تەکمیڵ بوونی دینی ئیسلام و پایە دامەزراوەکانی، ئەوانەی کە ئەحکاماتی ئیسلامی لەوان هەڵ ئەگۆزرێ، بە تێکۆشانی موجتەهیدانی بەرزی ئاگادار بە یاسای دینی پاك و ڕووندا!

وە لە هەمان کاتدا ئەم ئایەتە پیرۆزە هۆشدارێکی ترسناك بوو بە نزیك بوونەوەی کۆچی دوایی حەزرەتی موحەممەد ﷺ چون گەیشتبوو بە ئاخری ئەو وەحی و نگا پرپیتەیە کە بۆی هاتبووە خوار لەلایەن زاتی خواوە، وە بە جیهادو تێکۆشانی شەخسی لەگەڵ یارە بەرزەکانیدا لە ڕێگەی ڕاگەیاندنی پەرتۆکی ئاسمانی، کە قورئان بوو، وە لە ڕێگەی دامەزراندنی یاسای بەرزی، ئەو یاسایەی، کە لە ناو ئەودا هەیە پێداویستەکانی بەنرخ بۆ ئەهلی عینایەت و زانست لە زانایانی دین.

جا ئەو کاتە ئاخرەمین ئایەتی نگای عاسمانی کە قورئانە نازڵ بوو کە لەپاش ئەوە ئایەتی‌تر نەهاتووەتە خوارەوە، وە ئەمەیش دەقی ئەو ئایەتەیە، سوورەتی بەقەرە ئایەتی ژمارە دو سەدو هەشتاو یەك:

﴿وَاتَّقُوا يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَاكَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ واتە: بترسن لە ڕۆژێك کە لەو ڕۆژەدا گشتەکەتان ئەگەڕێنەوە بۆلای زاتی پەروەردگار، کە خوای گەورەیە پاشان هەرئینسانێك لە دونیادا هەرچێکی کردبێ و ئەنجامی دابێ لەو ڕۆژەدا، وەفا ئەکرێ بە جەزاو تۆڵەکەی، وە هیچ کەسێ ستەمی لێ ناکرێ.

وە لەپاش نازڵ بوونی ئەم ئایەتە بەرزەیە بە زەمانێکی کەم پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت، کە ئەم نەخۆشینەی ئاخرین نەخۆشینی بوو، وە لەم نەخۆشینەیدا ڕەفیقی میهرەبانی خۆی حەزرەتی ئەبووبەکری سددیقی ﷺ کردە پێشەواو ئیمام بۆ گەورەو بچووك بۆ بەجێ هێنانی نوێژە فەرزەکان ئەو نوێژە فەرزەی کە بەندەی خوا لەگەڵ خوای خۆیدا ڕازو نیاز ئەکات.

وە ئەم کارەساتەیش بۆ ئەوەبوو تا هیچ گومان و دوودڵییەك نەمێنێت بۆ ئەهلی کەماڵ کە حەزرەتی ئەبووبەکری سددیق ﷺ پێشەوای موسوڵمانانە لەدوای فەوتی پێغەمبەری گەورەی هەموو ئینسانەکان، کەوابوو حەزرەت ئەبوبەکر ﷺ ئەووەڵین جێنشین و خەلیفەی حەزرەتی موحەممەدە ﷺ لە ئەنجامدانی ئەحکاماتی ئیسلامیدا، وە ئەو

ڕاگەیێنەری یاسای دینە لە دوای کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرابەری پێکردنی فەرمان و بەرگری کردن لە یاسای دیندا لە نێوان عام و خاسدا!

ئەوەبوو لە دوای کۆچی حەزرەتی موحەممەد ﷺ بۆ لای زاتی پەروەردگار لاشەی موبارەکی پیرۆزی چەن ڕۆژێك بەخاك نەسپێررا، تا هەمووی زیارەتی بکەن و نوێژی جەنازەی لەسەر بکەن ئەو کاتە جەمعێکی زۆر لە یارە بەرزەکانی تەك تەك و کۆمەڵ کۆمەڵ نوێژیان لەسەر ئەکرد لەبەر ئەدەب و ئیحتیرام، واتە: دوای کۆچی ئەو، یارە بەرزەکانی شەرمیان ئەکرد یەکێ بەئیمامەت لەخزمەت تەرمی موبارەك و پیرۆزیا ئیمام بێت و جەماعەت بکەن، بەرلەوە بەیعەت بکەن بە خەلیفەیەك، تا گەورانی موهاجیر و ئەنسار لە سەقیفەی بەنی ساعیدەدا کۆبوونەوە و بەیعەتیان بە حەزرەتی ئەبووبەکری سدیق کرد ﵁ ئەو ئەبووبەکرەی کە حەزرەت ﷺ لەکاتی نەخۆشینەکەیدا بە جێگەداری خۆی دیاری کرد و داینا بۆ ئەنجامدانی گەورەترین ڕوکنەکانی دینی ئیسلام، وە ئەووەڵ کەسێ کە پەیمانی دا بە حەزرەت ئەبووبەکری سدیق گەورەی ئێمە حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ بوو وەحەزرەتی عومەر ئەووەڵ کەسێ بوو کە خوای گەورە بە هۆی ئەوەوە عیززەت و سەربەرزی بە ئیسلام بەخشی، وە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێی خۆی گرت کە فەرمووی: «اَلْحَقُّ مَعَ عُمَرَ وَعُمَرُ مَعَ

**الحَقِّ»**[1] واتە: هەموو کات حەق لەگەڵ عومەردایە، وە عومەریش لەگەڵ حەققە، وە لەپاش ئەو، یەك لە دوای یەك عەهدو پەیمانیان بەست لەگەڵ حەزرەتی ئەبووبەکری سددیقا وە بەم ڕێکەوتنە گرنگە گۆشەو کەناری ئیسلام لەناو خەڵکدا نوورانی بوو، پاش ئەوە حەزرەتی ئەبوبەکری سددیق ﷺ خوتبەیەکی بەلیغی بەرز، کە بەرابەر بوو بۆ یاسای دین بۆ خەڵك خوێندەوە جا لە دوای ئەوە کووبوونەوە لە سەر دفن کردنی لاشەی پیرۆزی حەزرەتی موحەممەد ﷺ نوێنەری خوای گەورە لە هۆدەی دایکی موسوڵمانانندا حەزرەتی خاتو عائیشە ﷺ وە ئەمەیش لەسەر فەرموودەی خودی حەزرەت ﷺ بوو کە فەرموویەتی: **«اَلْأَنْبِيَاءُ يُدْفَنُونَ حَيْثُ مَاتُوا»**[2] واتە: پێغەمبەران دەفن ئەکرێن لە هەر جێگایەکدا فەوتیان کرد، ئاشکرایە کە حەزرەتیش لە هۆدەی خاتو عائیشەدا فەوتی‌کردبوو.

**پلەی پێنجەم**، کە بۆ ئەوان زۆربەرز بوو (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەوە بوو کاتێ کە جێ‌نشین جێی خۆی گرت و دەفنی حەزرەت تەواو بوو، وە هیچ خیلافێك ڕووی نەدا و حەزرەتی ئەبووبەکر ﷺ لەسەر تەختی خەلافەت جێگیر بوو، وە دامەزرا، مارە سیسە پیسەکان لەم لاو لەولاوە

---

١. لم أجده بهذه العبارة.

٢.سنن ابي داود (٣/١). و فتح الباري لابن حجر (١٥٥/٢) .

سـەریان دەرهـێنا و نـیشانەی هـەڵگەڕانـەوە لە دیـن لە نـێو بـڕیك لە عـارەبەکاندا لە بـڕێك جێدا دەرکـەوت، وە بـڕێك لە واجـباتی ئیسلامیان مەنع کرد.

وە هـەروا مـوسەیلەمەی کـەززاب و درۆزن کـە داوای نـوێنەرایـەتی ئەکردو ئەیوت: من لە دوای پێغەمبەر ڕەئیسم، دەرکەوت. وە هەروا چەن شتێکی تریش پەیدابون، ئەوەبوو حەزرەتی ئەبوبەکری سددیق ﵁ قۆڵی جیهادو تێکـۆشانی هـەڵماڵی لەشکری ئـوسامە، کە حـەزرەت لەکـاتی خۆیدا ئامادەی کردبـوو بۆ جیهاد، بەڕێ کردو ناردی بۆ ئـەو جێگایە کـە دیـاری کرابوو، فەورەن ئەو قـەبیلەو تاقمەی کە هـەڵ گـەڕابـوونەوە داگـیرکردن وە مـوسەیلەمـەو دارو دەسـەی کـافری تـواندنەوەو لە بـەینی بردن.

وە لەم جـیهادو شـەڕانـەدا زۆری لە حـافیزانـی قـورئانی پـیرۆز، بـە دەرەجـەی شـەهادەت گـەیشتن، ئا لەوکاتەدا ئەو دوو پیاوە گـەورە، واتە: حـەزرەتی ئـەبوبەکرو حـەزرەتی عـومەری فـارووق ﵄ ڕایـان هـاتە سەرئەوە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کۆ بکەنـەوە، چون مەترسییان بوو بە شەهید بوونی پەرچەمدارانی قورئان برێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەبـەین بـچن، ئـەو کـاتە هـاتن هـەموویان کـۆ کـردنەوە، وە بـە نـووسینی نـوسەری ئـەووەڵ زەیـدی کـوڕی سـابت ﵁ کە ئـەم شـەخسە لە زەمـانی «رسول الله»دا ﷺ نوسـەری وەحـی و نگا بوو، نووسیانەوە لە بـەرگێکی

پاك و موبارەكدا، وە لە ماڵی حەزرەتی ئەبووبەكردا خەلیفەی ئیسلام نگاداری لێوەكرا، تا گەیشتە زەمان و خەلافەتی حەزرەتی عومەری فاروق ﷺ وە لە دوای كۆچی حەزرەتی عومەر ﷺ لای دایكی موسوڵمانان حەزرەتی حەفسە ﷺ ماوە و نگاداری لێوەكرا، تا عەهدی خەلافەتی حەزرەتی عوسمان ﷺ وە حەزرەتی ئەبووبەكری سددیق لەكاتی خەلافەتی خۆیدا لە نەخۆشینەكەیدا، خەلافەت‌نامەی بۆ حەزرەتی عومەری فاروق نووسی، وە بە جوانی مەسئوولییەتی خەلافەتی قەبوڵ كردو ئەنجامیدا، وە خوای گەورە بە هۆی ئەوەوە ئەسڵی ئیسلامییەتی بەرزەوە كردو كارەكانی مورەتتەب كرد، وە بە كردەوەكانیشی دلانی باز كردو ڕازی كردن، وە بەو شێرە پیاوانەی كە هەموویان لە لانی حەقێقەتدا خۆیان ئامادە كردبوو جیهادی كرد!

ئەو كۆمەڵە ئەسحابانەی كە ئەسحابی شمشیرو فەنن و باوەڕ بوون، ئەوەبوو لە عەهدی ئەو بەڕێزەدا جەزیرەتو لعەرەب و دەورو بەری، لە دوای ئەوان عراق و دەورو بەری لە دەستی ستەمگەران و مل‌هوڕان ئازاد كران و ڕزگار بوون، وە هەروا لە وڵاتی عەجەم وڵاتێكی زۆرو بەرفراوانی فەتح كردو ڕزگاری كردن وەكوو ئەهواز، ماسەبزان، كوردستان و ئێران. پاشان ڕووی كردە خۆرنشین وڵاتی میسریشی فەتح كردو ئازادی كرد، وە لە تەواوی ئەم فتووحاتانەدا خۆی و شوێنكەوتوانی لەسەر كامڵترین وەزعییەتێك بۆ چەسپاندن و دامەزران و بەرابەری پێكردنی ئەحكاماتی

ئیسلام بوون، تا ئەوکاتەی کە قەزاو قەدەری خوایی ویستی بوو کە فەوت بکات ئەوە بوو بەشمشێری زەهراوی دڵێکی پڕ لە کینەو زەهری مەجووسییەت، کە نەزان و کوێردڵ بوو، بە ناو ئەبولوئلوئی موتەجاویزو دوشمن، شەهادەتی بە نەسیب بوو، ئەوەبوو حەزرەتی عومەری فارووق ﷺ بەر لەوەی فەوت بکات فەرمانی دا بۆ جێگەنشین و خەلیفەی ئیسلام. کە بە مەشوەرەت لە نێوان شەش کەس لە ئەسحابی کیرام ئەسحابەکانی ڕەسولەڵلا کە لە نێوان ئەو شەش کەسەشدا، دوانیان حەزرەتی عوسمان و حەزرەتی عەلی بوون یەکێکیان هەڵبژێرن و بیکەن بە خەلیفەی ئیسلام ئەوەبوو کۆمەڵی ئەسحاب بۆ بەڕێوە بردنی کارو باری ئیسلام، بە باوەڕو قەسدێکی خاوێن، بە بێ هیچ نیگەرانیەك حەزرەتی عوسمانیان هەڵبژارد «جزاهُم اللهُ خیراً»

وە لە ڕاستیا حەزرتی عوسمان ﷺ بەو جۆرە بوو کە پێی ئومیدەوار بوون، وە بە جێیهێنا ئەوەی کە مەرام و مەقسەدیان بوو، وە حەرەکەتێکی گەورەی ئەنجام دا، وە ئەو فتوحاتەی کە لە زەمانی حەزرەت عومەردا ﷺ قەراربوو ئەنجام بدرێن تەواوی کردن و ئەنجامیدان، وە زیاد لەوەیشە کارێکی گەورەو گرنگی بەو کارانە زیاد کرد.

ئەوەبوو قورئانی پیرۆزی جارێکیتر کۆکردەوە بۆ ئەوەی کۆمەڵی موسوڵمانان لە خوێندنەوەی قورئاندا لەسەر شێوازی زاراوەی قورەیش ئەو لەهجەو زاراوەی کە قورئان لەسەر ئەوە نازڵ بووبوو قورئان

بخوێنن، وە ئەم هەڵوێستەیش بە کۆکردنـەوەی لیجنەیەك بوو لە زانایانی ئـەسحاب، وە لەنـاو ئـەو لێـجنە زانـایانەدا لە گـەورەکانیان حـەزرەتی عـەلی ﷺ بـەشداربـوو، ئـەم کـارەیش ئـەو پـەڕی ئـارەزوی ئـیسلام و مـوسوڵمانان بـوو، وە ئـەرزشی ئـەم کـارەیش بـەس خـوای گـەورەو زانـا بـەسەر هـەموو شـتێکدا ئـەیزانـێ، ئـەوەبوو حـەزرەتی عـوسمان ﷺ پێشەوای موسوڵمانان فەرمانی دەرکرد بە نووسینەوەی شەش بەرگ و نوسخە لە قورئانی پیرۆز، کە ئەم شەش نوسخەیەی، دابەش‌کرد بەسەر وڵاتانی ئیسلامیدا نوسخەیەك بۆ شام، نوسخەیەك بۆ میسر، نوسخەیەك بۆ مەککەی پیرۆز. وە نوسخەیەکیتر بۆ بەحرین و یەکیتر بۆ کووفەی عیراق و نوسخەی ئاخریان لەپایتەختی ئیسلام کە مەدینەی مونەووەرە بوو ماویەوە.

کە ئەم نوسخەیە مەشهوور بوو، وە ناو نرابوو بە نوسخەو مەسحەفی ئیمام، واتە مەسحەفی عوسمانی ئەوەبوو ویست و ئیرادەی خوای گەورە بـەسرابـوو بـەوەوە کـە فـیتنەیەك و ئـاژاوەیـەك پـەیدا بـبێت بـەهۆی ئاژاوەگیڕەکان، وە لە کۆتاییدا بکێشێ بە شەهادەتی حەزرەتی عوسمان ﷺ. ئەوەبوو شەهیدکرا و لە دوای ئەوە ئەسحاب بە عەجەلە عەهدو پەیمانیان بە حەزرەت عەلی ﷺ دا، وە بەیعەتیان پێ‌کرد، کە ئەم زاتە خەلیفەی چوارەمی موسوڵمانان و خاوەنی زانستێکی یەگجار گەورە بوو.

بەڵام هەزار حەیف فەزاو جەووی دین لە دوای شەهادەتی حەزرەت عوسمان لەو سەردەمەدا بە جوانی پاك نەبوو، تاریکی ستەمی ئاژاوە کە دەوامی پەیداکرد لە کاتێکدا کە نزیکانی حەزرەتی عوسمان ﵁ داخوازی دەس کۆتایی تاوانبارانیان کرد ئەوانەی کە ڕاستەوخۆ لە شەهادەتی حەزرەتی عوسماندا دەسیان هەبوو، ئەوەبوو ئاوری ئەم ئاژاوەیە بلێسەی سەند و شەڕ لەنێوان حەزرەتی ئیمام عەلی ﵁ و حەزرەتی مەعاویەدا ﵁ پەرەی سەند و دەوامی پەیداکرد، تا لە کۆتاییدا کێشای بۆ فەوتانی زۆرێك لە خەڵکی موسوڵمان لەو سەردەمەدا، پاشان کۆمەڵێك لەخەڵك حەملەیان بۆ بردەن، وە وا قەراریان دابوو کە هەر دوو سەرکردە، واتە: حەزرەتی عەلی و حەزرەتی مەعاویە ﵄ بکوژن، وە برێك شەیاتینو لئینس، کە لەو سەردەمەدا مابوون ناردنیان تابیان کوژن. ئەوەبوو هەردوو سەرکردە بریندارکران، وە لە ئەنجامدا حەزرەتی عەلی ﵁ شەهیدبوو ـ ڕۆحی شاد ـ بەڵام برینەکەی حەزرەتی مەعاویە ﵁ تەداوی کرا و خۆشەوە بوو، وە لەمردنی بەو برینە ڕزگار بوو، حەزرەتی مەعاویە ﵁ لەشێعرێکدا ئەفەرمێ:

نَجَوْتُ و قد بَلَّ الْمُرادِيُّ سَيْفَهُ    مِنِ ابْنِ أَبي شَيْخِ الْأَبَاطِحِ طَالِبِ

واتە: من نەجاتم بوو بەڵام ئیبنو مولجەمی موورادی بەشمشێرەکەی گەیشتە کوڕی گەورەی ئەبتەحییەکان کە ئەبوتالیبە.

وە لەم کاتەدا خەڵك بە عەجەلە، بەیعەتیان کرد بە حەزرەتی ئیمام حەسەن کوڕی حەزرەتی ئیمام عەلی ﷺ وە ماوەی شەش مانگ لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت، وە بەم شەش مانگە ماوەی خەلافەت، کە حەزرەت فەرمووبووی: دوای من خەلافەت سی ساڵە، تەواو بوو، وە ماوەکەی کۆتای پێ هات.

وە لە کاتێدا کە ئیمام حەسەن ﷺ ویستی وابوو وە وایشی بە مەسڵەحەت زانی بۆ گەلی موسوڵمانان، کە یەکگرتوو و پێکەوە بن، وە ئەوەی کەحەزرەت ﷺ فەرمووبووی لە بارەی ئیمام حەسەنەوە هێنایەجێ، وە ئەمەیش دەقی فەرموودەکەیە: «بەڕاستی کوڕی من کە ئەم سەییدەیە خوای گەورە ئەیکا بە هۆی ئاشتی لەنێوان دوو کۆمەڵی گەورە لەموسوڵمانان، ئەوەبوو لەگەڵ حەزرەتی مەعاویەدا ڕێك کەوتن، کە ئەرکی خەلافەت بدەنە دەستی کە سێکیتر، وە لە حەققی خۆی هاتە خوارەوە و مەسئولییەت نەقڵ بوو، بۆ لای حەزرەتی مەعاویە ﷺ وە کار بۆ حەزرەتی مەعاویە، یەك لابووە، وە ئەو قسانەی کە برێك لە ئینسانەکان کە بەدەم هەڵبەست ئەیلێن هیچ کات ئاوڕیان بۆ نادرێتەوە و جێگای ئیعتیبار نین. وە لە عەقیدەو باوەڕی ئیسلامیدا سابت بووە و لەسەر ئەوە دامەزراوە کە ئەوەی سەحابەو هاوڵی حەزرەت بووە ﷺ ناوی بەچاکە ببرێت و بەخراب باسی نکرێت، چونکە ئەوان چاکترین ئوممەتی گەلی ئیسلامن، وە چاکەو خێری زۆری خەڵکان ناگاتە خێری

کەمی ئەوان، وە هەرهەموەکەیان کردەوەی چاك و بەرزو جوانیان لە پێناوی ئیسلام و دیندا ئەنجام داوە و سابت بووە!

پلەی بەرزی شەشەمیان بریتییە لەوەی کە لەسەر جیهادو گەیاندنی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەندەکانی خوا پایەدار بوون تا بەرنامەی دینیان تەحویڵی گەلی قەرنی دووهەم داوە، وە ئەم کارەیشە بۆ گەورەیی و شەرافەتی ئەوان لای خوای گەورە بەسە، وە ئەم شەش پلە بەرزانە کە ئەوان بوویان ئەسبابی بنەڕەتی بوون بۆ ئەوان کە خوای گەورە دەرحەقیان بفەرمێ: ﴿**كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ**﴾ واتە: ئێوە لە ناو ئینسانەکاندا چاکترین گەل و نەتەوەن لەم سەر عەرزەدا.

وە هەروا چەن ئایەتی‌تریش لە بارەی فەزڵ و گەورەیی ئەوانەوە هەیە، کە تێکڕا نیشان ئەدەن ئەو ئەسحابانە ئەهلی نەجات و بەختەوەری بوون، وە هەروا حەدیسی بەرزی پێغەمبەریش ﷺ ڕێزو گەورەیی ئەوان سابت ئەکات، بۆ نموونە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیانەوە ئەفەرمێ: «**أَصْحَابِي كَالنُّجُومِ بِأَيِّهِمْ اقْتَدَيْتُمْ اهْتَدَيْتُمْ**» واتە: یارەکانی من وەکوو ئەستێرەکانی عاسمان وانە، چۆن ئەستێرەکان وەسیلەی شارەزایی ئینسانەکانن بۆ ئەنجامدانی کاروباریان لە سەرعەرزەدا، ئەسحابەکانی منیش هۆی شارەزایی خەڵکن، شوێن هەرکامیان بکەون ڕێگەی هیدایەتتان پێ نیشان ئەدەن.

وەهەروا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **«لَوْ أَنْفَقَ أَحَدُكُمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً مٰابَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاٰ نِصْفَهُ»** واتە: ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود تەڵا خەرج بکات لە ڕێگەی خوادا ناگات و بەرابەر نییە بۆ مستێك یا نیوە مستێك لە خێری ئەسحاب، کە لە ڕێگەی خوادا خەرجیان کردبێ، کەوابوو ئەگەر ئەسحابەیەکی ڕەسولی خوا پڕ بە مستێك یا نیوە مستێکی بەخشینی بوویێت لە ڕێگەی خوادا، وە ئینسانێکی غەیرە سەحابیش بە ئەندازەی کێوی ئوحودی تەڵای لەڕێگەی خوادا بەخشیبێ هێشتا بەرابەر نین و هاوسان نین.

کورتەی و تارو کەلام ئەوەیە، مەحەببەتی ئەسحابی کیرام رضي الله عنهم بەشێکە لە خوللەسی باوەڕی ئینسانی موسوڵمان، وە بەشێکە لە گەورەترین شێعاری ئیسلام، ئەمە لە کاتێکدایە کە هێشتا ئەهلی غروورو بیدعەو خەیاڵاتی پووچەڵ پەیدا نەبووبون، واتە: بەر لە پەیدابوونی ئەمانە وابوو، وە هەرکەسێکی دامەزراویش لابدات ئەوە لە کتێب و سوننەتی بەرزی پێغەمبەر لای داوە.

چون ئەسحابی کیرام رضي الله عنهم هەرهەمووەکەی ئەو کۆمەڵ و جەمعەبوون کە درخت و نەهاڵی ئیسلامییەتیان بە چاکی لە ئەرزو مەزرای ئیسلامیدا ناشت، وە لەسەر تێکۆشانی پەسەن کراوی ئەوان بوو قەوارەی بنەڕەتی خانووی دەوڵەتی ئیسلامی دامەزرا لەزەمانی عەهدی ڕیسالەتەوە تا ئەم چوارده قەرنەی دوای خۆیان، وە سوپاس بۆ خوا تا

ئاخر زەمان و لەمەو دوایش ئەمێنێتەوە، وەهەروا ئەسحابی کیرام ﷺ ئەو کۆمەڵ و جەمعە بوون کە گەلی بەشەرییەتیان لە نێو تاریکی و نەزانی و نەفامیدا، وە لەناو کوفرو ستەم و فیسق و تاواندا، ڕزگارکرد و دەریان هێنا و خستیانە سەر ڕێگەی هیدایەت و نووری زانست و باوەڕو خواپەرەستی، ئەو خوایەی کە پەروەرش دەهەندەی هەموو عالەمیانە، کەوابوو واجبە لەسەرمان کە مەحەببەتی ئەوانمان ببێت، وە شوکرانەیان بکەین بۆ ئەوە هەموو چاکەیە کە کردیان لەگەڵ موسوڵمانانندا، خوای گەورە لەوان ڕازی بێت، وە ئەوان ڕازی بکات، وە هەروا ڕازی بێت لە کەسانێکیش کە شوێن کەوتووی ئەوانن بەچاکە تا ڕۆژی قیامەت. ئامین!

## «خۆشویستنی پێشەوایان و تێکۆشەرانی بەرزی ئایین»

هەروا خۆشویستنی پێشەوایان تێکۆشەرانی زانست و دین لازم و ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە، وە شاراوەو پۆشیدە نییە لەسەر هیچ کەسێك و ئاوەزدارێك، کە قورئان و حەدیس هەردوکیان ئەساس و بنەڕەتی دینی موبینی ئیسلامن، بەڵکوو ئەساسی یەکەم قورئانی پیرۆزە، چون قورئان ئەو کتێبەیە فەرمان ئەدا، کە فەرمانبەرداری پێغەمبەری خوا بکرێ ﷺ وە پێی سپێرراوە و لە ئەستۆیدایە کە بەیانی قورئانی پیرۆز بکات بۆ گەلی موسوڵمانان

وە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزە لەسوورەتی نەحلدا ئایەتی ژمارە چلوچوار ئەفەرمێ:

﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ واتە: ناردمانە لای تۆ ئەو قورئانەی کە دڵانی بێئاگا ڕائەچڵەکێنێ تا تۆ بەیانی حەڵاڵ و حەرام و ئەحکامات بکەی بۆ خەڵك.

وە ئاشکرایە عەمەڵ بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرﷺ پێویستی بە زانستی ئەو دوو سەرچاوە گرنگە هەیە، کە ئەوەیش موجتەهێدان و تێکۆشەران پێی گەیشتوون و نایل بوون، ئەو موجتەهێدانەی بە تەواومانا ئاگادار بوون بەسەریانا کە ئەو ئاگاداریشە بریتی بوو لە ئاگادار بوون بەسەر لەفزو ئەحوالاّتی لەفز، وەکوو ئیعراب، بینا، ئیشتیقاق، ئیعلال، ئیبدال، حەزف، ئیدغام وە... وە هەم ئاگادار بوون بەسەر مانای ئەو لەفزانەدا کە حەقیقەت و مەجازو مانای مەنقوول و موشتەرك و موختەسس و موجمەل و موبەیین، وە هەروەها مانای ناسخ و مەنسووخ و عام و خاس و موتڵەق و موقەییەد، وە... وە هەم ئاگادار بوون بەسەر شێوازەکانی دەلاڵەتی لەفزدا، وەکوو «دلالةالنّص»، «دلالةالإشارە» و «دلالة الایماء»، و «اقتضاءالنّص»دا وە... وەهەروا شارەزا بوون بەسەر ئەو شتانەدا کە ئایەتیان لە بارەوە نازڵ بووە، وە هەروەها ئەو شتانەی، کە هۆی نازڵ بوونی ئایەتەکانی قورئان بوون.

وە هەم ئاگاداربون بەسەر جێگاکانی ئیجماع و ئیتیفاقی ئیجماعدا، وە بەسەر ئیختیلاف و ڕێگاکانی بەگژ یەکداچوونی بەڵگەکاندا، وە ئاگاداری بەسەر ئەوشتە بنەڕەتیانەدا پەیدا نابێت مەگەر بە زانینی ئەو شتانە نەبێ کە باسمان کردن، وە پلەی ئەم زانستەیشە بەگشتی بۆ کەس دەس نادات مەگەر بۆ پێشەوایانی تێکۆشیەر، کە ئاگادار بوون بەسەر تەواوی ئەو شتانەدا کە باسمان لێوەکردن بەتایبەت ئاگادار بوون بەسەر

هۆکانی زاڵکردن و تەرجیح دانی مەسائیلدا، ئەوەیش بەدەس دێت لە قووەت و زەعیفی بەڵگەکان و سەنەدەکان، وە لە دروستی جوانی و زەعیفی و لاوازی پلەی بەڵگەکان، وە ئەو کۆمەڵە ئینسانانەیش کە ئاگادار بوون ئەوانە شیاو پیاوی سەلاحییەت و زانیاری ناوەندی بوون، وە تەنها ئەوان ئاگاداری فیقهی دینی بوون، کە لە سوورەتی تەوبەدا لەئایەتی ژمارە سەدو بیست و دوو ئەفەرمێ:

﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ﴾ واتە: ئەوە بۆ ناچن کۆمەڵێك لە هەموو گرووپ و فیرقەیەك لەوان تا فێری زانیاری فیقهی دین ببن، واتە: بابچن فێری فیقهی دینی ببن. وە هەم لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ فەرموویەتی:

«مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَيُلْهِمْهُ رُشْدَهُ»[١] ئەو زانا بەرزانە مەقسوود و مەنزورن واتە: هەرکەسێ خوای گەورە بیەوێ و ویست و ئیرادەی خێری پێ بکات شارەزای ئەکات لە دینا، وە ئاوەزو سەلاحییەتی پێ فێرئەکات و ئەیخاتە دڵیەوە.

جا هەر بەم بۆنەوە خوای گەورە لە نێوان ئینسانەکاندا پلەی نەزانی و زانینی قەرارداوە و دیاری کردووە کە لە سوورەتی نەحلا ئایەتی ژمارە چل و سێدا ئەفەرمێ:

١. صحيح بخاری (١٩٩/١). و مسلم (٢٣٦/٥).

﴿فَاسْئَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَاتَعْلَمُونَ﴾ واتە: پرسیار بکەن ئێوە لە ئەهلی زانست ئەگەر ئێوە نازانن و شارەزا نین.

وەهەروا خوای گەورە لە سوورەتی یووسفدا لە ئایەتی ژمارە حەفتاوشەش پلەی بەرزی بۆ زانایان دیاری کردووە و فەرموویەتی:

﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ واتە: لە ژوورەوەی هەموو زانایەك خاوەن زانستێکی‌تر هەیە کە لەو زانستی زیاترە.

وە هەروا پێغەمبەری خواﷺ پلەو ڕێزی بۆ زانایان دیاری کردووە فەرموویەتی:

«إِذا حَكَمَ الْحاكِمُ وَاجْتَهَدَ وَ أَصابَ فَلَهُ أَجْرانِ، وَ إِذا اِجْتَهَدَ وَ أَخْطأَ فَلَهُ أَجْرٌ وَاحِدٌ»[1] واتە: ئەگەر کەسێ لە حوکم فەرمایانی دین حوکمی کردو تێکۆشانی بوو، وە شتەکەی دەرك کرد ئەوە پاداش و جەزای دووچەندانی هەیە لای خوای گەورە، وە ئەگەر حوکمی کردو تێکۆشانی بوو، وە شتەکەی دەرك نەکردو بە هەڵەدا چوو ئەوە لای خوا یەك پاداشی بۆ دیاری ئەکرێ لەبەر تێکۆشانەکەی، جا لەم فەرموودەیەدا نوێنەری خواﷺ بۆ ئەو موجتەهیدەی کە دەرکی حەق ئەکات لە تێکۆشانەکەیا، دوو پلە دیاری ئەکات، یەکێ بۆ زەحمەت کێشانەکەی، دووهەم بۆ ئەوەی دەرکی حەقی کردووە لە تێکۆشانەکەیا، بەڵام بۆ ئەو

١. الالمام بأحاديث الأحكام قشيري (١/٣٥٠).

موجتەهیدەی کە لە تێکۆشانەکەیا دەرکی حەق ناکات و بە هەڵەدا چووە یەك پاداش دیاری ئەکات ئەوەیش لەبەر تێکۆشانەکەیەتی.

جا ئەگەر کەسێ پرسیاربکات بڵێت: ئەوە بۆ چینی ئەووەڵ، کە سەحابەی کیرام بوون نیازیان بەشوێنکەوتنی ئەم شتانە نەبووە؟ لە وڵامدا ئەڵێین ئەو سەحابە بەرزانە لە ژێر سایەی چەتری پڕبەرەکەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ژیاون کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئاگادار و زانا بەحەقیقەت و کاکڵەی قورئان بووە، وە لەسەری بووە ئەوەی کە نیازو پێویستە باسی بکات و بەیانی کات و سوودو کەڵکیان پێ ڕاگەیەنێ.

وەکوو سوودو کەڵکی باوك و دایك بۆ منداڵە چکۆلەکانیان بەبێ ئەوەی ئەو منداڵانە نیازیان بە ناسینی هیچ نەوعە پیشەیەك و هۆیەك ببێت، کەواتە لای ئەوان ئەو نەوعە عورف و ئیستیلاحاتانە نەبوون، وە نیازیان بە ناسینی ڕێگاکانی دەلاڵەتەکان نەبووە، کە فلان شت دەلاڵەتی چۆنە یا چۆن نییە (ئەو دەلاڵەتانەی کە لە پێشەوە باسمانان کردن) بەڵام چینی دوایی کە چینی تابعینە، واتەشوێنکەوتوانی ئەسحاب، ئەوان دوورکەوتبونەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناچار خۆیان مەشغووڵ کرد بە سەعی و تەلاش و تێکۆشان بۆ بەرڕەسی کردنی و شەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەت لەسەر تیشکی مانای لۆغەتی عەرەب، وە ئەهلی عورفی عام و خاس و جێگاکانی بەکارگرتنی و ئیستیلاحات، کەوابوو بۆیان

جۆرنەبوو کە بە نەتیجە بگەن بەبێ ئەو شتانەی کە باس کران. جا پاش ئەوە ئەستێرەکان پێشەوایانی موجتەهید لە گۆشەو کەناری عاسمانی زەمانی تابعیندا دەرکەوتن و پەیدابوون، خوا لە هەموویان ڕازی بێت ئامین.

یەکەم شەخسییەتی ناودار ئیمام و پێشەوای موسوڵمانان بەناو ئیمام ئەبووحەنیفەی کوڕی نوعمانی کوڕی سابتی کوفی ﷺ بوو کە بە خزمەت هەژدە نەفەر لە سەحابەی پێغەمبەری خوا گەیشتووە و چاوی پێکەوتوون، وە لە شەش کەسیان حەدیسی پێغەمبەری خوای وەرگرتووە، وە هاوکات لە عەسری ئەبوحەنیفەدا زۆرێك لە موجتەهیدان لە هەموو قەبیلەکان پەیدا بوون، وە دوای ماوەیەکی کەم ئیمامی بەرزو پێشەوای موسوڵمانانی «دارالهجرە» واتە: مەدینەی مونەووەرەی پیرۆز مالکی کوڕی ئەنەسی یەمانی ﷺ پەیدابووە.

وە لە پاش ماوەیەکی‌تر ئیمام و پێشەوای گەورەی ئیسلام موحەممەدی کوڕی ئیدریسی موتەللیبی مەشهوور بە شافعی ﷺ پەیدا بووە، کە ئەم شەخسە پاڵدراوەتە لای باوەگەورەی کە شافعی ناو بووە.

وە لە پاش ئەویش ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی شەیبانی ﷺ پەیدا بووە، وە هەروا زۆریتریش غەیری ئەو چوار شەخسییەتە گەورانە لە پێشەوایانی بەرز پەیدابوون، وەکوو سەفیانی سەوری و سەفیانی کوڕی عویینە ﷺ وەغەیری ئەمانەیش ئەشخاسی‌تریش بوون، وە هەر وا

ئیمامان و پێشەوایانیتر کە لە زانستی قورئان و سوننەتدا و لە ناسینی مەواردی هاتنە خوارەوەی قورئان و لە ناسینی جێگاکانی یەك گرتن‌و جێگا خیلافەکاندا و لە ڕای ئەسحابی کیرامدا تێرو پڕ بوون، ئەوەبوو خوای گەورە بڕێك لەوانی موەففەق و سەرکەوتوو کرد بۆ تەدوین و ئاراى خۆی لە ڕێگەی ئیستینبات و هەڵگۆزینی ئەحکام لە قورئان و لە سوننەتدا کە ئەوانیشە بریتی بوون لەو چوار پێشەوا ناودارانە کە مەعرووف و ناسراون، یەکەم: ئیمام ئەبوحەنیفە. دووهەم: ئیمام مالك. سێهەم: ئیمام شافعی. چوارەم: ئیمام ئەحمەد، ڕەحمەتی خوالەسەر هەمویان بێت، ئامین. وە بڕێکیش لەوانە مەزهەبەکەی تەدوین و جەماوەری نەکرا، مەگەر ئەو بەشەی نەبێت کە گەیشتە دەستی خەڵکان، وە بۆ خەڵك دەرکەوت، کە ڕێگەی هەڵگۆزینی ئیمامەکان ئەوانەی کە مەزهەبەکەیان تەدوین کراوە چۆن بووە، وە بە ئاگاداری بەسەر ئەوا دڵی خەڵکان بازبوو و کراوە و عیلمیان پەیداکرد بەسەریا.

مەسەلەن بۆ نموونە ئەوە ئیمامی شافعیە ﷺ دەستێکی باڵای بووە بە سەر تەدوینی مەزهەبەکەیدا، مەسەلەن کتێبی «الرّسالە»ی لە ئوسوڵی فیقهدا داناوە، وە بەسەر ئەم ئەرزەدا بەزۆرێ لە زمانەکانی دونیا تەرجەمە کراوە.

هەربەم بۆنەوە کردەی زۆربەی کۆمەڵی ئیسلامی لە گۆشەو کەناری دونیادا لەسەر عەمەڵ کردن بە مەزهەبی ئەوان دامەزراوە و سابت بووە،

وە کەس لە عەمەڵکردن بە مەزهەبی ئەوان خاریج نەبووە، مەگەر کەسێك گەیشتبێتە پلەی بەرزی ئیجتیهاد لە پێشینان وەکوو سەفیانی سەوری و سەفیانی کوڕی عویینەﷺ وە... وە لەسەر ئەساسی ئەوەی کە باسمان کرد لە بەیان و تەوزیح دان، واجبەو پێویستە لەسەر هەموو کەسێك کە پلەی زانیاری نەگەیشتبیتە پلەی ئەو موجتەهیدانە، شوێنکەوتووی یەکێ لەو چوار ئیمامە ببێت لە ئەحکامدا تا لەسەر چاورۆشنی بڕوا، وە گەرنە عەمەڵ و کردەوە بەهەر شەریعەتێك یاحەدیسێکی پیرۆز، بەبی ناسینی باقی ئایەت و فەرموودەکانیتر و بەبێ چاورۆشنی لە بواری بەگژ یەکدا چوونی بەڵگەکان و تەرجێح دانی بەڵگەکان، ئەوە کردەوەیەکە کە دوورە لەهەر ئینسانێکی سەعادەتمەند.

جابزانین هەروەکوو مەحەببەت و ڕێزو خۆشویستن بۆ موجتەهیدەکان لازم و پێویستە، مەحەببەتی باقی زانایانی ئایینی ئەوانەی، کە بنەڕەت و دانانی زانستەکانیان بەدەس بووە، وە بە ئەرکی سەرشانی خۆیانیان زانیوە لازمەو زەروورە، ئەو زانستەعارەبیانەی کە لەسەر خولانەوەی تەگەری ئەوان قورئان و سوننەت ئەناسرێن، وەکوو عیلمی نەحو، سەرف، لۆغەت، بەلاغە. فقهـ ، ئوسوولی فیقهـ ، ئوسوولی دین، وە...!

ئەم هەیئەتە، هەیئەتێکە کە مەسئوولییەتی ڕاگەیاندنی ئیسلامیان وە ئەستۆ گرتووە، وە لەسەر ئەو ڕاگەیاندنە دینی ئیسلام ڕاوەستاوە، وە لە

هەر عەسرو کاتێکدا ئەگەر کۆڕێك و هەیئەتێك لەسەر حوکمێك کۆبوونەوە، واجبە پەیڕەوییان لێ‌بکرێ، لەبەر فەموودەی زاتی خوای گەورە لەسوورەتی نیسادا ئایەتی ژمارە سەدو پازدە فەرموویەتی:

﴿وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَاتَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَاتَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيراً﴾ واتە: هەر کەسێ بە پێچەوانەی فەرمان و دەستووری نوێنەری خوای گەورە بجولێتەوە لەو شتانەیدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی پاش ئەوەی کە حەققی بۆ دەرکەوت، وە ڕێگەیەك بپێوێ کە جیاوازە لە ڕێگەی موسوڵمانان و ئیمانداران، واتە بەڕێگەیکدا بڕوا کە پێچەوانەی ڕێگەی موسوڵمانان بێت، ئێمە ئازادی ئەکەین لەسەر ئیختیاری خۆی هەرشتێکی نابار هەڵ ئەبژێرێ با هەڵبژێرێ، وە لە ئاخردا داخڵی جەهەننەمیشی ئەکەین، کە خرابترین ماواو مەسکەنە بۆی.

کەوابوو پێویستە خۆتان پارێزن لە نەزانی و نەزانکاری، وە لەسەر ئێوەیە فێربوونی زانست، چون پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

«مَرْحَباً بِطَالِبِ الْعِلْمِ إِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا لِطَالِبِ الْعِلْمِ»[1] واتە: خۆشبەختی بۆ کەسێکە کە بەشوێن زانستا ئەگەڕێ، بەڕاستی فریشتەکانی پەروەردگار باڵی میهرەبانی و نەوازش و بەزەیی ڕائەخەن بۆ

---

١.سنن بيهقي (٢٧٦/١).

کەسانێك کە بەشوێنی زانستا ئەگەڕێن وە داخوازی زانست ئەکەن!

وە لەسەر ئێوەیە کۆمەڵی موسوڵمانان کە شێوەی دەرس خوێندن و داخوازی زانستان، وەکوو زەمانی زوو، دووبارە بکەنەوە، واتە: لەسەر شێوازی قەدیم عیلمەکان فێربین و بیانخوێنن، مەسەلەن بەر لە هەموو شتێ دەس بەخوێندنی سەرف و نەحو بکەن و ڕێزمانی عەرەب و عیلمی بەلاغەت و فیقه و ئوسوول وە... فێربین، چون کەسێك لە ڕێگەی ئوسوولەوە بڕوا ئەوە ڕێگەی گەیشتن بە مەتڵەبی بڕیوە!

# مەحەببەتی پیاوچاکان و ساڵحان

خوای پاك و میهرەبان بەیانی کردووە کە بەڕاستی ساڵحین لە جوملەو ڕەدیفی ئەو کەسانەن کە خوای گەورە نیعمەتی بەسەردا ڕژاندوون لە دونیا و ئاخیرەتدا، خوای گەورە لە سوورەتی نیساء ئایەتی ژمارە شەست و نۆو حەفتادا، ئەفەرمی:

﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَ الصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقاً﴾ واتە: هەرکەسێ فەرمانی خواو نوێنەری خوا ببا بەڕێوە ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا وان لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خو انیعمەتی خۆی بەسەر ئەواندا ڕژاندووە، وە پلەی هەرە بەرزی پێداون، وەکوو جەماعەتی نوێنەران، ڕاست وێژان، شەهیدان، پیاوچاکان، ساڵحان، وەئەم تاقمە ئینسانانەیش چاك ڕەفێق و هاوەڵێکن.

وە ئەمەیشە فەزڵ و گەورەییەکە کە لەلایەنی خوای گەورەوە پێیان بەخشراوە و عەتاکراوە، وەخوای گەورە خۆی ئاگایەو زانایە، وە تەنها خۆی بەسە و کافیە کە بەسەر هەموو شتێکدا عیلمی هەیەو خەبەردارە

وگومانیش لەوەدا نییە هەر لەو ڕاستانەن، وە لـە ڕیزی ئەوان ئەژمێررێت، ئینسانانێك کە خوا فەرمانی داوە بە کۆمەڵی بەشەرییەت کە لەگەڵیاندا بن لە دونـیادا، وە هـەڵس و کـەوتیان وەك ئـەوان بێت تـاقمی ڕاست وێـژان، خوای گەورە لە سوورەتی تەوبەدا لە ئایەتی ژمارە سەدو نۆزدە ئەفەرمێ:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ واتـــە: ئـــەی ئـــەو کـەسانەی کـە خـاوەن بـڕوان و ئـیمانتان هـێناوە بـە خـواو پـێغەمبەری خـوا ﷺ بـترسن لەخوا و خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کە خـوا مـەنعی کردوون، وە بەجێ بێنن ئەو شتانەی کە خوا فەرمانی پێداون و لەگـەڵ ڕاستان و ڕاستوێژان دا بن.

وە گـومان و شـەك لەوەدا نـییە مـەقسوود بـە بـوون لەگـەڵ ڕاسـتوێژان ئـەوەیە کـە لەگـەڵیان هـەڵس‌وکـەوتـتان بـێت، وە لەگـەڵیاندا دانـیشن و ڕەفێقیان بکەن.

وە لە بـاوەڕو کـردەوەی ئـیسلامیشدا شـوێنیان کـەون، وە حـیکمەت لە مـەیشدا ئـەوەیە کـە دڵی ئـەو ڕاسـتوێژانـە بـە نـووری ئـیمان ڕۆشـنەو داگـیرساوە، وە پـڕ لەتـرسی خـوایـە، وە شـتێکی سـوروشتی و تـەبیعییە هـەرکەسێ لە نـوورو ڕۆشـنایی نـزیکەوە بـێت بـەو نـوورو ڕۆشـناییە، ڕۆشـنایی وەرئـەگرێ، وە ڕێـگە دەرئـەکات و لە دڵـیا شـعوورو ئـاوەزی ڕوشـد ئـەکات و زۆرئـەبێت، چـون نوێنەری خوا ﷺ لە فـەرموودەیەکیا کە ئەبی‌مووسا ڕیوایەتی کردووە و حەدیسەکەیش سەحیحە فەرموویەتی:

**«إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَ جَلِيسُ السُّوءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَ نَافِخِ الْكِيرِ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ وَ إِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحاً طَيِّباً وَ نَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يَحْرِقَ ثِيَابَكَ وَ إِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحاً خَبِيثَةً»** واتە: وێنەی دانیشتن لەگەڵ ڕەفیقی سالح و پیاوچاکدا، وە وێنەی دانیشتن لەگەڵ ڕەفێقی خرابدا، وەکوو دانیشتن و ڕەفیقی دوو کەسێکە کە یەکێکیان میسك و بۆنخۆشی پێبێت و ئەویتریشیان خەریکی دەمانلدنی کورەی ئاسنگەری بێت، ئەویانە کە بۆنخۆشی پێیە یا لێی ئەستێنی بۆنخۆشیت دەس ئەکەوێ، یا لە بۆنەکەی ئیستیفادەو کەڵك ورئەگریت، وە ڕەفیقی و دانیشتن لەگەڵ ئەو کەسەی کە کوورەی ئاسنگەری گەرم ئەکات و ئەیدەمێنێ، یا لیباسەکەت ئەسووتێنێ و پزیسکی لێ ئەکەوێ یا بۆنی ناخۆشی ئاسنە سووتاو ئەچێ بەسەرتا.

کەواتە ڕەفیقی پیاو چاك و پیاو خراب بە وێنەی ئەو دوو شتانەبوون کە باسمان لێوەکردن، وە مەنشەء و ڕیشەی خۆشبەختی ئەو ڕاستوێژانە ئا بەم جۆرەیە، سەحابەی کێرام ﷺ لەگەڵ ئەوەیشدا بە شێوەی گشتی سەداقەت و ڕاستیان بووە برێکیان بە بۆنەی زیادە دانیشتن لە خزمەت ڕەسولەڵلا دا ﷺ جیاوازییەکیان بووە کە ئەوانیتریان نەیانبووە، وە ئیمتیازەکەیشیان بەوە بووە کە بەزۆری تێکۆشیون ئەخلاقیان وەکوو ئەخلاقی ڕۆحی ڕەسوڵەڵلا بێت، لە ڕاستی و لە سەبرو خۆگریدا و لە حوزوورو موراقەبەی زاتی پەروەردگارا و هەروا لە ئیخلاس و عەمەڵداو

پایەداری لە سەر تێفکرین و زیکرو ئومێدو ترس و خەوفدا، وە ئەمانیشە شتهایەکن کە دڵی ئینسان نوورانی و شوعلەوەر ئەکەن و دڵی ئینسان باز ئەکەن، وە لە ڕاستیا کۆمەڵێ زۆر لە ئەسحابی کیرام ئەم بەرتەرییانە دەس کەوتووە، کە یەکێ لەوانە حەزرەتی ئەبووبەکری سددیق بووە ﷺ کە بەشێوەیەکی عام لەگەڵ پێغەمبەردا بووە ﷺ و مولازمی بووە، مەسەلەن لە هەووەڵەوە تا ئاخر لەکاتی خۆشی وە لەکاتی ناخۆشیا بووە وە شوێنکەوتووی پێغەمبەر بوە لە هەموو حاڵەتێکدا لەحاڵەتی سکووت و بێدەنگیا و لەحاڵەتی رووکردن بۆلای خوای گەورە و لە حاڵەتی زیکرو فیکرا، تا نووری ئیمان زاڵ بوو بەسەر دڵی پڕنووریا، وە بەم شێوە دڵی بازبووە و کراوەتەوە و نەفسی پاکی گەیشتووە بە ئاخر پلەی نەفس پاکی و ڕازاوەیی، وە لە دڵی پیرۆزیا حیلم و خۆگری قەراردابوو، کە بەهۆی ئەوەوە بەرتەری پەیداکرد بەسەر غەیری خۆیدا لە یارە بەرزەکانی.

وەبەم بۆنەوە کۆمەڵێکی زۆر لە ئەسحابی کیرام شوێنکەتووی بوویبوون، وەکوو سەلمانی فارسی و غەیری سەلمانیش، وە هەروا شوێنکەوتووی سەلمانیش بووبوو قاسمی کوڕی موحەممەد، وە شوێنکەوتووی قاسم بووبوو ئیمام جەعفەری سادق، وە هەروەها موسوڵمانان شوێن کەوتووی ئەو ئاداب و کردارانەی بوون، وە ناوبراوە ئەو ئاداب و کردارانە بە ئادابی سیددیقییە، هەروەکوو شوێنکەوتووی گەورەی ئێمە حەزرەت عەلی کەوتبوو لە ئاداب و زیکرو فیکری پاك و

خاوێندا شەیخ حەسەنی بەسری، پاشان لە دوای ئەو شوێنکەوتووی بووبوون لە ئاداب و ڕێباز دا زەنجیرەوار تا گەیشتبووە جونەیدی بەغدادی کوڕی موحەممەدی بەغدادی، وە ئەو ئاداب و کردارانە، ناو براوە بەئاداب و کرداری جونەیدییە یا ڕێبازی جونەیدییە، وە خەڵکان تا ئەمڕۆ لە سەر ئەو ئاداب و ڕێبازە چوون و دەوامیان کردووە، وە هەموو ئەم ئاداب و ڕسوومە بەشوێنکەوتن لە بۆ پێغەمبەری خوا بووە ﷺ وە عەینی ئاداب و ئەخلاقی ئەو بووە وە هیچکام لەو ئاداب و ئەخلاقانە خارج لە شوێنکەوتنی کتاب و سوننەت نین کەوابوو دڵی موسوڵمانان نوورانی بووە بەو ئاداب و نوورانەی حەزرەتە ﷺ وە تێکڕا هەر هەمووەکەی دوورکەوتوونەتەوە لە شوێنکەوتن هەواو تەبەعییەت کردن لە ڕەزائیلی نەفسی ئەممارە، وە هەرکات دونیا بە هۆی هەواو هەوەسەوە تاریکتر ئەبوو دڵی ئەوان بە هۆی هیدایەت و ڕێنمونییەکانی حەزرەتەوە ﷺ نوورانیتر ئەبوو، وە ئاسەوارەکەی لە کەرامەت و «خارق العادە» لەوانەوە جوانتر دەرئەکەوت و ئاشکرا ئەبوو، وە لەگەڵ ئەوڕاستییەشدا زانراوە کە گەورەترین و بەڕێزترین کەرامەت بۆیان خۆگری و پایەداری ئەوان بوو لەسەر بەرنامەی دین.

جا بەم بۆنەوە کە گەلی ئیسلامی بەگەورەترین ئوممەت ناوبراون، وە لە ناوخەڵکاندا هیچ کات چ لەمەو پێش و چ لەمەو دوا زەمان خاڵی نەبووەو نابێ لە تایفەیەك، وە گرووپێك لەسەر حەق ئەبن، تا ڕۆژی

قیامەت بەرپا ئەبێت، وە لە ڕاستیا حەق تەنها شوێنکەوتنی خالیس و بێ‌دەغێڵەیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شتانەیدا کە لەلایەنی زاتی خواوە هێناویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**«مَثَلُ أُمَّتِي مَثَلُ الْمَطَرِ لاَيُدرَىٰ أَوَّلُهُ خَيْرٌ أَمْ آخِرُهُ»**[1] واتە: وێنەو نموونەی ئوممەتی من وەکوو وێنەی باران وایە نازانرێ ئەووەڵەکەی چاکە و خێرە یا ئاخرەکەی، وە لەلای هەموو ئینسانێکی عاقڵ و بەئینساف ڕوونە شوێنکەوتنی خالس و بێ‌غەش ئەوە بووە کە ئەسحابی کیرامی ڕەسولی خوا ﷺ بوویانە، وە یا کەسێ لە ڕێبازی ئەوانەوە بچێت تا ڕۆژی قیامەت.

کەواتە ئەو کۆمەڵە ساڵحانەی کە ڕێگە پیشاندەرانی حەق و دین بوون بۆ گەل و نەتەوەکان شتێك کە ئەوان کردوویانە، وەکوو خەڵوەکێشان یا ڕۆژوو گرتن یا زیکر کردن لە ئێوارە و بەیانیدا یا ئەوەی کە وێنەو نموونەی ئەوە لە ویردو ئەوراد، هەر هەمووەکەی ڕیشەو ئەسڵێکی لە دیندا هەیە، ئەمەش بۆ کەسانێك ئەبێت کە بڕۆن موتالەعەو سەیری کتێبی ڕاویانی حەدیس و موفەسسیرینی قورئان بکەن، وە زیکر کردن بە پەنامەکی یا بەشێوەی ئاشکرا و دەنگی بەرز لە شەو و ڕۆژدا سەحیحەو جوانە بەو شەرتەی تۆزی نەزانی و خرابی نەزانکاران و

---

١. سنن ترمذي (٩٦/١٠).

خـرابـکارانـی تـێکەڵ نـەبێت، وە تـایبەتمەندی ئـەو هـەموو هـەیـئەتە زیکرانـەی کە لەزەمانی پێشوودا بەو شێوە عادەت و ڕەسم نەبوون نابن بە بیدعەو داهێنانی شت لەدیندا.

چون بدعە لە فەرهەنگ و ڕەسمی دیندا ئەوەیە کە مەنع کرابێت یا مـوخالێف و دژی قـانوونی گـشتی ئـیسلام بـێت، وە ئـەو شـتانەی کـە باسمان کردن ئەگەر لە سوورەتێکدا لە ڕیزی فەرزە عەینەکان و لە ڕیزی فـەرزە کـیفایەکان و لە ڕیـزی سـوننەتە مـوئـەککەدەکان نـەبـن بـە ڕای بـڕێك لەزانـایان خـۆ لە سـوننەتە غـەیرە موئەککەدەکان بـەدەر نـین، کـە ئـەمانە لە فـەرهـەنگی دیـندا بـە تـەتەووعیش تـەعبیر ئـەکرێن، چـون کـۆڵەکەو پـایەی دیـن بـریتییە لە فـەرزی عـەین و لەو فـەرزی کـفایە و سـوننەتی مـوئەککەدەو غـەیرە مـوئەککەدە، کـە پـێی ئـەوترێ «تـطوّع» وە خوای گەورەیش لە سوورەتی بەقەرە ئایەتی ژمارە سەدو پەنجاو هەشت دا فەرموویەتی:

﴿وَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْراً فَإِنَّ اللّٰهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ واتـــــە: هـــــەرکەسێك دوای حەججی فەرز و عەمرەی فەرز، ئـەگەر حەجج و عـەمرەی بـە جێهێنا یا هەر کارێکی خێری ئەنجام دا چ فەرز بێ یا سوننەت خوای گەورە پاداش و جەزای بۆ دیاری ئەکات، چون خوا خۆی ئاگایە بەوەی کە بەندەکانی ئەنجامی ئەدەن لە هەر کردەوەیەك، وە خوا پاداش و کردەوەی چاکەکەران بە خەسارنادات.

وە هەروا لە ڕیزی مەحەببەت و خۆشویستنی پیاوچاکان ئەژمێررێت و دائەنرێ مەحەببەتی هەر فەردێك یا کۆ مەڵێك کە خاوەن پلەو گەورەیی و تێکۆشان بێت لە بەرز کردنەوەی وشەی (لا اِلٰهَ اِلااللهُ) دا، وە لە خێرو چاکەی ئینسان ئەژمێررێت سەردان و زیارەت کردنی خۆشەویستانی موسوڵمان. (سوپاس بۆخوای پەروەرش دەهەندەی تەواوی عالەمیان)

خەلاس بووم بە حەمدی خوا لەنووسین و دانانی ئەم پەرتۆکە بەرزەیە لەچاشتانی ڕۆژی پێنج شەممە سیی شەووال ساڵی هەزارو سێسەدو چل و هەشتی کۆچی، لە هۆدەی دەرس وتنەوەما لە مزگەوتی جامێعەی گەورەمان شەیخ عەبدولقادری گەیلانی خوا ڕۆحی نوورانی کات ئامین، منی فەقیر دانەری ئەم پەرتۆکە، عەبدولکەریم مودەرریس لە هۆزی عەشیرەتی قازی، دانیشتووی بەخشی سەیید سادق لە شارەزووری عێراقدا «وصلّی اللّٰهُ علی سیّدنا محمّدٍ و علی آله و صحبه وسلّم»

وەرگێڕ لە عارەبییەوە بۆ سەر زمانی سۆرانی: سەیید عەبدو ڵلای حوسەینی هەورامی کوڕی مەرحومی سەیید موحەممەد ڕەشیدی حوسەینی، خوا خۆش بێ لە منیش و لە دانەری ئەم پەرتۆکەیەو لە هەموو موسوڵمانانی دڵسۆز لە بواری دیندا، وە هەروا لەدایك و باوکی ئێمەیش و باقی ئیماندارانیتریش. ئامین،

لێ بوومەوە لە وەرگێڕان و نووسینی ئەم کتێبە بەرزە لە ڕۆژی چوارشەممەی مانگی موحەڕڕەم ساڵی هەزارو سێسەدو هەشتاو شەش لە شاری مەریوان مزگەوتی سەلاحەددینی ئەییوّبی رحمه الله وە لێبوومەوە لە تایپ کردنیشی لە ڕۆژی دووشەممەی مانگی دووهەمی بەهاری ساڵی هەزارو سێسەدو هەشتاو هەشتی هەتاوی، هەر لە مەریوان، سەییدعەبدوڵلا حوسەینی هەورامی.

**«وصلّی الله علی سیّدنا و سندنا و حبیبنا محمّدٍ و علی آله و صحبه وسلّم و آخرُ دعوانا أن الحمدُ للّه ربّ العالمین!**

## ئاگادارییەك

لەبەر ئەوەی ئینسان خاڵی نییە لە هەڵەو لە لەبیر چوون، داوام لە خوێنەرانی بەڕێز هەیە هەرجۆرە هەڵەیی یا کەم و کوورییەکیان وەبەرچاو کەوت بەپێنووسی مەحەببەتی برایەتییان چاکی کەن و خەبەرمان پێ بدەن تا بتوانین ئەم نوسراوە بەبێ خەوشی لەخزمەت گەلی موسوڵمانی هاوزماندا چاکتر قەرار بدەین. بەکۆمەك و یارمەتی خوای گەورە.

وە لە کۆتاییدا لە هەموو ئەوکەسانەی کە زەحمەتیان کێشاوە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بەرهەمە، ئەوپەڕی ڕێز و تەقدیرم هەیە، بەتایبەت برای خۆشەویستم مەلا **«حسێن کەریمزادە»** کە لەوەخت و ناوەختادا ئەرك و زەحمەتم داوەتێ، هێوای سەرکەوتن و سەرفرازی بۆ ئەخوازم.